# سەردەم

گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کەلتووری بیانی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەریدەکات
ژمارە (16) ئاب . 2001 - ساڵی سێیەم



ناونیشان:
سلێمانی - فولکەی یەکگرتن
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
تەلەفۆن : 2129839 یان 2130347
بۆ پەیوەندی کردن لەدەرەوەی وڵاتەوە
سەنتەری سەرچنار
Tel: 0044 162 84 86008 - Fax: 0044 162 84 77660
ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لەڕێی سندوقی پۆستی ژمارە
14665/615 و 14665/616 تاران

# سەردەم

ژمارە (16) ئابی 2001 ساڵی سێیەم

# فیکرو فەلسەفە

- ئەنگی هیگڵ — دیدیار ئیریبۆن
- ڕووکەش و حەقیقەت — بێرتراند ڕەسڵ
- هیراکلیتس و بیرکردنەوەی بنەڕەتی — کێنس مالی
- سەرەتایەك دەربارەی ڕیمۆن ئارۆن — هاشم سالح







# دەنگی هیگڵ

■ دیدیار ئێریبۆن

● و. لە ئینگلیزییەوە: ئاوات ئەحمەد

لە پاریس، لە پشتی پانتیۆنەوە، نزیکی کەنیسەی سانت ئەنتین دی مۆنت، لیسێیەکی دیکە هەبوو (هینری چوارەم) کە یەکێکە لە خوێندگە ئامادەییە هەرە بەشەوکەتەکانی فەرەنسا. ساڵ لەدوای ساڵ هەڵبژاردەی قوتابییان لەم لیسێیەدا خۆیان ئامادە دەکرد بۆ تاقیکردنەوەی وەرگیران لە شەقامی ئۆڵم، واتە لە پەیمانگای مامۆستایان. پرۆفیسۆرێك لە زانکۆی پواتێ سەرنجی دایکی فۆکۆی بۆ ئەوە راکێشاو بە راشکاویی پێی وت: *"قەت بیستووتە یەکێك لەناو یەکێك لە دەزگاکانی ئەم شارەوە بێتە دەرەوە کەسێکی ئاسایی لێ دەربچێت؟"* کارەکان بە خێرایی رێکخران ، فۆکۆ دیسان تێهەڵدەچێتەوە ، بەڵام ئەمجارەیان هەموو کارتە براوەکانی پێیە .

لە پایزی 1945 دا فۆکۆ گەیشتە پاریس تا بچێتە ناو ئەم شوێنە سەنگینەوە کە بە بورجە بڵندەکەیەوەو شۆرەتی باشیەوە بۆ ئامادەکردنی خوێندکاران بۆ پەیمانگای مامۆستایان، ناوچەی لاتینی داگیر کردبوو. کوڕە لاوە لادێییەکە، کە هاوپۆلەکانی وایان دەبینی، پۆشاکێکی گوندییانەی لەبەردابوو، جوتێك سۆلی تەختەی لەپێدابوو، لەوەش زیاتر فۆکۆی لاو زۆر بەجۆش نەبوو بۆ چوونە پایتەخت. ژیانی پاریسی دوای جەنگ، زۆر سەخت بوو، پڕبوو لەتەنگوچەڵەمە (وەك کەمیی خۆراك). بارودۆخی ژیان زۆر دوور بوو لەوەی کەوا لە فۆکۆ بکات ئەم حاڵە تازەیەی پێ خۆش بێت. دایکی فۆکۆ لە توانایدا نەبوو ئاپارتمانێکی بۆ بکڕێت یان تەنانەت شوقەیەکیشی بۆ بەکرێ بگرێت. هاوڕێیەکی خێزانەکە کە ناوی مۆریس رات Maurice Rat بوو، لە لیسێی جۆنسۆن دی- سایل ئەدەبیاتی دەخوێند، بۆ ماوەی چەند رۆژێك گرتیە لای خۆی، پاشان گواستییەوە بۆ ژوورێك کە لە ئیدارەی قوتابخانەیەك بەکرێ گیرابوو، کە دەکەوتە ناوچەی بۆلیڤارەوە. ئەم ئامادەکارییە حاڵەتێکی نائاسایی پێبەخشی لە نێوانی خوێندکارەکانی تردا. لەوکاتەدا ئەمانوێل لوررا لادۆری خوێندکارانی قۆناغی ئامادەکاریی دەکرد بە

دوو بەشی سەرەکییەوە: خوێندکارانی ڕۆژ، ئەوەی بۆرژوازییە پاریسییەکان، ئەوانەی هەموو ئێوارەیەك دەگەڕانەوە بۆ ماڵەکانیان، لەگەڵ خوێندکارە دەرەکییەکاندا، ئەوانەی لە گوندو ناوچەکانی دەورووبەرەوە هاتبوون و لەسەر حیسابی قوتابخانە دەیانخوێند. دایك و باوکی فۆکۆ دەیانتوانی کوڕەکەیان لەو قۆناغە ناسك و مۆلەقەی هەرزەکارییدا لە شۆکی ژیانی بەکۆمەڵ لابدەن، کە خۆی دەیوت سەرباری هەموو شتێك ڕقی لەو ژیانەیە. هەندێك جار نەیدەتوانی ئەو چەند بستەی تێیدا دەژی، گەرمی بکاتەوە، بەڵام دواجار بەتەنیا بوو. ئەندێشەی ئەم کوڕە ناکۆمەڵایەتی و گۆشەگیرە، کە لە هەموو بارێکدا دەردەکەوت، بەهۆی ئەم حاڵەتەوە سەری هەڵدایەوە. زیاد لەوەش لەماوەی ئەو ساڵەدا، هەموو چالاکییەکانی لە پاریس تا ڕادەیەك سنورکراو بوون: هەر هەل بۆ بڕەخسایە لەگەڵ خوشکەکەیدا دەچوون بۆ سینەما، دوای ئەوەی خوشکەکەی هات بۆ پاریس، زۆر ئالودەی فلیمی ئەمەریکی بوون، کەبەهۆی جەنگەوە لێیان بێبەری ببوون. باقی کاتەکەشی زۆر شێتانە تێدەکۆشا بۆئەوەی لە تاقیکردنەوەدا سەر بکەوێت.

لە پۆلی (أ)ی ئامادەیی هینری چوارەمدا، پەنجا خوێندکار خەریکی خۆئامادەکردن بوون بۆ تاقیکردنەوەو تەنیا سی و هەشتیان لە پەیمانگا وەردەگیران لە لقی (ب)ش ژمارەیەکی زۆری تری کێباریان هەبوو. هەروەها لیسێ گەورەکەی تری پاریسیش (لویسی گەورە) کێشمەکێشی بوو بۆ پێشکەشکردنی خوێندکارەکانی خۆی. هاوینی داهاتوو، چەند کەس لەگەڵ میشیل فۆکۆدا، لەبەر دەرگای هینری چوارەمدا دەوەستن و چاوەڕێی دەرچوون دەکەن؟ گروپێك لە پرۆفیسۆرە چاکەکان لەوێن بۆ دڵنیابوون لە خۆئامادەکردنی سەرکەوتووانەیان. ڕۆی لادۆری کە لە هەمان ساڵدا هاتبووە ئەوێ، ئاوا وەسفی مامۆستای مێژوو دەکات کە دەرسی بە فۆکۆ دەوت: ئەندرێ ئەلبا کاریگەریی لەسەر خوێندکارە چەپ و ئەوپەڕی چەپەکان هەبوو، ئەمەش زۆرینەی خوێندکارانی دەگرتەوە. ئەم پیاوە لەکاتی جەنگدا، (1914 ـ 1918) دکتۆری بێتاڵ بووەو پێدەچێت بەخەستی بریندار کرابێت، خەتێك بەناوچاویدا هاتووە کە شوێنەواری برینێکە، بەڵام لە ڕاستیدا برینی سەردەمی منداڵییە، یەکێك لە خوێندکارە پێشینەکانی وتی: *لەڕاستیدا تۆ دەتوانیت مێشکی ببینیت کە دەلەرێتەوە.*



فۆکۆ لەلای دکتۆر دێینیش کۆرسێکی وەرگرتووە، کە مێژووی نێرینی دەوتەوە. خوێندکارەکان لەمەوە ناوی جۆرج دۆمۆزیلیان بیست، کە لەو ماوەیەدا خەریك بوو لە پشتی کۆمەڵی دەستەبژێرەوە نێوبانگی دەدرەوشایەوە. هەروەها جین بۆدێتیش لەوێبوو، کە ئەدەبی فەرەنسی و زانیاریی ئەکادیمیی باڵای دەوتەوە. وەکو یەك بەجوانی باسی سەدەکانی ناوەڕاست یان سەدەی بیستەمی دەکرد، تا دەگاتە شیعرەکانی ئەپۆلۆنیر، هەر ئەو کاتە بەکەمیی باسی نووسەرە هاوچەرخەکانیشیان دەخوێند، بەڵام ئەو

مامۆستایەی کە لە هەموان زیاتر کاریگەریی لەسەر ئەم گرووپە خوێندکارە هەبوو، بریتی بوو لەو مامۆستایەی کە پۆلەکەی ئامادە دەکرد بۆ تاقیکردنەوەی فەلسەفە: واتە جان هیپۆلیت[1]، کە یەکێکە لەوانەی ڕێچکەی فۆکۆ دیاریی دەکەن. جان دۆرمیسۆن کە دووساڵ پێشتر لە لیسێکە بووە، وەسفی ئەم مامۆستا نێودارەی بەوە دەکرد کە لە پشتی ڕستە ئیرتیجالییەکانیەوە خۆی مات کردوە، ئەو خەریک بوو لە توێی ڤالاری[2] و مالارمێوە هیگلی[2] شیدەکردەوە. کە بێشک دۆرمیسۆن هیچی لێ تێنەدەگەیشت، بێگومان زۆری تریش هەمان هەستیان هەبوو. بەڵام خوێندکارەکان بەلایانەوە مامۆستایەکی سەرنجڕاکێش بوو، هەروەها پاش پۆلە ناخۆشەکانی پواتێ، ئەم لێشاوە ئیلهامبەخشەی پرسیارە گرانەکان، فۆکۆیان بە شەوارە دەخست. ئەوکاتە فەلسەفە ڕەونەقێکی زۆری هەبوو.

ساڵ ساڵی 1945 بوو، دۆرمیسۆن دەنووسێت "ڕاستەوخۆ دوای جەنگ و بۆ ماوەی شەش حەوت ساڵی دواتریش، فەلسەفە هەیبەتێکی بێوێنەی هەبوو. نازانم ئێستا دەتوانم باسی بکەم یان نا، کە ئەوکاتە بەلای ئێمەوە مانای چی بوو. سەدەی نۆزدە، سەدەی مێژوو بوو، ناوەڕاستی سەدەی بیستەمیش تەرخان بوو بۆ فەلسەفە.. ئەدەب و وێنەکێشان و لێکۆڵینەوە مێژووییەکان، سیاسەت، شانۆ، لەگەڵ سینەمادا، هەر هەموویان لە چنگی فەلسەفەدا بوون.

هیپۆلیت لەیەک کاتدا، لەسەر فینۆمینۆلۆژیای ڕۆحی هیگڵ و ئەندازەکەی دیکارت[4] دەرسی دەوتەوە، بەڵام کۆرسەکەی لەسەر هیگڵ، هەموو بیستەرانی ڕاکێشاو لەیادەوەرییاندا مایەوە. فۆکۆ سۆزی بەلای مێژوودا بوو، بەڵام ئێستا بۆ یەکەمینجار هەستی بەڕاکێشران کرد بەرەو فەلسەفە. ئەوە لە ڕاستیدا فەلسەفەیەک بوو کە چیرۆکی مێژووی دەگێڕایەوە، سەرلەنوێ باسی پەرەسەندنە ژانارییەکەی دەکردەوە بەرەو سەرهەڵدانی عەقڵ، هەموو مێژووی گەمارۆدا، ئیتر مێژوو مانایەکی هەبوو. گومانی تیا نییە کە هیپۆلیت یەکێك بوو لەوانەی فوکۆیان فڕێدایە ناو ئەو مایەیەوە کە دواتر دەبێت بە چارەنووسی. فۆکۆش هەرگیز نکوڵیی لەوە نەکردووە کە قەرزاریی خۆی بۆ ئەو پیاوە نەکردووە. ئەو پیاوەی کە جارێکی تریش لە ئیکۆل نۆرماڵ کەشفی دەکاتەوەو ئەو کاتەش کە لە کۆلێج دو فرانسدا سەرکەوتوو دەبێت. لە کاتی مردنی هیپۆلیتدا لە ساڵی 1968 دا، فۆکۆ وتی: خوێندکارەکانی دوای جەنگ بەردەوام وانەکانی هیپۆلیتیان لە یادە کە دەربارەی فینۆمینۆلۆژیای ڕۆح دەیوتنەوە . بەو دەنگەی کە لە ناوەڕاستی ڕێگادا ڕاوەستێنرا، بریتی بوو لەبەشێك لە ڕەزمی ئەو، ئێمە تەنیا دەنگی مامۆستایەکمان نەدەبیست، بەڵکو هەندێکجار دەنگی خودی هیگڵمان دەبیست و بەڵکو هەندێکجار دەنگی خودی فەلسەفەشمان دەبیست. بڕوا ناکەم کە شتێکی شیاو بووبێت بتوانین هێزی ئەو ئامادەبییە یان نزیکایەتییە لەبیر بکەین کە ئەو زۆر بەجۆشەوە داوای دەکرد.

دەنگی هیگڵ، دەنگی فەلسەفە! هیپۆلیت، مامۆستای ئیلهامبەخش و درەوشاوە، سۆزێکی زۆری لەناو خوێندکارە لاوەکانیدا بەرپاکرد، بەمەش خۆی خستە ناو گەورە مامۆستایانی خانەکەوە کە نێودارترین و گەشبینترینیان بریتی بوو لە ئەمیل چارتەر، کە هێندەی ئالان نێودار بوو لە وانەوتنەوەدا بە خوێندکارەکانی خانەکەو، خوێندکارانی پەیمانگاکە، لە ماوەی نێوان دوو جەنگدا، جان فرانسوا سیرینیل بەو پیاوانەی دەوت هوشیارکەرەوەکان، بەمەش جەختی لەسەر ئەو ڕۆڵە گرنگە دەکرد کە مامۆستایان هەیانبوو لە وروژاندنی

هەستێکی زۆر تایبەتی لە خوێندکارانی پەیمانگاکانی فەرەنسادا بۆ ئامادەکردنیان بۆ پەیمانگای باڵا.



ئەو قەرزارییەی کە دواتر فۆکۆ گوزارشتی لێکرد بۆ مامۆستاکەی پێشووی، کەوتە پشتەوەی سوپاسگوزارییە سادەکەوە بەرامبەری دۆزینەوەی ڕێچکەکەی، لە کۆتایی هەرزەکارییەکەیدا. کاتێک لە ساڵی 1960 دا لێکۆڵینەوەکەی خۆی تەواوکرد، فۆکۆ داوای یارمەتی لە دوو سێ خوێندکارێك کرد کە کاتی خۆی لەکاتی نووسینی ئەو کتێبەدا سەرنجیان ڕاکێشابوو، کە ئەمڕۆ بە کتێبی "مێژووی شێتی لەسەردەمی کلاسیکدا" ناسراوە. ئەوانەش ئەوانە بوون کە سوپاسی کردوون: جۆرج دۆمۆزیل[5]، جۆرج کانگیلم و جان هیپۆلیت فۆکۆ دە ساڵ پاش چاپکردنی ئەو کتێبە، لە یەکەمین وانەیدا لە کۆلیجی دۆفرانس، بە ڕێزەوە دەربارەی مامۆستاکەی دوا. هەندێك پێیانوایە کە ئەم سەرنجە کۆتاییانە لەناو وتەیەکی ڕەسمییدا لەو شوێنە ئەکادیمییەدا لە نەریتێکی سەرەکییە لەوتووێژی ئەکادیمییدا، نەریتێکە کە لێوەی فۆکۆ ستایشی پێشینە کۆچکردووەکان یان خانەنشینەکانی کردووە. وەلێ فۆکۆ کورتەو پوختەی ئەم وانەیەی تەرخانکرد بۆ هیپۆلیت، هەرچۆنێك بێت بە چەند وشەیەك سێبوریی هات؛ چەند سەرنجێك، وتی: چی زیاتریش، ئەو کارەکەی ئایندەی خۆی خستە ژێر چاوی ئەمەوە. لە ساڵی 1975دا، حەوت ساڵ دوای مردنی هیپۆلیت، فۆکۆ نوسخەیەکی لە کتێبی کۆنترۆڵ و سزا نارد بۆ بێوەژنەکەی هیپۆلیت و ئەم وشانەی خوارەوەی لەسەر نوسیبوو: *بۆ مادام هیپۆلیت، لە یادەوەریی ئەو پیاوەدا کە من بە هەموو شتێك قەرزاری ئەوم.*

ڕەنگە شتێکی سەرسوڕهێنەربێت کە فۆکۆ بایەخێکی بەردەوام و زۆری داوە بە پرۆفیسۆرەکەی پێشووی، بەتایبەتی لەوکاتەوە کە هیپۆلیت تەنیا دوو مانگی سەرەتای ساڵی خوێندنی 1945 ـ 1946 لە هێنری چوارەم دەرسی وتۆتەوە. هیپۆلیت هاوچەرخی جان پۆل سارتەر[6] و مۆریس میلۆپۆنتی[7] بوو، هەروەها هاوڕێشیان بوو. لە ساڵی 1907دا لەدایکبووە، سارتەر لە 1905 و میلۆپۆنتی لە 1908دا. هەرسێکیان پێکەوە لە پەیمانگای باڵا دەیانخوێند، سارتەر لەگەڵ ڕیمۆن ئارۆن وپۆل نیزان و جۆرج کانگیلمدا[8] لە ساڵی 1924دا وەرگیران، هیپۆلیت لە 1925دا، مێرلۆپۆنتی لە ساڵی 1926دا. بەلام مرۆ زۆر دەگمەن دەتوانێت بەراوردی سارتەر بە سیانەکەی تر بکات، هیپۆلیت فەیلەسوف نەبوو، بەو مانایەی سارتەرو مێرلۆپۆنتی فەیلەسوف بوون، چونکە ئەو بەرهەمهێنەرو داهێنەری ئایدیاکان نەبوو، هەرچۆنێك بێت کاریگەریی ئەو زۆر فراوانتر بوو، لەوەی کە لەیەکەم ڕوانیندا دەردەکەوێت. هیپۆلیت فینۆمینۆلۆژیای ڕۆحی وەرگێڕاو لە کاتێکدا دەرسی دەربارەی دەوتەوە کە بەدەگمەن لە کۆرسە فەرەنسییەکاندا ناوی هیگڵ دەهات. بەم مانایەش هیپۆلیت تەعلیق دەرو وتەبێژی فەیلەسوفە ئەڵمانییەکە بوو، بە تایبەتی لەکارەکانی سەردەمی لاویدا کە لە شاری یانا نووسیونی. هەردوو بەرگەکەی

وەرگێڕانەکەی فینۆمینۆلۆژیای ڕۆح لە ساڵی 1939 و 1941دا بڵاوکرانەوەو خرانە بەردەستی خوێنەری گشتی (کە تا ئەوکاتە لای زۆرینەی خەڵک پشتگوێ خرابوو)، ئەوەش بوو بە دەروازەیەک بۆ ئەوەی ئەو کارە ببێتە سەرچاوەی سەرەکی بۆ خوێندنی فەلسەفە لە فەرەنسادا. هەروەها لێکۆڵینەوەکەشی "گرفت و بونیاد لە فینۆمینۆلۆژیای ڕۆحدا" لە ساڵی 1947دا، وەکو ڕووداوێک بایەخی پێدرا. ڕۆناڵد کالۆیس لە خوێندنەوەیەکی کتێبەکەدا بۆ گۆڤاری زەمەنە هاوچەرخەکان، لە ساڵی 1948دا جەختی لە گرنگی ئەوکارە کرد: کەم نین ئەو بیرپارانەی کە پێیان وایە هیگڵیزم بریتییە لە پرسیارە مەزنەکە: پرسیاری ژیان یان مەرگی فەلسەفە. خودی فەلسەفە لە پرسیاردایە. ئەمەیە هۆی ئەوەی کە لێکۆڵینەوەکانی هیپۆلیت سەرنجی ئێمەی ڕاکێشا. ئەمە بە سادەیی بریتی نیە لە نوسینەکانی مێژوونووسێکی پڕ لە گومان... بەڵکو گرفتێکی ئاڵۆزیشە: ئایا بایەخپێدانی فەلسەفییانە شتێکی شەرعییە؟ لە ڕاستیدا لەکۆتایی جەنگدا، کەم نەبوون ئەو بڕیارانەی کە دەیانویست بگەڕێنەوە بۆ هیگڵ. پایەی هیگڵیزم لە فەرەنسادا لەماوەی دەیەیەکدا گۆڕا، لە ساڵی 1930دا بە پێی ڤینسنت دیسکۆمبێس، هیگڵ بریتی بوو لە فەیلەسوفێکی ڕۆمانسی، کە لە لایەنی لێکۆڵینەوەی زانستییەوە ڕەت کراوەتەوە (ئەمە پێشنیاری لیۆن برۆنشڤیک)[9] بوو. لە ساڵی 1945دا هیگڵ بوو بە لوتکەی فەلسەفەی کلاسیکی، بوو بەو ئۆرگانەی کە لە هەموویان مۆدێرنترە.

بێگومان بە تەنیا هیپۆلیت لەم پێچەوانەکردنەوەیەدا کاری نەدەکرد، لە سەرەتای 1929دا جان ڤاڵ[10] سەرنجی بەرەو هیگڵ ڕاکێشابوو هوشیاری بەرامبەری کارەسات لە فەلسەفەی هیگڵدا، کە تێیدا باسی هیگڵی ڕۆحانیی دەکات، وەک ئەوەی کایلیۆس لێی دواوە. هەروەها لە ساڵی 1938دا هینری لۆفیڤەر دەربارەی دیالەکتیکی هیگڵی نووسی، بۆیە چەند ئاستێک هەبوو کە تیایاندا، بە وتەی ئەلیزابێت ڕۆدینسکۆ، جوینەوەیەکی هێواش ڕووی دەدا، بە بەراورد لە پێشکەشکردنی هیگڵیزمدا لە فەرەنسا، لەگەڵ ئامادەبوون و دەرکەوتنە سەرکەوتووەکەیدا بۆ ئەو دەرونشکاریستانە. لەوەش زیاتر هەردوو جووڵانەوەکە حەزیان لە خاڵێکی سەرەکیی بوو لە هاتنە پێشەوە بەهەیبەتەکەیاندا، کاتێک ئەلیکسەندەر کۆجیڤ دەستی کرد بە سیمینارەکەی خۆی، مورید و لایەنگرەکانی لە ساڵی 1933وە هەتا ساڵی 1939 لەم لیستەدا بوون: ئەلیکسەندەر کۆیەر[11]، جۆرج باتای[12]، پییر کلۆسۆڤسکی، جاک لاکان[13]، ریمۆن ئارۆن، رایمۆند ئارۆن، مۆریس مێرلۆ پۆنتی، ئێریک وێل و ئەندرێ بریتۆن. لە ساڵی 1947دا، ئەو ساڵەی کە هێپۆلیت داکۆکیی لە لێکۆڵینەوەکەی کرد، ریمۆن کیونو، کە ئەویش یەکێک بوو لە موریدەکان، سەرنجێکی بڵاو کردەوە کە لە وانەکانی کۆجییڤەوە وەریگرتبوو، بە ناونیشانی *پێشەکییەک بۆ هیگڵ*. جولانەوەی هیگڵیزم ئەوەندە بەهێزبوو، کە جۆرج کانگیلم توانی لە ساڵی 1948دا بنووسێت: لە ماوەی شۆڕشی جیهانی و شەڕی جیهانییدا، فەڕەنسییەکان ئەو فەلسەفەیەیان دۆزییەوە کە لەگەڵ شۆڕشی فەڕەنسییدا دێتەوەو بە تەواویی تێیدا دەناسرێتەوە.

جان هیپۆلیت بریتی بوو لە کلیلی سەرکەوتنی هیگڵیزم لە فەڕەنسای دوای جەنگدا، کە لە ژێر کاریگەریی بوونگەراییشدا بوو، کە کانگیلم خۆیشی پێی لەوە ناوە. لە دیسەمبەری 1955دا لە وانەیەکدا کە لە خانەی فەڕەنسا وتییەوە لە ئۆپسالا، کە ئەوکاتە بەڕێوەبەرەکەی میشێل فۆکۆ بوو، بابەتی کۆبوونەوەکەش بریتی بوو لە هیگڵ و کیرککگارد لە بیری فەڕەنسیی هاوچەرخدا جۆرج کانگیلم وتی: لە

راستیدا ئەمە بریتی بوو لە گرێکوێرەی ئەم تەقاندنەوەیەی هیگڵیزم: چیتر هیگڵ وەکو فەیلەسوفی فەیلەسوفەکان نەدەخوێنرایەوە "وەکو خولقێنەری سیستمەکان، بەڵکو وەك نووسەری ئەو کارەی کە دەتوانرێت بە میراتگرەکانی بەراورد بکرێت: فیورباخ، کیرکگارد، مارکس، نیچە، بە کورتی، ئێستاهیگڵ وەکو دامەزرێنەری مۆدێرنیزم دەخوێنرێتەوە. لە فەبرایەری 1945دا، مێرلۆپۆنتی بە جوانی گوزارشتی لێکرد، لە وانەیەکی هیپۆلیتدا دەربارەی بوونگەرایی لە هیگڵدا: هەموو ئایدیا نەلسەفییە مەزنەکانی سەدەی رابردوو، فەلسەفەی مارکس و نیچە، فینۆمینۆلۆجی، بوونگەرایی ئەڵمانی، لەگەڵ شیکردنەوەی دەروونییدا، سەرەتاکانی خۆیان لە هیگڵەوە وەرگرتوە، ئەوە ئەو بوو کە هەوڵیدا جیهانێتی بتەقێنێتەوەو کاملی بکات بۆ عەقلێکی فراوانبوو کە مایەوە بۆئەوەی ئەم سەدەیەی ئێمە تاقیبکاتەوە" بەردەوام دەبێت: "وەك دەردەکەوێت، کاریگەریی ئەوەی کە لە هیگڵ رەتیان کردبۆوە، زیاتر بوو لەسەریان لەوەی کە پێی قەرزدار بوون" میرلۆ پۆنتی دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە چیتر هیچ کارێکی نائاسایی لە ئارادا نەبوو تا ئەنجامبدرێت جگە لە "سەرلەنوێ دروستکردنەوەی پەیوەندیی نێوان، پێڕەوە ناسوپاسگوزارەکانی هیگڵ، ئەوانەی هەوڵیاندا رەگە هیگڵییەکانی خۆیان لەبیر ببەنەوە، لەگەڵ خودی ڕەگ و ڕیشەکەدا".

ئەم کەشفکردنەوەیەی هیگڵ زۆر گرنگ بوو لە پێوەستییەکەیدا لەگەڵ لقێکی دیاریکراوی نەوەکانیدا، لە سەردەمێکدا کە بایەخ بە رێچکەی مارکسیزم دەدات. هیپۆلیتیش لە وانەیەکی تریدا لە خانەی فەڕەنسی ئۆپسالا، لە دیسەمبەری 1955دا ، سەرنجی ئەم پەرەسەندنە چەندجارەیەی داوە: "ئێمە درەنگ گەیشتینە هیگڵیزم کە جگە لە فەڕەنسا هەموو ئەورووپای گرتبۆوە، بەڵام ئێمە لە توێی فینۆمینۆلۆژیای رۆحەوە پێی گەیشتین، کە هەرە نەناسراوترین کارەکانی سەردەمی لاوێتییەتی، هەروەها لە توێی پەیوەندیی نێوان مارکس و هیگڵەوە. بێشك سوسیالیست و فەیلەسوفیش لە فەڕەنسا هەبووە، بەڵام هێشتا هیگڵ و مارکس نەهاتبوونە ناو فەلسەفەی فەڕەنسییەوە. ئەمڕۆ ئەمە روویدا. گفتوگۆکردن لەسەر مارکسیزم و هیگڵیزم لە بەرنامەکەدایە".

ئەم وەرچەرخانە رادیکاڵە لە کایەی فەلسەفییدا، بەرەنجامی زۆر گەورەی لێکەوتەوە. لەگەڵ مارکسیزمدا، ئیمتیازەکانی شاری بردەوە، پێشنەوەی بە شێوەیەکی شاولی بە سەردەمەکەماندا، هەڵبچێت، وەك سارتەر لە رەخنەکردنی عەقلی دیالەکتیکیدا باسی دەکات. بە هەر حاڵ، لە سێ دەیەی دوای جەنگی جیهانی دووەمدا، ئەم رەوتە نوێنەری ئاسایی باڵای ژمارەیەکی زۆری رۆشنبیران بووە.



بەمجۆرە، هیبلیت بەرجەستەکەری هەموو ئەو شتانە بوو کە نەوەکەی فۆکۆ پێی سەرسام ببوون: مارکس و هەروەها نیچە و فرۆیدیش. هەروەها بە شێوەیەکی بنەڕەتی فۆکۆ، زۆر لە مێرلۆپۆنتی دوور نەبوو، کە لە ساڵی 1970دا لە یەکەمین وانەی کۆلیج

دوفرانسیدا گوزارشتی لە بیرەوەریی مامۆستاکەی کرد:

سەردەمەکەی ئێمە چ لە توێی لۆژیکەوە بێت یان ئەپستمۆلۆژیاوە ، چ لە توێی مارکس یان لە توێی نیچەوە بێت، بریتی بووە لە هەوڵدانێك بۆ دەربازبوون لە هیگڵ... وەلێ لەراستیدا هەڵاتن لە هیگڵ ناچارمان دەکات نرخەکەشی بدەین بۆ قوتارکردنی خۆمان لێی. دیارە ئێمە ئاگاداری ئەوەین کە تاچ رادەیەك لێمانەوە نزیکە، ئەو زانینێکی پێشکەش دەکردین کە بە هۆیەوە دەمانتوانی دژی هیگڵ بیربکەینەوە، زانینێك کە لە هیگڵیزمەوە مابۆوە. پێویستە پێناسەی ئەو گریمانەیە بکەین کە تێیدا ئەنتی هیگڵییەتمان یەکێکە لە پیلانەکان دژی خۆمان ئاراستە دەکرێتەوە، لەو کۆتاییەدا کە ئەو بێبەزەییانە وەستاوەو چاوەڕێمان دەکات. ئەگەر زیاتر لە یەکێکمان قەرزاری جان هیپۆلیت بێت دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە ئەو بەبێ ماندووبوون، پێش ئێمە ئەو ڕێگایەی کەشفکردووە کە لێوەی لە هیگڵ دەرباز دەبین، ماوەیەك دەڕۆین و پاشان سەرلەنوێ دەگەینەوە بە هیگڵ، بەڵام لە گۆشەیەکی جیاوازەوە، دواجاریش ناچار دەبین سەرلەنوێ بەجێی بهێڵینەوە.

زیاتر لە بیست ساڵ بەسەر ئەو کاتەدا تێپەڕیوە کە تیایدا مێرلۆپۆنتی تەرخانی کردبوو بۆبەستنەوەی فەلسەفە ناسوپاسگوزارەکان بە رەچەڵەکە هیگڵییەکانیانەوە، ئەم ساڵیش 1970، فۆکۆ دەربارەی ئەوە دوا کە چۆن هیپۆلیت ئەمەی بە ئەنجام گەیاند لە ئامادەیی نەوەیەکدا کە کاریگەریی زۆری لەسەر پێکهاتەی فەلسەفییان هەبووە .

لە وتەکەی ئۆکتۆبەری 1968یدا، کە ماوەیەکی کەم دوای مردنی هیپۆلیت، لە بۆنەی پرسەکەیدا پێشکەشی کرد، کە لویس ئالتۆسێر بەڕێوەی دەبردو لە ریو دیلم ساز کرابوو، فۆکۆ زیاتریش لەسەری رۆیشت:

هەموو گیروگرفتەکانی ئێمە، کە دوێنێ قوتابی ئەو بووین، هەر هەموو گیروگرفتەکانمان، ئەو، ئەو کەسە بوو کە لە لۆژیکی بووندا شیکاری کردن، کە یەکێکە لە کتێبە مەزنەکانی ئەم سەردەمەی ئێمە، ئەو راستەوخۆ دوای جەنگ، فێری کردین بیر لە پەیوەندیی نێوان ستەمکردن و گوتار بکەینەوە، ئەو دوێنێ فێری کردین بیر لە پەیوەندیی نێوان لۆژیك و بوون بکەینەوە، ئێستاش لەم سانە گرنگەدا، ئەو پێشبینی ئەوەی کردووە کە ئێمە بیر لە پەیوەندیی نێوان ناواخنی زانین و پێویستیی پاسایی دەکەینەوە. دواجار ئەو فێری کردین کە بیرکردنەوە مەشقێکی کۆتایی نەهاتووە، کە ڕێگایەکی لەبارە بۆئەوەی نافەلسەفە بهێنێتە ناو گەمەکەوە، بەڵام لە کاتێکدا کە هەمووی چەندی بتوانێت لێیەوە نزیك وەستاون، تا لەوێ بۆ یەکەمینجار بوون فۆرمولە کرا.

فۆکۆ سەرەخۆشییەکی تریشی بۆ هیپۆلیت نووسی، بۆ سەرجەمی نووسینەکانی کە لە ژێر سەرپەرشتی خۆیدا بوو بە هاوکاریی مارتێل گوێرۆت، میشێل سێرێس، جۆرج کانگیلم، جان لاپلان، سۆزان باشلار، لەگەڵ جان گلاود پارێین، مایەی سەرسوڕمان نییە کە ئەو هاوکارییە ئەمڕۆ بە ناونیشانی "نیچە، ژینالۆژیاو مێژوو"ەوە دەناسرێت.

ئەم "دەنگی هیگڵ"ە، لە پڕێکدا لە پایزی 1945 دا، لە لایەن 50 کوڕی سانەوی هینری پێلجەمەوە هێنرایەوە بەرچاو. بوو بە هۆی دروستکردنی شۆکێکی رۆشنبیریی یان دەتوانین بڵێین بوونگەرا. بەڵام هیپاڵ، مامۆستا هیپاڵ، وەکو لە پێشتردا فۆکۆ ناوی نابوو، بانگکرا بۆ زانکۆی ستراسبورگ، کە لەوێ جۆرج کانگیلم دەرسی دەوتەوە. خوێندکارانی لیسێیەکە تەنیا دوو مانگی کورتیان بەدەستەوە بوو تا گوێی لێبگرن، پاشان رۆیشت و بەجێی هێشتن بۆ

پەرجوویەک، دەبوو فۆکۆ شەش حەوت ساڵ چاوەڕێ بکات بێشەوەی جارێکی تر لە سۆربۆن و لە ئەکادیمیای باڵا ببینێتەوە. دریفۆس لیفۆبەر جێی هیپۆلیتی گرتەوە، پیاوێکی گەمژە بوو کە بە چاکی دەیزانی کە دەبێت بەرگەی ئەوە بگرێت کە بەراوردی بکەن لەگەڵ پێشینە هەڵکەوتووەکەیدا، کە ئەو بە فەلسەفەیەکی دلستانتانەی نەفسوونی لە پۆلەکەی کردبوو. پەنجا خوێندکارەکە، لەسەرسامبوون بە مامۆستاکەی تریانەوە هاتنە سەرئەوەی نوکتەو گاڵتە بەم کورتەبنەیە بکەن کە شەش حەوتێکیان بەوە وەسفیان کردبوو کە وەکو گوناه دزێوە، ئەو نەیدەتوانی لە سەرنجەکانی خۆی هیچ شتێک بەرهەم بهێنێت جگە لە چەند سەعاتێک لە بێزاریی. سەرچاوەی پەسەندی ئەو بریتی بوو لە ئیمیلی بۆترۆکسی تازە کانتیی لەگەڵ فەیلەسوفی سەدەی نۆزدە جولیێت لاشلیردا. هیچ شتێک نەدەکرا لەوە زیاتر کە فەلسەفەی مۆدێرنیتە سەرلەنوێ بێتەوە مەیدان. خوێندکارەکان هەرگیز کۆڵیان نەدا لە بێزارکردنی. ڕۆژێکیان دریفۆس بە شێوەیەکی ئەدەبییانە وتی "دەزانم من وەکو هیپۆلیت باش نیم"، دەنگی کرکە کرکی تێکەوت و کارتێکرانی پێوە دیار بوو "بەڵام من ئەوەی دەیزانم پێتان دەڵێم تا لە تاقیکردنەوەدا دەرچن".

ئێستا فۆکۆ ئالودەی فەلسەفە بووەو بە هەڵچوونەوە خۆی بۆ تەرخان کردووە. نمرەکانی زۆر بەرز بوونەوە: لە کۆتایی سێ مانگی یەکەمدا بیستویەکەمین کەس بوو لە پۆلەکەدا (لەگەڵ دانانان بەوەدا من زۆر لە نمرەکانی ئەو باشترم، پێویست بوو خۆی ئازاد بکات لەوەی بیری تەڵزم و توند بێت). لە کۆتایی نیوەی دووەمیشدا هەر بیستویەکەمین کەس بوو، بەڵام لە کۆتایی ساڵەکەدا یەکەم بوو، مامۆستاکانی زۆر بەرز نرخاندیان: یەکێک بوو لە خوێندکارە هەڵبژاردەکان.

یەکێک بوو لە خوێندکارە هەڵبژاردەکان لە فەلسەفەدا، هەروەها لە مێژووشدا. لە نیوەی یەکەمدا حەوتەمین بوو، لەگەڵ ئەم هەڵسەنگاندنەدا: "زۆر باشە، ئەنجامەکانە زۆر نایابن" لە کۆتایی ساڵەکەدا یەکەمین بوو. هەموو مامۆستاکان پاڵپشتیان دا بە فۆکۆ. مامۆستا م. پۆلۆ، مامۆستای وانەی فەرەنسی لە دەفتەری سەرنجەکانیدا نوسی "بیرێکی چالاک"، نیشانەی سەلیقەی ئەدەبیی تێدایە. لە دارشتنی لاتینیدا، فۆکۆ لە سێ و یەکەمین کەسەوە بوو بە دەیەمین، لە یۆنانییدا چوارەم بوو، بەرێوەبەر ئەم سەرنجانەی ناو دەفتەرەکەی لە بڕیاری کۆتاییدا کۆکردەوە: "شایستەی دەرچوونە".

## پەراوێزەکان

1- جان هیپۆلیت Jean Hyppolite (1968 - 1907) فەیلەسوفێکی فەرەنسییە، بانگەشەی نوێکردنەوەی هیگلی دەکرد، بەڵام لە تێڕوانینێکی بوونگەراوە، کتێبی فینۆمینۆلۆژیای ڕۆحی هیگلی کردووە بە فەرەنسی. وەرگێڕی کوردی.

2- پۆل ڤالاری Paule Valery ( 1945 - 1871 ) و ستێفان مالارمێ Stephane Mallarme (1898 - 1842) دوو شاعیری فەرەنسین کە دووەمیان یەکێکە لە سەرکردەکانی قوتابخانەی ڕەمزیی. وەرگێڕ

3- جۆرج ویلهێم فریدریک هیگل Georg Wilhelm Friedrich Hegel (1831 - 1770) بە دوایین فەیلەسوف ناسراوە، چونکە ئەو ئەم شکڵەی ئێستای بەخشی بە فەلسەفە کە شکڵی کۆتاییەتی، ناسراوترین نوسراوەکانی بریتین لە فینۆمینۆلۆژیای ڕۆح و زانستی لۆژیک و پرەنسیپەکانی فەلسەفەی ماف. هیگل هێندە کاریگەریی لەسەر زەمەنە فەلسەفییەکان هەیە کە هەندێک فەلسەفە دەگەڕێنن بە دوو قۆناغەوە: قۆناغی پێش هیگل و قۆناغی دوای هیگل. وەرگێڕ

4- رینــه دیکــارت Rène Decartes (1596 - 1650) فەیلەسوف و ماتماتیکزانی فەرەنسە کە پێی دەوترێت باوکی فەلسەفەی مۆدێرن، ماوەی نێوان بیرو جەستەی زۆر کورت کردەوە، بە تەواویی پشتی بە پرەنسیپە ماتماتیکییەکان دەبەست . وەرگێڕ

5- جۆرج دۆمۆزیل Georges Dumezil (1898 - 1986) یەکێکە لە زانا سۆسیۆلۆژیستە فەرەنسییەکان کە وەکو لیڤی شتراوس بونیادگەریی لەسەر زانستە کۆمەڵایەتییەکان پیادە کردوە، لێکۆڵینەوەی زۆری لەسەر کەلتورە بەراییەکان کردووە. وەرگێڕی کوردی .

6- جان پۆڵ سارتەر Jean Paul Sartre (1905 - 1980) رابەری فەلسەفەی بوونگەراییە لە فەرەنسادا، ئەدیبێکی لێهاتووشە، دیارترین نوسراوەکانی "بوون و نەبوون" . وەرگێڕ .

7- مۆریس مێرلۆ پۆنتی Maurice Merleau Ponty (1908 - 1963) فەیلەسوفێکی فەرەنسییە، لەگەڵ سارتەردا پێکەوە گۆڤاری کاتە نوێیەکانیان دەرکردوە. دیارترین کتێبی بریتییە لە "فینۆمینۆلۆژیای ئیدراک" . وەرگێڕ

8- جۆرج کانگیلم Georges Canguilhem (1904 - ) پزیشك و ئەپستمۆلۆژیی نێودارى فەرەنسی، یەکەمین کەسە کە پایەیەکی بڵندی بەخشی بە مێژووی زانستەکان و ئەپستمۆلۆژیا لە ناو لێکۆڵینەوە فەلسەفییەکاندا، پرسیارگەلێکی زۆری لەمەڕ تاکسارێی دیاردەی زیندوو بوون پێشکەشکردووە. وەرگێڕ

9- لیۆن برۆنشڤیك Leion Brunschvigg (1869 - 1944) فەیلەسوفێکی فەرەنسیی فرە رەهەندە و لە بواری فیکری زانستی و فەلسەفییدا نووسینی زۆرە، بە گشتی دەتوانین بە فەیلەسوفێکی میسالیی رەخنەگر نێوزەدی بکەین. وەرگێڕ

10- جان ڤاڵ Jean Wahl (1888 - 1974) فەیلەسوفێکی فەرەنسییە، زۆربەی تەمەنی خۆی لە زانکۆکانی فەرەنسادا بەسەر بردووەو سەرقاڵی پێگەیاندنی چەندان ئەوە بوە لە رۆشنبیرەکانی فەرەنسا، جگە لە فەلسەفە شارەزایی لە وێنەکێشان و مۆسیقاو شیعریشدا هەبوە، دیارترین کتێبی بریتییە لە ((دەوری سات لە فەلسەفەی دیکارتدا)). وەرگێڕ

11- ئەلکسەندەر کۆییر Alexandre koyre (1892 - 1964) فەیلەسوف و ماتماتیکییەکی فەرەنسیی بە رەچەڵەك روسییە کە بایەخی بە فەلسەفەی زانستەکان داوەو بە فەیلەسوفێکی ئەفلاتوونیی ناسراوە. وەرگێڕ

12- جۆرج باتای Georges Bataille (1897 - 1991) فەیلەسوفێکی فەرەنسییە، خوێنی پچرپچڕ بوەو ژیانێکی نائاسایی بەسەر بردووەو وەکو نیچە ژیانی خۆی پەیوەندییەکی زۆری بە نوسینەکانییەوە هەیە، فەیلەسوفێکی فرە رەهەندەو بە سانایی لەناو پێناسەیەکدا جێی نابێتەوە، گرنگترین کتێبەکانی بریتین لە ئەزمونی دەروونیی، گوناهکار، دەربارەی نیچە. وەرگێڕ

13- جاك لاکان Jacques Lacan (1901 - 1981) دیارترین ناوی فەرەنسییە لە بواری دەرونشیکارییدا لە ماوەی دوای جەنگی جیهانی دووەم بە دواوە، لاکان فرۆیدی بە فیکری فەرەنسی ناساندو دیارترین نوسراوەکانیشی بریتین لە پاش پرەنسیپی واقیع، قۆناغی ئاوێنە، بابەتی ئەست، من لە تیۆرەی فرۆیدیی و تەکنیکەکانی شیکردنەوەی دەروونییدا.

## سەرچاوە

Didier Eribon
MICHEL FOUCAULT
London 1993
pp. 15 - 23

# ڕووکەش و حەقیقەت

■ بێرتراند ڕەسڵ

● و. لە ئینگلیزییەوە: عەتا قەرەداخی

ئایا لەم دنیایەدا هیچ مەعریفەیەک هەیە ئەوەندە جێگای دڵنیایی بێت کە هیچ کەسێکی ژیر نەتوانێت گومانی لێبکات؟ ئەم پرسیارە کە لەیەکەم دیمەندا وا دەرناکەوێت پرسیارێکی گران بێت، بەڵام لە ڕاستیدا یەکێکە لەو پرسیارە هەرە گرانانەی کە دەشێ بپرسرێت. کاتێ ئێمە درکمان بەو بەربەستانە کردوە کە لە بەردەم وەڵامێکی دروست و جێگای بڕوادان، دەبێ بە چاکی بۆ توێژینەوەی فەلسەفی ئاراستە بکرێین. لە بواری فەلسەفەدا هەوڵدان تەنیا بۆ وەڵامدانەوە پرسیاری بنەڕەتی لەمجۆرە نیە بەشێوەیەکی کەمتەرخەمانەو دۆگمایانەی وەکو ئەوەی لە ژیانی ئاساییداو تەنانەت لە زانستەکانیشدا ئەنجامی دەدەین، بەڵکو هەوڵدان بەشێوەیەکی ڕەخنەگرانە بەدوای ئاشکراکردنی هەموو ئەو شتانەدا دەچێت کە دەبنە هۆی بەمەتەڵ کردنی پرسیارەکان و هەروەها بەدوای پەیبردن بە هەموو ئەو تەمومژو شڵەژانەدا دەچێت کە دەوری بیرۆکە ئاساییەکانی ئێمە دەدەن.

لە ژیانی ڕۆژنەدا، ئێمە بەدڵنیاییەوە زۆر شت دەخەینە بەردەم پشکنینێکی داخراوەوە، دەبینرێت ئەو شتانە پڕن لەو ناکۆکیە دیارانەی کە تەنیا ئاستێکی گەورەی فیکر توانامان دەداتێ کە بزانین ئەوەی بە ڕاستی دەشێ بڕوای پێبکەین چیە. لە گەڕان بەدوای دڵنیاییدا، شتێکی سروشتیە کە بە تاقیکردنەوەکانی ئێستامان دەست پێبکەین. لە هەندێ ڕوویشەوە گومانی تێدا نیە کە دەشێ مەعریفە لەو تاقیکردنەوانەوە بەدەست بهێنرێت. بەڵام هەر بەیانکردنێك بۆئەوەی کە تاقیکردنەوەکانی ئەم ساتەمان دەبن بەهۆی ئەوەی کە (شتێك) بزانین ئیحتمالی زۆری هەیە کە هەڵە دەربچێت. بۆ من وادیارە کە ئێستا لەسەر کورسیەك دانیشتووم لە پشتی مێزێکەوە کە لە شێوەیەکی دیاریکراودایە، لەسەر مێزەکە پەڕە کاغەزی بەدەست نووسراو یان چاپکراو دەبینم. بەسەر لارکردنەوەم لە پەنجەرەکەوە چەندین بیناو گەواڵە هەورو خۆر دەبینم. بڕوام وایە خۆر نزیکەی نەوەدو سێ بلیۆن

میل لە زەوییەوە دوورەو ئۆپێکی گەرمە چەندینجار لە زەوی گەورەترە کە پەیوەندی هەیە بە سوڕانەوەی زەوییەوە. هەموو بەیانییەک هەڵدێت و بۆ کاتێکی بێکۆتایی لە ئایندەدا لەسەر هەمان حاڵەت بەردەوام دەبێت. بڕوام وایە ئەگەر هەر کەسێکی ئاسایی بێت بۆ ژوورەکەی من، هەمان ئەو کورسی و مێزو کتێب و پەڕانە دەبینێ بەو شێوەی من دەیان بینم، ئەو مێزەی کە من دەیبینم هەر هەمان ئەو مێزەیە کە هەستدەکەم پەستان دەخاتە سەر مەچەکم. ئەمە هەمووی وا دەردەکەوێت کە زۆر ئاشکرا بێت، بە جۆرێک مەگەر بە دەگمەن، ئەگینا شایانی لێدوان نیە، تەنیا لە وەڵامی ئەو کەسەدا نەبێت کە گومان دەکات لەوەی من هیچ بزانم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەمە هەمووی دەشێ لە رووی ژیرییەوە جێگای گومان بێت و هەمووشی گفتوگۆی زۆر بە ئاگایانە بخوازێت، پێشئەوەی ئێمە دڵنیابین لەوەی کە بە شێوەیەک دەرمانبڕیوەو بەتەواوی راستە.

بۆئەوەی کێشەکانمان روون بکەینەوە، با سەرنج لەسەر مێزەکە کۆبکەینەوە. مێزەکە لەبەرچاو لاکێشەیی و قاوەیی و بریسکەدارە، بەدەس لێخشاندن ساف و فێنک و رەقە. کاتێ لێی بدەم، دەنگێکی رەقی (تەختەیی) لێوە دێت. هەر کەسێکی تر ئەم مێزە ببینێ و هەستی پێبکات و گوێی لە دەنگدانەوەی بێت، بەم وەسفکردنە رازی دەبێت، لەبەرئەوەی دەشێ وا دەربکەوێت کە هیچ کێشەیەک سەری هەڵنەدابێت. بەڵام هەرکە هەوڵدەدەین زۆر وردبین، گرفتەکانمان دەستپێدەکەن. لەگەڵ ئەوەشدا کە من بڕوام وایە ئەم مێزە بە "راستی" لە هەمان رەنگی تەواوی ترە، کەچی ئەو بەشانەی کە رووناکی پێچەوانە دەکەنەوە لە بەشەکانی تر زۆر گەشاوەتر دەردەکەون، کە رووناکی پێچەوانە دەکەنەوەو لە بەشەکانی تر زۆر گەشاوەتر دەردەکەون، هەندێ بەشیش سپی دەردەکەوێت بەهۆی ئیشکە پێچەوانەبووەکەوە. من ئەوە دەزانم؛ ئەگەر بجوڵێم ئەوا ئەو بەشانەی کە رووناکی پێچەوانە دەکەنەوە جیاواز دەبن، لەبەرئەوە دابەشبوونی ئاشکرای رەنگەکان لەسەر مێزەکە دەگۆڕێت.

بەدوای ئەمەدا ئەگەر هەندێ کەس سەیری مێزەکە بکەن لە هەمان ساتدا، ئەوا هیچ دوو کەسێکیان بە تەواوی هەمان دابەشبوونی رەنگەکان نابینن، چونکە هیچ دوو کەسێکیان ناتوانن بە تەواوی لە هەمان روانگەوە سەیری بکەن و هەر گۆڕانکارییەکیش لە خاڵی تێڕوانیندا دەبێتە هۆی هەندێ گۆڕانکاری لەو رێگایەدا کە رووناکییەکە پێچەوانە دەکرێتەوە.

بۆ زۆربەی ئامانجە پراکتیکییەکان ئەم جیاوازیانە گرنگ نین، بەڵام بۆ وێنەکێش هەموویان گرنگن. دەبێ وێنەکێشەکە ئەو خووەی بیرکردنەوە فێربێت، کە شتەکان وا دەردەکەون ئەو رەنگەیان هەبێت کە هەستی گشتی دەڵێت بە راستی ئەو رەنگەیان هەیە، هەروەک دەبێ خوی بینینی شتەکان فێربێت وەکو ئەوەی دەردەکەون. ئێستا لێرەدا ئێمە دەستپێکردنی یەکێک لەو جیاکردنەوانەمان هەیە کە دەبێتە هۆی زۆرترین کێشە لە فەلسەفەدا، ئەویش جیاکردنەوەی نێوان رووکەش (دیمەن) و حەقیقەتە (گەوهەر). جیاکردنەوەی نێوان ئەوەی کە شتەکان چۆن دەردەکەون و خۆیان چین. وێنەکێشەکە دەیەوێت بزانێت شتەکان چۆن دەردەکەون. کەسێکی پراکتیکیش لەگەڵ فەیلەسوفدا دەیانەوێت بزانن شتەکان چین، بەڵام ئارەزووی فەیلەسوف بۆ زانینی ئەم شتە بەهێزترە لە ئارەزووی کەسە پراکتیکییەکەو زۆرتر پەشێوە بەهۆی مەعریفەوە بۆ گرفتەکانی وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە.

ئەگەر ئێستە وەها بۆلای مێزەکە، ئەوەمان کە ئێمە پێیەوە شەڕتەوە ئاشکرا دەبێت ڕەنگێک نیە بە تەواوی وا دەرکەوێت کە ڕەنگی ئەم مێزە بێت، یان هەر هیچ نەبێ ڕەنگی بەشێکی تایبەتی مێزەکە بێت، مێزەکە وا دەردەکەوێت لە خاڵی جیاوازی ڕوانینەوە ڕەنگی جیاوازی هەبێت، هیچ بەڵگەیەکیش لە ئارادا نیە بۆ دانانی یەکێک لەم ڕەنگانە بە ڕەنگی زیاتر ڕاستەقینەی مێزەکە لە چوار ڕەنگەکانی تردا. ئێمە دەزانین کە تەنانەت لە خاڵێکی دراوی ڕوانینەوە لەبەرئەم ڕووناکی دەستکردا ڕەنگەکە وا دەردەکەوێت جیاواز بێت، یان بۆ کەسێک کە نابینای ڕەنگ بێت، یان بۆ کەسێک کە چاویلکەی شینی لەچاو کردبێت، کاتی ئەو کەسە لە تاریکیدا بێت ئەوا بە هیچ شێوەیەک لای ئەو، ڕەنگ بوونی نیە، بەلام لەدەست لێدان و بیستنی دەنگدانەوەی مێزەکەدا، مێزەکە بە نەگۆڕی دەمێنێتەوە، ئەم ڕەنگە شتێکی بەپێنەیی نیە لە مێزەکەدا، بەڵکو شتێکە پشت دەبەستێت بە مێزەکەو بینەرو ئەو ڕێگایەی کە ڕووناکیەکەی پێدەکەوێتە سەر مێزەکە. کاتی لە ژیانی ئاساییدا دەربارەی ڕەنگی مێزەکە دەدوێین، مەبەستمان تەنیا لە جۆری ئەو ڕەنگەیە کە لە خاڵی بینینی ئاساییەوەو لە حاڵەتی ڕووناکی ئاساییدا بۆ بینەری ئاسایی دەردەکەوێت. بەلام ڕەنگەکانی تر کە لە حاڵەتی تردا دەردەکەون لایەنێکی دروستتریان هەیە بۆئەوەی بە حەقیقی دابنرێن، لەبەرئەوە بە مەبەستی بەلارەنانی مەیلی پەسەندکردن، ئێمە ناچارین نکوڵی ئەوە بکەین کە مێزەکە لەخۆیدا هیچ ڕەنگێکی تایبەتی هەبێت.

هەمان شت بەسەر چنین (بنیاد)ەکەدا دەسەپێنرێت. کەسێک بەچاوی ئاسایی دەتوانێت دەنکی ورد ببینێت، بەلام سافی و ڕێک و پێکی مێزەکە بە ڕێگای تر دەردەکەوێت، ئەگەر بە مایکرۆسکۆپ سەیری مێزەکەمان کرد ئەوا زبرو پڕ لە بەرزی و نزمی دەبینین سەرباری هەموو ئەو جۆرە جیاوازیانەی کە بە چاوی ئاسایی نایبینرێن. کام لەمانە مێزە حەقیقیەکەیە؟ ئێمە بە سروشتی، گەرەکوومان بەلای ئەوەدایە بڵێین ئەوەیان لە ڕێگای مایکرۆسکۆپەوە دەیبینین زیاتر حەقیقیە. بەلام ئەویش بە مایکرۆسکۆپێکی زۆر بەهێزتر لەچاو یەکەمجاریدا دەگۆڕێت. ئەنجا ئەگەر نەتوانین بڕوا بەوە بکەین کە بەچاوی ئاسایی دەیبینین، بۆچی دەبێ بڕوا بەوە بکەین کە لە ڕێگای مایکرۆسکۆپەوە دەیبینین؟ بەمجۆرە، جارێکی تر ئەو بڕوا پێبوونەی لە هەستماندایە لەوەوە دەستمان پێکرد، ئێستا ئەو بڕوایە لامان بوونی نامێنێت.




شێوەی مێزەکە باش نیە، ئێمە هەموومان خووی حوکمدانمان هەیە بەسەر شێوە ڕاستەقینەکانی شتەکاندا و ئەمەش دەکەین زۆر دوور لە پێچەوانە کردنەوەی ئەوەی کە بگەینە ئەو بیرکردنەوەیەی کە بە ڕاستی شێوە ڕاستەقینەکان دەبینین. بەلام لە ڕاستیدا، ئەگەر هەوڵی وێنەکێشان بدەین، دەشێ هەموومان فێر ببین. ئەو شتەی کە دەدرێت لەهەر خاڵێکی جیاوازی ڕوانینەوە لە شێوەیەکی جیاوازدا دەردەکەوێت. ئەگەر مێزەکەی ئێمە بە ڕاستی لاتەریب بێت، ئەوا لەهەموو خاڵەکانی ڕوانینەوە وا دەردەکەوێت کە دوو گۆشەی تیژو دوو گۆشەی کراوەی هەبێت. ئەگەر لابەرامبەرەکان تەریب بن ئەوا

وا دەردەکەون کە لە خاڵێکی دووری تەماشاکردنەوە بەیەك بگەن، ئەگەر دوو لابەرامبەرەکان لە درێژیدا یەکسان بن، وا دەردەکەون کە لانزیکەکەیان درێژتر بێت. هەموو ئەم شتانە ئاسایی لە روانین بۆ مێزەکەدا تێبینی ناکرێن، چونکە تاقیکردنەوە فێری کردووین کە شێوەی راستەقینە (حەقیقی) لە شێوە ئاشکراکەوە بنیاد بنێین. شێوەی حەقیقیش ئەوەیە کە وەکو کەسانی پراکتیکی بایەخدانی ئێمە دەجووڵێنێ. بەڵام شێوەی حەقیقی ئەوە نیە کە ئێمە دەیبینین، بەڵکو شتێکە لەوەوە کە دەیبینین بە ئەنجام دەهێنرێت، ئەوەشی کە دەیبینین بە بەردەوامی لە شێوەدا لە گۆڕاندایە کاتێ بەژوورەکەدا دەسوڕێینەوە. لەبەرئەوە لێرەدا جارێکی تر هەستەکان وا دەرناکەون کە حەقیقەتمان لەبارەی مێزەکە خۆیەوە پێشکەش بکەن بەڵکو تەنیا لەبارەی رووکەشی مێزەکەوە پێشکەشمان دەکەن.

کاتێ باسی هەستی بەرکەوتن دەکەین هەمان شێوە کێشە سەرهەڵدەدات. راستە مێزەکە هەمیشە هەستکردن بە رەقێتیمان دەداتێ و هەست دەکەین بەرگری پەستان دەکات، بەڵام ئەو هەستکردنەی کە ئێمە بەدەستی دێنین پشت دەبەستێت بەوەی ئێمە بە چ توندیەك پەستان دەخەینە سەرمێزەکە، هەروەها بە چ بەشێکی لەش ئێمە ئەو پەستانەی دەخەینە سەر. بەمجۆرە هەستکردنە، جۆراوجۆرەکان کە دەرئەنجامی پەستانە جۆراوجۆرەکان یان بەشە جۆراوجۆرەکانی لەشن، ناشێت دابنرێت بۆ ئاشکراکردنی راستەوخۆی هەر خاسیەتێکی دیاریکراوی مێزەکە، بەڵکو زیاتر بۆ ئەوەیە کە ببێتە ئاماژەی هەندێ خاسیەت کە لەوانەیە ببێتە هۆی هەموو هەستکردنەکانو لە راستیشدا لە هیچیاندا دەرناکەوێت. هەمان شت هێشتا زۆر بە ئاشکرا دەسەپێت بەسەر ئەو دەنگانەدا کە بەهۆی لێدانی مێزەکەوە دەشێ دروست بن.

بەمجۆرە ئاشکرا دەبێت، کە مێزە حەقیقیەکە، ئەگەر مێزێکی حەقیقی هەبێت، هەمان شێوەی ئەو مێزە نیە کە راستەوخۆ تاقی دەکەینەوە بەهۆی بینین یان دەستلێدان یان بیستنەوە. مێزە حەقیقیەکە، ئەگەر مێزێکی حەقیقی هەبێت، ئەوە بە هیچ شێوەیەك راستەوخۆ لای ئێمە ناسراو نابێت، بەڵکو دەبێت دەلالەت کردنێك لەو شتەوە هەبێت کە راستەوخۆ دەزانرێت. لەبەرئەوە دوو پرسیاری زۆر گران راستەوخۆ سەرهەڵدەدن کە ئەوانیش بریتین لە:

1-ئایا هەرگیز مێزێکی حەقیقی هەیە؟

2-ئەگەر مێزێکی حەقیقی هەیە دەشێ چ جۆرە شتێك بێت؟

ئەوە یارمەتی ئێمە دەدات لە بیرکردنەوە لەم پرسیارانە بەوەی کەم زاراوەی ئاسانیان هەیە کە بەهۆیانەوە ماناکە دیاریکراو و ئاشکرایە. کەواتە با ناوی "زانیاری حسی" لەو شتانە بنێین کە راستەوخۆ بە هەستکردن دەزانرێن. لەو شتانەش وەکو رەنگەکان، دەنگەکان، بۆن، رەقێتی، زبرێتی و.. تاد، دەبێ ناوی "هەستکردن"، ببەخشن بە تاقیکردنەوەی راستەوخۆی بە ئاگایانەی ئەم شتانە. بەمجۆرە هەرکاتێ رەنگێك ببینین، ئەوە ئێمە هەستکردن بە رەنگمان هەیە، بەڵام رەنگەکە خۆی زانیارییەکی حسییە، نەك هەستکردن. رەنگەکە ئەو شتەیە کە ئێمە راستەوخۆ لێی بەئاگاین، بەئاگایەتیەکەش خۆی، هەستکردنە. شتێکی ئاشکرایە ئەگەر ئێمە بمانەوێت هەرشتێك لەبارەی مێزەکەوە بزانین، دەبێ ئەو زانینە لە رێگای هۆکاری زانیاری حسییەوە بێت -رەنگی قاوەیی، شێوەی لاکێشەیی و سافێتی و.. شتی تریش کە ئێمە پەیوەستیان دەکەین بە مێزەکەوە، بەڵام لەبەر ئەو هۆیانەی کە خرانەڕوو، ئێمە ناتوانین بڵێین مێزەکە زانیاری حسییە، یان تەنانەت زانیاری حسی

راستەوخۆ خاسیەتەکانی ئەم مێزەیە، بەمجۆرە کێشەیەک لە پەیوەندی زانیاری حسی بە مێزە حەقیقیەکەوە سەرهەڵدەدات کەوا دادەنرێت شتێکی لەمجۆرە بێت.

مێزە حەقیقیەکە، ئەگەر هەبێت، ئێمە ناوی دەبەین بە شتێکی فیزیکی (مادی) لەبەرئەوە دەبێ بیر لە پەیوەندی زانیاری حسی و شتە فیزیکیەکان بکەینەوە. کۆکردنەوەی هەموو شتە فیزیکیەکان ناودەبرێت بە مادە، لەبەرئەوە دوو پرسیارەکەی ئێمە دەشێ بەمجۆرە دەربڕینەوە:

1-ئایا شتێکی لەوجۆرە هەیە وەکو مادە؟

2-ئەگەر ئەو شتە هەیە، ئایا سروشتەکەی چییە؟

ئەو فەیلەسووفەی کە یەکەم شت هۆیەکان بۆ دانانی شتە راستەوخۆکانی هەستەکانی ئێمە بەشێوەیەکی دیار دەخاتە پێش چاو، بەوەی کە بەدەر لە بوونی ئێمە بوونیان نیە.. بیشۆپ بارکلییە (1685–1753). سێ دایەلۆگەکەی نێوان هایلاس و فیلۆنۆس لە دژایەتیکردندا بۆ گومانگەران و بێ بڕوایان دەست پێدەکات بە مەبەستی سەلماندنی ئەوەی کە هەرگیز شتێکی لەوجۆرە نیە کە مادە بێت و جیهانیش لە هیچ شتێك پێکنایەت بێجگە لە ئەقڵەکان (مێشك) و بیرۆکەکانیان. هایلاس تاکو ئەم کاتە بڕوای بە مادە هەبووە، بەڵام ئەو نزیك نیە لە فیلۆنۆس کە بێ بەزەییانە پاڵی دەنێت بەرەو ناکۆکی و دژایەتیەکان و نکوڵی کردنەکەی لە مادە وا لێدەکات کە لە کۆتاییدا وا دەرکەوێت کە تا رادەیەکی زۆر هەستێکی گشتی سادە بێت. ئەو گفتوگۆیانەی کران بەهای زۆر جیاوازیان هەیە، هەندێکیان گرنگ و ئاشکران، ئەوانی تریان تێکەڵ و پێکەڵ و قسەکردنی پەراوێزین، بەڵام بارکلی ئەو مافەی نیشاندان دەپارێزێ کە بوونی مادە توانای نکوڵیکردنی هەیە بەبێ شتێکی ناکۆك بە ئەقڵ و مەنتیق. خۆ ئەگەر شتێك لە دەرەوەی ئێمە بوونی هەبێت، ئەوا ئەو شتانە ناتوانن ببن بە مادە راستەوخۆکانی هەستکردنی ئێمە.

باركلی

دوو پرسیاری جیاواز هەن کە پێکداچوون، کاتێ ئێمە دەپرسین *ئایا مادە بوونی هەیە* و داخۆ گرنگە بە *ئاشکرایی بیانپارێزین*. بەشێوەیەکی گشتی مەبەستمان لە مادە، شتێکە کە بەرامبەری ئەقڵەو ئێمە بیری لێدەکەینەوە کاتێ بۆشایی داگیردەکات و لەبەرئەوەی بەشێوەیەکی بنەڕەتی توانای هیچ جۆرە بیرکردنەوە یان هوشیارییەکی نیە. بەشێوەیەکی سەرەکی بارکلی لەم رووەوەیە کە مادە رەت دەکاتەوە، بۆیە دەبێ بگوترێ بارکلی نکوڵی ئەوە ناکات زانیاری حسی کە ئێمە بە شێوەیەکی گشتی وەکو ئاماژەکانی بوونی مێزەکە وەری دەگرین، لە راستیدا ئاماژەی بوونی شتێکن لە دەرەوەی ئێمە، بەڵام بارکلی نکوڵی ئەوە دەکات کە ئەم شتە نائەقڵانی یان لە دەرەوەی فیکردابێت، لەبەرئەوە نە ئەقڵ و نە فیکر، لەلایەن ئەقڵێکەوە پەسەند ناکرێن، بارکلی بوار دەدات بەوەی کە پێویستە شتێك هەبێت کە لەسەر بوون بەردەوام بێت، کاتێ لە ژوورەکە

بچینە دەرەوە یان چاوەکانمان بنوقێنین، بەمەش ئەوەی بە بینینی مێزەکە ناوی دەبەین لە راستیدا بەڵگەی بڕواکردنمان بە شتێك دەداتێ کە ئەنانەت لە کاتێکدا ئێمەش نایبینین ئەو هەر بەردەوام دەبێت و هەیە. بەڵام بارکلی بڕوای وایە کە ئەم شتە ناشێت بەشێوەیەکی بنەڕەت لە سروشتدا جیاواز بێت لەوەی کە ئێمە دەیبینین، هەروەها ناتوانێت بەشێوەیەکی گشتی لە دەرەوەی بینین بێت، ئەگەرچی پێویستە لە دەرەوەی بینینی ئێمەدا بێت. بەمجۆرە بارکلی بەرەو ئەوە چوو کە مێزە راستەقینەکە وەکو فیکرەیەك لە ئەقڵی خوادا دابنێت. فیکرەیەکی لەمجۆرە بەردەوامیەکی پێویست و سەربەخۆی هەیە لە ئێمە. بەبێ بوونی -وەکو مادە بە شێوەیەکی تر دەبێ- شتێکی تەواو نەزانراو بێت، ئەویش لەو روانگەیەوە کە ئێمە دەتوانین تەنیا ئەنجامگیری بکەین و هەرگیز ناشێت راستەوخۆو بە پەلە لێی ئاگادار بین.

فەیلەسوفانی تر لە سەردەمی بارکلییەوە دیسان لەسەر ئەوە رۆیشتون سەرباری ئەوەی کە مێزەکە لە پێناوی بوونی خۆیدا پشت بەوە نابەستێت کە من بینبێتم، بەڵکو پشت دەبەستێت بە بینینی لەلایەن ئەقڵێکەوە کە ئەویش بە پێویست ئەقڵی خودا نیە (یان بەشێوەیەکی تر دەرکی پێدەکرێت)، بەڵکو زۆر بە ئاسایی سەرجەم ئەقڵی دەستەجەمی گەردونە. ئەمەی کە ئەوان بەدەستی دێنن، هەمان شێوەی بارکلی، بە شێوەیەکی سەرەکی لەبەر ئەوەیە کەوا بیردەکەنەوە، ناشێت هیچ شتێك، حەقیقی، بوونی هەبێت، یان لە هیچ رێژەیەکدا شتێك نیە بە حەقیقی بزانرێت بێجگە لە ئەقڵەکان و بیرکردنەوەو هەستکردنەکانیان. دەشێ ئێمە ئەو گفتوگۆیە دەربڕین کە بە هۆیەوە ئەوان پاڵپشتی روانینی خۆیان لەمجۆرە رێگایەدا دەکەن: بیر لە هەرچیەك بکرێتەوە ئەوە بیرۆکەیەکە لە ئەقڵی ئەو کەسەدا کە بیری لێدەکاتەوە، کەواتە ناشێت بیر لە هیچ شتێك بکرێتەوە بێجگە لەو بیرۆکانەی لە مێشك (ئەقڵ)دا هەن، کەواتە هەر شتێکی تر لە سەرووی تەسەورکردنەوە بێت و ئەوەی جێگای تەسەور کردن نیە ناتوانێت بێت.

ئەم جۆرە گفتوگۆیە، بە بڕوای من، هەڵەیەو بەدڵنیاییەوە ئەوانەی پێشکەشی دەکەن زۆر بە کورتی یان بە توندی داینانێن، بەڵام راست بێت یان نا ئەوا گفتوگۆکە لە ئاستێکی فراواندا لەم شێوەیەدا یان لەو شێوەیەدا، بەرەو پێشەوە براوە. زۆریش لە فەیلەسوفان، لەوانەیە زۆرینەش بن، ئەوەیان وەرگرتوە کە هیچ شتێك حەقیقی نیە جگە لە ئەقڵەکان (مێشکەکان) و بیرۆکەکانیان. ئەم جۆرە فەیلەسوفانەش پێیان دەگوترێت "ئایدیالیستەکان". کاتێ دەکەونە لێکدانەوەی مادە، یان وەکو بارکلی دەڵێن لە راستیدا مادە هیچ شتێك نیە بێجگە لە کۆمەڵە بیرۆکەیەك، یان وەکو لیبینز (1646–1716) دەڵێن ئەوەی وەکو مادە دەردەکەوێت لە راستیدا کۆمەڵێك لە ئەقڵی زۆر یان کەم، سەرەتاییە.

بەڵام ئەم فەیلەسوفانە سەرباری ئەوەی نکوڵی مادە دەکەن وەکو شتێکی دژی ئەقڵ، لەگەڵ ئەوەشداو لە روویەکی ترەوە مادەیان قبووڵە. لێرە بەدواوە ئەوە دێتەوە یاد کە ئێمە دوو پرسیارمان بەرزکردەوە کە بە دیاری کراوی ئەمانە بوون.

1-ئایا هەرگیز مێزێکی حەقیقی هەیە؟

2-ئەگەر هەیە، ئەو مێزە چ جۆرە شتێکە؟

ئێستا بارکلی و لیبینز هەردووکیان بەوە رازین کە مێزێکی حەقیقی هەیە بەڵام بارکلی دەڵێت: لە ئەقڵی خوادا بیرۆکەی دیاریکراو هەیە، لیبینیزیش دەڵێت: کۆمەڵێك رۆح هەیە. بەمجۆرە هەردووکیان وەڵامی پرسیاری یەکەممان دەدەنەوە بە ئەرێ (بە بەڵێ)، لە وەڵامیشیاندا بۆ پرسیاری دووەممان تەنیا لادانێك هەیە لەچاو روانینی کەسانی ئاساییدا.

لە راستیدا، تا ئەندازەیەکی زۆر، هەموو فەیلەسوفان وا دەردەکەون کە رازی بن بەوەی مێزێکی حەقیقی هەیە، تا رادەیەکی نزیک لە هەموو فەیلەسوفان بەوە رازین، هەرچەندە زۆر لە زانیاری حسی ئێمە -رەنگ، شێوە، سافیتی و تاد- دەشێ بکەونە سەر خۆمان، لەگەڵ ئەوەشدا رووداینیان ئاماژەی بوونی شتێکە لە دەرەوەی ئێمە، شتێك کە لەوانەیە بە تەواوی جیاواز بێت لە زانیاری حسیمان و تاکو ئێستاش وەکو ئەنجام هێنی ئەو زانیارییە حسییانە دابنرێت هەرکاتێ ئێمە لە پەیوەندییەکی گونجاودا بووین لەگەڵ مێزە حەقیقییەکەدا.

ئێستا بە ئاشکرا ئەم خاڵەی کە فەیلەسوفەکان لەسەری کۆکن- ئەو روانینەیە کە مێزێکی راستەقینە هەیە، ئیتر سروشتەکەی هەرچییەك بێت- لە گەوهەردا گرنگەو لەمەودواش بەهادار دەبێت لە کاتێکدا بیر لەوە بکرێتەوە چ بەڵگەیەك هەیە بۆ پەسەندکردنی ئەم روانینە پێشنەوەی لەسەر پرسیاری زیاتر سەبارەت بە سروشتی مێزە حەقیقییەکە بەردەوام بین. بەشی داهاتوی (ئەم کتێبە)مان سەبارەت بە بەڵگەکانی ئەو رایە دەبێت کە هەمیشە مێزێکی حەقیقی هەیە.

پێشنەوەی دوورتر بڕۆین، کارێکی پەسەندە بۆ ساتێ بیر لەوە بکەینەوە ئەوەی تاکو ئێستا ئاشکرامان کردوە چییە. ئەمەش ئەوەی دەرخستوە، ئەگەر ئێمە هەر شتێکی ئاسایی لەو جۆرە وەربگرین کە وا دادەنرێت بەهۆی هەستەکانەوە دەزانرێت، ئەوا ئەوەی هەستەکان راستەوخۆ پێمان دەڵێن حەقیقەت نیە لەبارەی ئەو شتەوە لەبەرئەوەی ئەو شتە دوورە لە ئێمەوە، بەڵکو ئەوەی هەستەکان راستەوخۆ پێمان دەڵێن تەنیا حەقیقەتە سەبارەت بەو زانیاری حسییە تایبەتە کە تا ئەو ئاستە ئێمە دەتوانین بیبینین و دەوەستێتە سەر پەیوەندییەکانی نێوان ئێمەو ئەو شتە. بەمجۆرە ئەوەی ئێمە راستەوخۆ دەیبینین و هەستی پێدەکەین تەنیا رووکەشە کە بڕوامان وایە ببێتە ئاماژەیەك و جۆرێك لە حەقیقەت لە پشتیەوە بێت، بەڵام ئەگەر حەقیقەتەکە ئەوە نەبێت کە دەردەکەوێت، ئایا ئێمە هیچ هۆکارێکمان هەیە بۆ زانینی ئەوەی داخۆ هەرگیز جۆرێك لە حەقیقەت هەیە؟ ئەگەر ئەوە هەبوو، ئایا ئێمە هیچ هۆکارێکمان هەیە بۆ دۆزینەوەی ئەوەی کە حەقیقەت لەچی دەچێت؟



ئەم جۆرە پرسیارانە مایەی شڵەژانن و کارێکی زەحمەتە کە بزانرێت تەنانەت گریمانە هەرە غەریبەکانیش ناشێت راست بن. بەمجۆرە مێزەکەی لەمەڕخۆمان. بۆتە جێگای بایەخ پێدان، بەڵام فیکرە هەرە لاوازەکانی ئێمە تاکو ئێستا کردوویانە بە کێشەیەکی پڕ لە ئیحتیمالاتی سەرسوڕمان، تاکە شتێك لەبارەی ئەو مێزەوە کە دەیزانین ئەوەیە کە ئەو شتە نیە کە دەردەکەوێت، لە پشتی ئەم ئەنجامە ئاساییەوە بەردەوام ئێمە ئازادی تەواوی هەڵسەنگاندمان هەیە. لیبینز پێماندەڵێت کۆمەڵەی رۆحەکانە، بارکلی پێمان دەڵێت بیرۆکەیەکە لە ئەقڵی خوادا. زانستی جیدی کە کەمتر جێگای

سەرسامبوونە پێماندەڵێت کۆبوونەوەیەکی گەورەی بارگە کارەباییەکانە لە جووڵەیەکی توونددوتیژدا.

لەنێو ئەم ئیحتمالاتە جێگای سەرسوڕمانانەدا، گومان پێشنیاردەکات کە لەوانەیە بە هیچ شێوەیەک مێز نەبێت. فەلسەفە ئەگەر نەتوانێت وەلامی زۆر پرسیار بداتەوە وەکو ئەوەی ئێمە دەیخوازین، ئەوە بە لایەنی کەمەوە توانای بەرزکردنەوەی ئەو پرسیارانەی هەیە کە بایەخی جیهان زیاددەکەن و ئەو غەریبێتی و سەرنجراکێشیەش نیشاندەدەن کە کەمێ دەکەوێتە ژێر ڕووکەشەوە، تەنانەت لە شتە هەرە ئاساییەکانی ژیانی ڕۆژانەشدا.

## سەرچاوە

*Bertrand Russel. The Problems of Philospny. London Universtity Press. 1959. P.p-7-16.*



لە ئینتەرنێتەوە

# هیراکلیتس و بیرکردنه‌وه‌ی بنه‌ڕه‌تی

## کاریگه‌ریی هیراکلیتس له‌سه‌ر هایدگه‌ر

■ کێنس ماڵی

● و. له ئینگلیزییه‌وه: عه‌بدوڵڵا سیوه‌یلی




له گۆشه‌نیگایه‌کی دیاری کراوه‌وه، ئه‌توانرێت فه‌لسه‌فه‌ی خۆرئاوا وه‌ك مێژووی ململانێ و نه‌یاری رێبازه میتافیزیکیه‌کان ته‌ماشا بکرێت، که هه‌ر یه‌کێکیان له روونکردنه‌وه‌ی راستی و خستنه‌رووی واقیعدا دژایه‌تی ئه‌وه‌ی تر ده‌کات. وێنه‌ی هیراکلیتس که ئه‌م مێژووه په‌رچی ده‌کاته‌وه ته‌واو ئاشکرایه: ئه‌و دانه‌ری کۆسمۆلۆجیای (هه‌بوون)ێکی هه‌تاهه‌تایی له‌وه‌ستان نه‌هاتووه. وه هه‌میشه ئه‌م وێنه‌یه‌ی هیراکلیتس له‌پاڵ ئه‌وه‌که‌ی (پارامێندس)ه‌وه داده‌نرێت، که وه‌ك جه‌مسه‌رێکی به‌رامبه‌ر هیراکلیتس لایه‌نگری بوونێکی نه‌گۆڕ ده‌کات. لێره به‌دواوه کرداری روبه‌ڕوبوونه‌وه‌ی نێوان (بوون) و (هه‌بوون) وه‌ك خاڵێکی گرنگ ته‌ماشا ده‌کرێت بۆ چوونه ناو دنیای ئه‌فلاتونه‌وه، که له (تیۆری ئایدیاکان)دا سازش له‌نێوان بوون و هه‌بووندا ده‌کات. هه‌روه‌ك له هه‌مان گۆشه‌نیگاوه دیاره، فه‌لسه‌فه‌ی خۆرئاوایی بریتیه له مێژووی دژایه‌تی کردنی ئه‌ره‌ستۆیه‌ك بۆ ئه‌فلاتۆنێك، ئۆگه‌ستینێك بۆ ئه‌کوینیه‌ك، لۆکتێك بۆ دیکارتێك، کانتێك بۆ هیۆمێك، هیگڵێك بۆ کانتێك، یان له‌وانه‌یه له کۆتاییدا دژایه‌تی کردنی نیتشه بێت بۆ سه‌رتاپای نه‌ریتی پێش خۆی. ئه‌م تێڕوانینه‌ی فه‌لسه‌فه‌ی خۆرئاوا کۆسمۆلۆجیای دیالەکتیکی هیراکلیتس به پاڵنه‌ری که‌رتی (جزئی) داده‌نێت له به‌رزراگرتنی ئه‌م مێژووه‌دا. به‌هه‌رحاڵ و به گرنگییه‌کی زیاتره‌وه ئه‌م تێڕوانینه‌ی فه‌لسه‌فه‌ی خۆرئاوا له‌سه‌ر ئه‌و قه‌ناعه‌ته‌وه بنیات نراوه که ده‌ربڕینه کۆسمۆلۆجیه‌کانی هیراکلیتس به شێوه‌یه‌کی جێگیرو توندو تۆڵ له نووسینه (پارچه‌یی– شذرات)یه‌کانی هیراکلیتسدا ده‌چه‌سپێت. کاریگه‌ریی نووسینه‌کانی هایدگه‌ر له‌سه‌ر ئه‌م تێڕوانینه‌ی فه‌لسه‌فه‌ی خۆرئاوا بوه هۆی ئه‌وه‌ی که

بناغەو بنەڕەتە سەرەتاییەکانی ئەم تێڕوانینە بلەرزێنێت. لەبەر ڕۆشنایی ئەوەی کە هایدگەر بۆ ئەم مێژووەی ئەنجامداوە، ناشێت چی تر لایەنگری ئەو تێڕوانینە بین کە فەلسەفەی خۆرئاوا بە مێژووی ململانێی ڕێبازە میتافیزیکیەکان دادەنێت. ئەگەر نزیکتر بڕوانین و بەشێوەیەکی بنەڕەتیانە بیربکەینەوە، ئەوا دەردەکەوێت کە هایدگەر پێشنیاری ئەم ڕاستییە دەکات، پاشان تێدەگەین کە شتێکی گرنگ و پڕ بایەخ ئەکەوێتە ئەم مێژووەوە کە ڕەنگە ئێمە بەدرێژایی ئەو ماوەیەی کە سەرقاڵین بە ململانێی نێوان ڕێبازە میتافیزیکیەکانەوە پشتگوێی بخەین. هایدگەر ئەوە دەخاتە ڕوو کە بیرکردنەوە پێویستی بەوە نییە کە خۆی بە گفتوگۆی نێوان ئەم ڕێبازانەوە خەریك بکات، هێندەی کە پێویستە ئەو ڕێبازانە هەڵبسەنگێنێت و سازش لەنێوانیاندا بکات، بیرکردنەوە ڕووبەڕووی قورسترین و پڕ داواکاریترین ئەرکی خۆگونجاندن بووەوە لەگەڵ شتێکی تری بیرکردنەوەی خۆرئاوادا کە ئەکەوێتە نزیکی ئەم ڕێبازە بە ململانێ بارگاویانەوە کە بە ژاوەژاوی جەنگی نێوانیان ڕووپۆش کراوە. بەلای هایدگەرەوە ئەم هاتنە یان ڕوودانە (occurance)، کە ناوی (هێز)ی لێناوە، بەشێوەیەکی زۆر گەورەو کاریگەر لەو (کارە پارچەیی)یانەی هیراکلیتسدا کە لە پاش خۆی جێماوە، نووسراوەو قسەی لەسەر کراوە.

گەر خوێندنەوەیەکی ورد ئەنجام بدەین لەسەر کارکردنی هایدگەر لەسەر فەلسەفەی فەیلەسوفەکانی پێش خۆی، ئەوا بۆمان دەردەکەوێت کە هایدگەر بایەخێکی زۆر و گرنگییەکی باش دەدات بە هیراکلیتس. ڤاڵتەر شۆڵز ئەگێڕێتەوە کەوا جارێکیان هایدگەر پێی ڕاگەیاندووە "هەندێ جار ئەڵێی هیراکلیتس لە نزیکمەوە (وەك چاودێرێك –وەرگێڕ–) وەستاوە". دەشێ بپرسین: ئەم هیراکلیتسە کێیە کە بەسەر سەری هایدگەرەوە وەستاوەو کاریگەریی هەیە؟ ئایا کەسێك ئەتوانێت وا مەزەنە بکات کە ئەم هیراکلیتسە ئەوەیە کە کۆسمۆلۆژیای میتافیزیکیانەی (هەبوون)ی نووسیوە؟ نەخێر، هەر دەربڕینێك کە هایدگەر لەسەر هیراکلیتس و گریکەکان وتویەتی دژو نەیاری ئەم مەزەنە کردنەیە. سەرەڕای ئەمەش هیچ شتێك لە بیرکردنەوەی هایدگەردا بەدی ناکرێت کە لەسەر مەفهومی هەبوونێکی (ئەبەدی)یەوە داڕێژرابێت. زیاتر ڕێی تێدەچێت کە هیگڵ یان نیتشە، هیراکلیتسیان بە (سەلەفی خۆیان) دانابێت (هەروەك چۆن لەڕاستیدا هەر واشیان کردوە) چونکە ئەوان پابەندبوون بە ڕوونکردنەوەی واقیع و درکاندنیەوە. بەڵام سیفەتی ئاشکراو زۆرجار پشتگوێ خراوی بیرکردنەوەی هایدگەر بە کورتی ئەوەیە کە هایدگەر هیچ هەڵپەیەکی لە ڕوونکردنەوەی واقیعدا نییە. ئەی کەواتە هایدگەر لەسەر چ بناغەیەك ئەو پێوەرە (وەك ئەوەی هیراکلیتس بەسەر سەرمەوە وەستابێت)ی وەرگرتووە؟ بەشێوەیەکی ئاشکرا، ئەو هیراکلیتسەی کە لە بیرکردنەوەی هایدگەردا کاریگەریی هەیە، بەشێوەیەکی بنەڕەتی جیاوازە لە هیراکلیتسی تەقلیدی. کەواتە چۆن ئەم دوو هیراکلیتسە بەراورد دەکرێن لەگەڵ یەکتردا؟

لەکاتێکدا کە (تەقلید) هیراکلیتس بەو فەیلەسوفە دادەنێت کە تیۆری (هەبوون)ی فۆرمەلە کردووەو کۆسمۆلۆژیای هێزە پشت بەیەك بەستوەکانی گەشەپێداوە، دەبینین هایدگەر بەو شێوە دەڕوانێتە هیراکلیتس کە یەکەم بیریاری خۆرئاوایە کە "لە ڕێگەی هێزەوە بیردەکاتەوە بەبێ ئەوەی بە ئاشکرا ناوی ببات". بۆ تێگەیشتن لەو بیانووەی کە هایدگەر دەیخاتە پاڵ هیراکلیتس پێویستە جارێکی تر بڵێین کە پابەندبوونی بۆ دۆزینکاری‌یە فینۆمینۆلۆژییەکان –وەك لە کتێبە سیستماتیکییە سەرەکی‌یەکەیدا واتە (کات و بوون)دا دیارە – وا لە هایدگەر دەکات کەچیتر لەناو مەفهومی تەقلیدیی بیرکردنەوەدا کارنەکات. پێشتر لە کتێبی (کات و بوون)دا دەرکەوتبوو هەروەك چۆن لە کتێبەکانی دواتریدا زەقتر بووە کە بیرکردنەوە بەلای ئەوەوە پرۆسەیەکە

که بناغەکانی لە چوارچێوەی ئاشکراکردنی ئەو راستییەوە دەچەسپێنێت کە مرۆڤەکانی تیادا دانراوە.

ئەو بیرکردنەوەیەی کە جێگای بایەخی هایدگەرە بریتی نییە لەو بیرکردنەوەیەی کە ئەم ئاشکراکردنە فەرامۆشی دەکات و خۆی لە خودێتی هەست یان رۆحەوە دەئاڵاێنێت. ئەو بیرکردنەوەیەی کە جێی بایەخی هایدگەرە بیرکردنەوەیەکە کە کۆک و هاوسۆزە لەگەڵ پرۆسەی ئاشکراکردنی جیهاندا. بەمجۆرە ئەم بیرکردنەوەیە بریتی نییە لەو دەسکەوتە خودگەراییەی کە دیکارت هەمیشە لە جیهانی دادەبڕی. تا رادەیەك بیرکردنەوەیەکە کە گونجاوە لەگەڵ (جووڵە)یەکدا کە هایدگەر ناوی لێ دەنێت (هێن). بەشێوەیەکی تایبەتیش، هایدگەر ئەم بیرکردنەوەیە بە (بیرکردنەوەی بنەڕەتی) ناوزەد دەکات، چونکە پەیوەستە بە کۆمەڵە رەفتارو شێوازێکەوە کە بەهۆیانەوە شتەکان دێنە حاڵەتی ئامادەبیەوەو پاشان شێوازی بنەڕەتی بوونیان بەدەستدەهێنن.

ئەو بایەخ و گرنگییەی کە هیراکلیتس هەیەتی لای هایدگەر بریتی نییە لە پەسەندکردنی شەخصی ئەم فەیلەسوفە؛ بەڵکو زۆر بە سادەیی ئەو لایەنە دەخاتەڕوو کە بیرکردنەوەی بنەڕەتی هیراکلیتس لە رێگەی سادەیی لە دەربڕینیدا دێتە ناو وشەو زمانەوە کە لەوەوپێش لای هیچ فەیلەسوفێکی تر ئەم کارە ئەنجام نەدراوە. بەڵام بەهەر شێوەیەك بێت، ئەوە کاراکتەری (ناخودگەرا)یە کە لە هیراکلیتسدا قسە دەکات و هایدگەر بە بەرزو فرازمەند دەیترخێنێت. بۆ ئەوەی بە خودگەراییەوە گومرا نەبین و بۆئەوەی مێشکمان تەنها سەرقاڵی کاراکتەری "خودگەرایی"ی ئەو رووداوانە بێت کە بەم خودێتییە کاری تێ ناکرێت، ئەوا ئەوکات بیرکردنەوەی هیراکلیتس دیاردەیەك لەبەرچاو دەگرێ کە بەهۆی خودی خۆیەو دەرەوەی خۆیەوە خۆی نیشان دەدات. ئەمەش مانای ئەوەیە کە بیرکردنەوەی هیراکلیتس بەلای هایدگەرەوە بیرکردنەوەیەکی دیاردەگەرانەیە. بە ئازادکردنی وشەکانی هیراکلیتس لەو رەقێتییەی کە تیای دانراون و بە دانیان لەناو رووداوێکی بنەڕەتی ئاشکراکردندا، هایدگەر هیراکلیتسێکمان پیشان دەدات کە چی تر بەشێوەیەکی سەرەتایی و تایبەت دانەری رێبازە میتافیزیکییەکانی هەبوون نییە.

لەگەڵ ئەمەشداو سەرەرای هەبوونی کتێبەکانی هایدگەر، هێشتا هەندێ کەس سوورن لەسەر ئەوەی کە هیچ هیراکلیتسێك بوونی نییە جگە لەو هیراکلیتسەی کە لە (تەقلید)دا قاڵ بووە. بە فەرامۆشکردنی ئەو رێچکانەی کە بیرکردنەوەی هایدگەر کردوونیەتەوە بۆ سەرجەم پرۆسەی بیرکردنەوە (کۆمەڵە رێچکەیەك کە ڤاڵتەر بیمیل پێی وایە پێش هایدگەر بوونیان نەبووە)، هەندێ کەس تا ئێستا خوێندنەوەی هایدگەر بۆ هیراکلیتس رەت دەکەنەوە چونکە پێیان وایە ئەو خوێندنەوانە



دیسپلینی فیلولۆجی پشتگوێ دەخەن. ئەو سووربوونەو ئەم رەتکردنەوەیە لەو شکستەوە سەرچاوەیان گرتووە کە نەیانتوانیوە ئەوە ببینن کە تەقلید رەقێتی ئەو شتە دەنوێنێت کە لە بیرکردنەوەدا روودەدات و خودی فیلولۆجیاش لەناو کۆمەڵە مۆدێکی بیرکردنەوەدا چەسپاوە. هەڵسەنگاندنی کارکردنی هایدگەر لەسەر هیراکلیتس بە پێدانی پێوەرێکی فیلولۆجی، کە دواتر وەك

(بێکـات- timeless) و (بێهەڵـە infallible) دەدرێت، بۆنەوەیە کە بەشێوەیەکی زۆر کاریگەر شکست بهێنێت لە بینینی کاراکتەری مێژوویی و دواتر راگوزارو لەگۆڕانهاتووی فیلۆلۆجیا. خودی فیلۆلۆجیاش بە (زەرورەت) لەناو شێوازێکی بیرکردنەوەدا بە توندی چەسپاوەو هەمیشە لەناو سترەکتورێکی زمانەوانی و چەمکگەراییدا جێگیرە کە پرسیار ناوروژێنێت.

بەلام تەنانەت کاتێ کە خوێندنەوەیەکی فینۆمینۆلۆژیانە- لە عەقلیەتی بنەڕەتی فینۆمینۆلۆجیانەی هایدگەردا روودەدات- ئەوا هێشتا قورسە کە بە چەند وشەیەك کە بڕیاردەری واقیعێکی چەسپاوە لە بیرکردنەوە لە هیراکلیتس دووربکەوێتەوە. راستە کە پێویستە هیراکلیتسی قالبووی ناو (تەقلید) لەناو ئەو ئاشکراکردنەدا بیشێنەجێ بکرێتەوە کە تیایدا مرۆڤەکان دانراون وە راستیشە کە بەم کارەش ئەتوانین پردێك لەنێوان هیراکلیتس و بیرکردنەوەی بنەڕەتیدا دروست بکەین. هێشتا مانەوەش لەگەل کاراکتەری بزوتنەوە (movement- character)ی ئاشکراکردندا لە بیرکردنەوەی بنەڕەتیدا کارێکی گرانە.

دواجارو تەنانەت لە خوێندنەوەیەکی فینۆمینۆلۆژیانەی هیراکلیتسدا دەردەکەوێت کە تێگەیشتن لە گونجاوترین پەیوەندی بیرکردنەوەی بنەڕەتی بە یۆنانییەکان بەگشتی و هیراکلیتس بە تایبەتی کارێکی قورسە. ئایا کەسێك ئەتوانێت بەشێوەیەکی گونجاو پێشنیاری ئەوە بکات کە گەڕاندنەوەی فینۆمینۆلۆژیا بۆ گریکەکان (مەسەلەیەکە پەیوەستە بە بەدەستهێنانەوەی نزیکایەتی لەگەل شارەزاییە رەسەنە گریکییەکان؟). قسەکردن دەربارەی ئەو ئەزموونانە (شارەزاییانە) و هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانەوەی ئەو ئەزموونانە لە هیراکلیتس دا، یەکسانە بە قسەکردن لەجیاتی ئەو ئەزموونانەی کە لەبەردەم ئێمەدا داخراون. لەجیاتی هەوڵدانمان بۆ دۆزینەوەی هۆیەك (رێگایەك) بەرەو ئەزموونی گریکەکان بەو مەبەستەی کە هیراکلیتس بکرێتە بیانوویەك کەوا بیرکردنەوەی یان فیکری هایدگەر گشتگیر بووە، ئەوا دەبێت ئێمە شێوازێك بگرینەبەر بۆ ئەو ئەگەرەی کە فیکری یۆنانی بە (تەقلید) سیواخ دراوە، ئەگەرێك کە کاریگەریی هەبێت لەسەر ئەم سەردەمەمان. ئەم ئەگەرە لەلایەن یۆنانییەکانەوە بیری لێ نەکرابووەوە، بەلام ئێستاو لەناو ئەوپەڕەی کاراکتەری سەردەمەکەماندا، ئەگەرێکی دروستکرد بۆئەوەی بیربکەینەوە. بەمجۆرە (ئاوڕدانەوە) بریتی نییە لە بەدەستهێنانەوەی هۆکارێك (وسیلە) بەرەو ئەزموونی رەسەن، بەلکو زیاتر بریتییە لە کردنەوەی دەرگا بەڕووی ئەزموونی بیرکردنەوەمان لە دەرەوەی بیرکردنەوەی یۆنانییەکان. ئەوەی کە یۆنانییەکان بیریان لێ کردۆتەوە و ئەوەی کە بەجێماوە کە بیری لێ بکەنەوە، لەوێوە هەڵیداوەتە ئێستاوە. ئەمە پالنانێکە بەرەو پێشەوە، بە دەربڕینێکی تر، خوێندنەوەی هایدگەر بۆ هیراکلیتس بریتییە لە سەرنجدانی هایدگەر بۆ ئەو شتەی کە لەبیری یۆنانیدا پال بەخۆیەوە دەنێت بەرەو ئێمە. وە ئەوەی بەم شێوەیە پالی خۆی دەنێت بەرەو ئێمە ئەزموونی رەسەنمان پێ نابەخشێت، بەلکو بیرکردنەوەی خۆمان کارا دەکات. هایدگەر ئەم کاراکردنە ناودەنێت (هێز- Power).

## سەرچاوە

ئەم وتارە بەشێکە لە کتێبی (Heidegger on Heraclitus, a new reading)

نووسینی: کێنس مالی- زانکۆی ویسکۆنسن

بارلیس ئیمیاد- زانکۆی نوپاول

لە ئینتەرنێتەوە وەرگیراوە.

# سەرەتایەك دەربارەی ریمۆن ئارۆن

■ هاشم ساڵح
● و. لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

## پەیوەندی و شەڕو ململانێکانی

ماوەیەکە خانەی بڵاوکردنەوەی (فلاماریۆن) گرنگی بە چاپکردنی ژیاننامەی هەندێك لە کەسەیاتیە مەزنەکانی بواری فەلسەفەو ئەدەب دەدات کە بەم دواییە لە دنیا دەرچوون. پاش ئەوەی ئەم دەزگایە لە کۆتایی هەشتاکاندا ژیاننامەی هەریەك لە "رۆلان بارت" و "میشیل فۆکۆ"ی بڵاوکردەوە، ئەمڕۆکەش ژیاننامەی "ریمۆن ئارۆن" دەخاتە بەردەست خوێنەرانی. هەرکاتێك ناوی "ریمۆن ئارۆن" دێت ناوی "ژان پۆل سارتەر"ی گەورە رکابەری و ناوی "ئەندرێ مالرۆو ئەلبێر کامۆو ژەنەراڵ دیگۆل و کلۆد لیڤی شتراوس و پییر بۆردیۆ"و دەیان کەسی تر دێت. پاشان بە شێوەیەکی تایبەتی باس لەو ململانێ ئایدیۆلۆژیە توندو تیژە دەکرێت کە رۆشنبیرانی فەرەنسای کرد بە دوو کەرتەوە: بەرەی راست و بەرەی چەپ.

هەندێك لایەنگری کەمپی سۆڤیەت بوون، هەندێکیش داکۆکیان لە کەمپی لیبراڵی خۆرئاوایی دەکرد بە سەرکردایەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. ئەم دابەشبوونە توندە لە کۆتایی جەنگی جیهانی دووەمەوە تا رووخانی دیواری بەرلین و هەرەسی کۆمۆنیزم لە ساڵی 1989، کۆنترۆڵی کایەی فیکری فەرەنسی کردبوو. بەڵام دەکرێت بڵێین هەرەسی کۆمۆنیزم بە دە ساڵ بەر لەو مێژووە ببووە حەقیقەتێکی بەرچاو.




گەر باڵی چەپرەو، چەندین رێبەری وەك "ژان پۆل سارتەرو لوی ئالتۆسێر هنری لۆفیڤەرو.. هتد" هەبوو بێت، ئەوا کەس گومانی لەوە نیە کە تاکە

ڕێبەری ئاقاری لیبرالی ڕاستڕەو "ریمۆن ئارۆن" بوو. ئەوەی جێی سەرسوڕمانیشە ئەوەیە کە ئەو بە تەنها لە دژی تەواوی رۆشنبیرە چەپڕەوەکان دەجەنگا.

وەك ئاشکراشە چەپ بە هەموو جۆرەکانیەوە لە وجودی و مارکسی و ماوی‌یەوە، بە درێژایی زیاد لە سی دانە ساڵ کۆنترۆڵی کایەی رۆشنبیری فەرەنسیان کردبوو. لەگەڵ ئەوەشدا "ریمۆن ئارۆن" کەم تا زۆر لە جێی خۆی نەلەخشاو بیروڕای نەگۆڕی ، بڕوای بە سەرکەوتنی بلۆکی لیبرالی، لە دواجاردا، لەق نەبوو. بەڵام قەدەر بواری ئەوەی نەدا تا بەچاوی خۆی ئەو ڕووداوە گرنگە ببینێ کە بە درێژایی هەموو تەمەنی چاوەڕێی بوو: ئەو ڕووداوەش لەبەریەك هەڵوەشانی یەکیەتی سۆڤیەت و داڕمانی ئایدیۆلۆژیای کۆمۆنیزم بوو.

"ریمۆن ئارۆن" ساڵی 1983 بە جەڵدەی دڵ کۆچی دوایی کرد. پاش کەمێك لە چوونە دەرەوەی لە (کۆشکی داد) گیانی دەرچوو. ئەو ڕۆژە ئەو لەو جێگایە بوو تا شایەتی بۆ یەکێك لە هاوڕێکانی بدات ، بەرگری ئەوەی لێبکات کە ئەو لە لایەنگرانی نازیزم نەبووە وەك ئەوەی نووسەرێکی جولەکە بەوە تاوانباری کردبوو. "ئارۆن" لە کاتێکدا بەرەو گۆڤاری (ئێکسپرێس) دەچوو کە خۆی خاوەنی بوو، بۆئەوەی سەروتاری ئەو ژمارەیان بگەیەنێتێ گیانی لەدەستدا.

بەڵام پێویستە بڵێین "ئارۆن" بەو خێراییە چاوەڕوانی هەرەسی کۆمۆنیزمی نەدەکرد. ئەگەرچی بۆ خۆی یەکێك بوو لە گەورە پسپۆڕانی بواری (فەلسەفەی مێژوو)، سەرەڕای وردبینی و ئەقڵ ڕوونی، بەڵام پێی وابوو کە ململانێکە ماوەیەکی درێژتر دەخایەنێت. بەڵام ئەو شتەی بۆی تۆماردەکرێت و لە ئێستادا نەیارەکانی گەواهی بۆ دەدەن، ئەوەیە کە لە گەرمەی جەنگی ساردو لە ئەوجی باڵادەستی چەپ بەسەر ژیانی رۆشنبیری فەرەنسیدا، لە هەڵوێستی خۆی پاشگەز نەبۆوە.

ئەگەرچی چەپەکان "ئارۆن"یان کەنارگیر کردو بە کۆنەپەرست و راستڕەو و تابوری پێنجەم و خزمەتکاری سەرمایەداری تاوانباریانکرد، بەڵام هەر لەسەر قەناعەتی خۆی مایەوە.

شتێکی هەروا ئاسان نەبوو مرۆڤ لە ساڵانی پەنجاو شەستەکانداو لە وڵاتێکی وەك فەرەنسادا، سەر بە بەرەیەك بێت دژ بە بلۆکی سۆڤیەتی. لەو ئان و ساتەدا ئایدیۆلۆژیای مارکسیزم وەك ڕاستیەکی ڕەهای حاشاهەڵنەگر خۆی سەپاندبوو. "ژان پۆڵ سارتەر" لای خۆیەوە دەیوت: *مارکسیزم ئەو ئاسۆیەیە کە لە رۆژگاری ئەمڕۆماندا ناتوانین لێی تێپەڕێین.* لەو رۆژگارەدا رۆشنبیر، رۆشنبیر نەبوو گەر مارکسی نەبوایە، یاخود بڕوای بە ماتریالیزمی دیالەکتیکی ماتریالیزمی مێژوویی نەبوایە. بە کورتیەکەی لە سایەی جەنگی ساردا تەوژمی ئایدیۆلۆژی ئەو سەردەمەی گرتبۆوە. کارێکی ئاسان نەبوو لە کەش و هەوایەکی وا ترسناکدا رۆشنبیر هێمنی و هاوسەنگی خۆی لەدەست نەدا.

جێی باسە "ریمۆن ئارۆن" لە ریزی چەپڕەوەکانەوە داخڵ بە کەمپی لیبرالی بوو، نەك لە ریزی ڕاستڕەوەکانەوە. بەر لە جەنگی جیهانی دووەم "ئارۆن" کەسێکی سۆسیالیستی و لایەنگری بەرەی میللی بوو بە سەرکردایەتی "لیۆن بلۆم". بەڵام دواتر بڕیاری دا تەواوی ژیانی خۆی بۆ بەرخوردی دوو ئایدیۆلۆژیای تۆتالیتاری تەرخانبکات: ئایدیۆلۆژیای نازیزم و، ئایدیۆلۆژیای کۆمۆنیزم. هاوکات بڕیاریشی دا بەرگری لە بەرەی ئازادی و دیموکراسی بکات. لەوکاتەوە ناوی "ئارۆن" بەناوی رۆژنامەی "لیفیگارۆ"وە پەیوەست بوو، ئەو رۆژنامەیەی بۆ ماوەی سی دانە ساڵ تیایدا نووسی، وەك دەزانرێت "لیفیگارۆ" گرنگترین رۆژنامەی فەرەنسی بوو، بەرلەوەی "لۆمۆند" بێت و ببێتە رکابەری، یان دواجار لە ڕووی گرنگیەوە جێگای بگرێتەوە.

بۆئەوەی زانیاریمان دەربارەی بیروبۆچوونی "ریمۆن ئارۆن" هەبێت و ئاگامان لەو کێشەو ململانێیانە بێت، کە ڕووبەڕووی بۆتەوە، لێرەدا باس لە پەیوەندی ئەو دەکەین لەگەڵ ئەو کەسایەتیە مەزنانەی شوێن دەستیان لەسەر سەدەی بیستەم دیارە، یەکەمین کەسایەتیش "شارل دیگۆل"ە.

## ریمۆن ئارۆن و ژەنەراڵ شارل دیگۆل

"ریمۆن ئارۆن" لە ریزی پێشەوەی ئەوانەدا بوو کە بە دەنگ بانگەوازە بەناوبانگەکەی ژەنەراڵ "دیگۆل"ەوە چوون، بۆ بەرەنگاربوونەوەی داگیرکاری ئەڵمانەکان. لە لەندەن پەیوەندی بە "دیگۆل"ەوە کردو یەکێك بوو لە سەرپەرشتیارانی گۆڤاری (فەرەنسای ئازاد).

بەڵام دوودڵ بوو لە حیزبی دیگۆلی و گوێڕایەڵی و شوێنکەوتنی کوێرانەی هەر کەسێك، تەنانەت گەر ئەو کەسەش ژەنەراڵ "دیگۆل"یش بێت. هەربۆیە پەیوەندی بە "دیگۆل"ەوە پەیوەندیەکی ناسەقامگیر بوو بە درێژایی چارەکە سەدەیەك. پاش گەڕانەوەی سەرکەوتووانەی "دیگۆل" لە ساڵی 1945 وەك رزگارکەری فەرەنساو پێکهێنانی حکومەتە تازەکەی، هەندێك پۆستی شێوە رەسمی بە "ریمۆن ئارۆن" سپارد، بەڵام هەرزوو وازی لەو کارانەی هێنا، بۆئەوەی خۆی تەرخانکات بۆ کارەکەی، وەك رۆژنامەنووسێك لە رۆژنامەی "لیفیگارۆ"دا. پاشان ژەنەراڵ "دیگۆل" دوای ساڵێك یان دووساڵ، ناچار بوو لەژێر گوشاری پارتەکان و رژێمی کۆماری چوارەمدا واز لە کورسی دەسەڵات بێنێت.

ژەنەراڵ "دیگۆڵ" وەك پیشەی هەمیشەیی لە گوندەکەی خۆیدا (کۆلۆمبی لودوزیکلین) خۆی کەنارگیر کردو، چاوەڕێی هەلێکی دەکرد بۆئەوەی جارێکی تر فەرەنسا ئازاد بکات.

ساڵی 1947 پارتی "دیگۆلی" دامەزراند و "ریمۆن ئارۆن"یش لەژێر کاریگەری هاوڕێ دیگولیە بەناوبانگەکەیدا "ئەندرێ مارلۆ"، پەیوەندی بە ریزەکانی ئەو حیزبەوە کرد، بەڵام سەرەڕای ئەوەی "ئارۆن" وەك "ئەندرێ مالرۆ"ی وەزیری رۆشنبیری نەبوە دیگۆلیەکی دڵسۆز، "ئارۆن" دەیووت: *نە پێشترو نە لە داهاتووشدا نابمە دیگۆلیەکی ئەرسۆدەکسی.* لە بەردەم ژەنەراڵ "دیگۆل"دا ئارۆن هەستی بە ترس و سەرسامیەکی بێئەندازە دەکرد، بەڵام کاتێك "دیگۆل" ئامادە نەبوایە ئەوا رەخنەی ئاراستەی هەندێ هەڵوێستی سیاسی ئەو دەکرد. بە کورتیەکەی با بڵێین "ئارۆن" دیگۆلیەکی رەخنەگرو، ئازادبوو لە هەڵوێستەکانیدا.

"ئارۆن" دەیبینی جیهان بەسەر دوو بلۆکدا دابەش بوە، بلۆکی خۆرهەڵات و بلۆکی خۆرئاوا. لەو باوەڕەدا بوو کە تەنها حیزبی دیگۆلی دەتوانێت رووبەڕووی کۆمۆنیستەکان بێتەوەو، کۆماری چوارەم بەو پێکهاتە فشەڵ و لاوازەیەوە توانای ئەوەی نیە. لەبەر ئەم هۆیە چووە ناو ریزەکانی حیزبەکەی "دیگۆل"ەوە، پاش بیست ساڵ مانەوەی لەناو پارتی سوسیالیستدا، ئەم هەڵوێستەی جێی سەرسوڕمانی زۆر لە هاوڕێکانی بوو، گۆڕینی پێگەی ئایدیۆلۆژییان بە هەنگاوێکی نادروست بۆ "ئارۆن" دایە قەڵەم.

رۆژێك "ریمۆن ئارۆن" پشووی هاوینەی لەناوچەیەکی نزیك بە گوندەکەی "دیگۆل" دەبردە سەر. بڕیاری دا سەردانی بکات و سڵاوی لێبکات، بەڵام کە چوو بینیماڵەکە داخراوەو ژەنەراڵیش لەوێ نیە. کاتێك "دیگۆل" بەمەی زانی "ئارۆن"ی داوەتکرد بۆئەوەی کۆتایی هەفتەی لەگەڵدا بەسەر بەرێ و قسەوباس بگۆڕنەوە. پاشئەوەی دووبەدوو مانەوە، "دیگۆل" چەند بەشێك لە بیرەوەریەکانی خۆی بۆ خوێندەوە، بەتایبەت ئەو پەرەگرافەی باس لە کەسێتی "مارشاڵ بیتان" دەکات. ئەمە دوایەمین

جاربوو كە بەو شێوە گەرم و گوڕو خێزانییە "دیگۆل و ئارۆن" پێکەوە دابنیشن.

دوای ئەوە پەیوەندییەکانیان هاتە سەر نامەگۆڕینەوەو، پێشکەشکردنی کتێب بە یەکتری. هەموو ئەمانەش وەك باسمانکرد، نەبوونە رێگر لەوەی پەیوەندی بە ریزەکانی حیزبی دیگولییەوە بکات و لەناو ئەو حیزبەدا خەبات بکات.

راستە نەگەیشتە ئەوەی بەیاننامەو دروشمەکانی حیزب بەسەر دیوارەکاندا هەڵبواسێت، بەڵام گەیشتە ناو ئەنجومەنی باڵای حیزب. حیزب بە شێوەیەکی هەرەمی دامەزرابوو، لە سەرەوە ژەنەراڵ "دیگۆل" و لای راستەوە "ئەندرێ مالرۆ" و لەلای چەپیشەوە "ژاك سۆستێل" بوو. لەدوای ئەمانەوە لیژنەی لێکۆڵینەوە دەهات، لیژنەی لێکۆڵینەوە لەو گەورە رۆشنبیرانە پێکهاتبوو کە پشتیوانییان لە ئاراستەی حیزب دەکرد. ئەڵبەتە "ئارۆن" یەکێك بوو لە ئەندامەکانی، هەموو هەفتەیەك چاوی بە "ئەندرێ مالرۆ جۆرج بۆمبیرۆو میشیل دوبرێ" و گەورە کەسایەتیەکانی حیزبی دیگۆلی دەکەوت.

هارکات ئامادەی کۆڕو کۆبوونەوە جەماوەریەکانی حیزب دەبوو، لەوێدا قسەی دەکردو ئیدانەی کۆمۆنیستەکانی دەکرد. زۆرجار شەڕ لە نێوان (دوو گەورە حیزبی سیاسی فەرەنسی لەوکاتەدا) کە کۆمۆنیست و دیگۆلۆیەکان بوون دروست دەبوو.

لە کۆتایی پەنجاکاندا "ئارۆن" لەناو ئەو کەسانەدا بوو کە داوای گەڕانەوەی ژەنەراڵ "دیگۆل"یان دەکرد بۆ سەر کورسی دەسەڵات، بە مەبەستی قوتارکردنی فەرەنسا لە کێشەی جەزائیر؛ "ئارۆن" پێی وابوو کۆماری چوارەم ناتوانێت ئەم کێشە گەورەیە چارەسەر بکات، کێشەیەك کە هەڕەشە لە چارەنووسی خودی فەرەنسا دەکات. تەنها ژەنەراڵ "دیگۆل" بە سەنگ و قورسایی کەسێتی خۆیەوە دەتوانێت چارەسەرێکی لەبار بەسەر فەرەنسیەکاندا بسەپێنێ. "ئارۆن" لەم بۆچوونەیدا تەنها نەبوو، ساڵی 1958 "دیگۆل" بە فیعلی گەڕایەوە سەر کورسی دەسەڵات، یەکەمین کێشەیەکیش کە هەوڵی چارەسەرکردنی دا، کێشەی جەزائیر بوو کە چوار ساڵی خایاند.

"ئارۆن" هەر کتێبێکی تازەی چاپ بکردایە، دانەیەکی بۆ ژەنەراڵ "دیگۆل" دەنارد، ئەویش بە نامەیەك وەڵامی دەدایەوە. ئەمەش لەکاتی بڵاوکردنەوەی کتێبی (شەڕە یەك بەدوا یەکەکان دا) رووی دا.

"دیگۆل" لە نامەیەکیدا کە لە ئەرشیفی تایبەتی "ریمۆن ئارۆن"دا پارێزراوە دەڵێت: *سوپاس بۆ کتێبەکەی لە بەرگەوە بۆ بەرگ، پڕە لە بیروبۆچوون و مشتومڕ بەڵگەی ئەقڵانی. زۆر پێی سەرسام بووم.*

لە وەڵامدانەوەی بۆ کتێبی (ئەفیونی رۆشنبیرن)دا "دیگۆل" دەڵێت: *بە بایەخێکی زۆرەوە دوا کتێبت (ئەفیونی رۆشنبیران)م خوێندەوە. پێویست بەوە ناکات سەرسامی زۆرم بە بەهرەو توانات لە شیکردنەوەو لێکدانەوەی شتنەکاندا بۆ باس بکەم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت راستگۆ بم لەگەڵتا، ئەگەرچی توانای شیکردنەوەو لێکدانەوەت گەورەیە، بەڵام ناتوانێت بگەیتە دەرەنجامی ئیجابی، یاخود چارەسەرێکی دیاریکراو. دەترسم تۆش وەك مونتێنیی فەیلەسوف راڕاو گومانکار بیت.*

هەرچۆنێك بێت ئەوا پەیوەندی دامەزرێنەری کۆماری پێنجەم و دامەزرێنەری فەرەنسای نوێ، بە یەکێك لە گەورە تیۆرسینە ئایدیۆلۆژیەکانی ئەو کۆمارەوە پڕ لە گۆڕان و ناکۆکی بوو. بۆیە جێی سەرسوڕمان نیە کە رۆژێك ژەنەراڵ "دیگۆل" بە "ئەندرێ مالرۆ"ی وتبێ: *(ئەم پیاوە -واتە ئارۆن- رۆژێك لە رۆژان دیگولیکی راستەقینە نەبووە..).*

بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ڕێی بدە با زۆر ئازادانە کاربکات، چونکە کەلکی هەیە بۆمان..

## پەیوەندیی نێوان "ریمۆن ئارۆن و ژان پۆل سارتەر"

گەر پەیوەندیەك هەبێت نەخشی لەسەر سەدەی بیستەم دیاربێت و تەواوی کایەی ڕۆشنبیری فەرەنسی بەخۆیەوە سەرقاڵ کردبێت، ئەوا پەیوەدی "ریمۆن ئارۆن"ە بە "ژان پۆل سارتەر"ەوە.

هەریەك لە "ئارۆن و سارتەر" لە سەرەتای سەدەی بیست و لەهەمان ساڵدا واتە ساڵی 1905 هاتوونەتە دنیاوەو، هەردووکیان تا سەرەتای ساڵانی هەشتا ژیاون. پێکەوە لە هەمان ئەو پەیمانگایەدا خوێندوویانە کە گەورە کەسایەتیە ئەدەبی و فەلسەفی و بگرە تەنانەت سیاسیەکانی فەرەنسای لێوە دەرچوون. ئەو شوێنەش پەیمانگای باڵای مامۆستایانە. لە هەمان پۆلدا "سیمۆن دۆبۆڤوار و کلود لیڤی شتراوس و پۆل نیزان و.. هتد"ی، لەگەڵدا بوە. تا کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانی هاوڕێ بوون، بەلام لەو مێژوە بەدواوە کێشە ئایدیۆلۆژیەکان و دابەشبوونی جیهان بەسەر دوو بەرەداو سەرهەڵدانی جەنگی سارد، لێکی جیاکردنەوە.

دوای ئەوەو بە درێژایی سی ساڵ بوونە دوو دوژمنی سەرسەختی یەکتر. لە دوا ساڵەکانی تەمەنیاندا نەبێت (ساڵی 1979)، چاویان بەیەك نەکەوت. لەوکاتەدا هەردووکیان بە ساڵاچوو بوون و بڵێسەی خەباتی ئایدۆلۆژی خامۆش ببوو، هەروەها هەژموونی کۆمۆنیزم و مارکسیزم لەسەر گۆڕەپانی فەرەنسی پاشەکشەی کردبوو.

بەپێی قسەی "سیمۆن دۆبۆڤوار"، "سارتەر" بۆ یەکەمجار لە ڕێی "ریمۆن ئارۆن"ەوە فەلسەفەی وجودی ناسیوە. "ئارۆن" لە پێشەوەی ئەوانەدا بوو کە لە زانکۆکانی ئەڵمانیادا خوێندبووی، ئەو بەر لە جەنگ و لەساڵی 1930-1931 ڕووی لەو وڵاتە کردبوو. هەر لەوێشدا بەدوا تیۆریای فەلسەفە ئاشنابوو: واتە تیۆریای فینۆمینۆلۆژیا. ئەوکات ناوی "هۆسێرل و هایدگەر" لە بەناوبانگترین ناوە فەلسەفیەکان بوون لە ئەڵمانیادا.



سارتەر

کاتێك لە پشووی خوێندندا ئارۆن گەڕایەوە فەرەنسا، چاوی بە هاوڕێ بچکۆلەکەی (سارتەر) کەوت و باسی ئەو شتانەی بۆ کرد کە لە ئەڵمانیا بینیبوونی و بیستبوونی، "دۆبۆڤوار" مەسەلەکە وەك خۆی دەگێڕێتەوەو دەڵێت: *من و سارتەر و ئارۆن لە یەکێك لە گازینۆکانی مونبارناس پێکەوە دانیشتین. لەو دانیشتنەدا سارتەر داوای شەربەتی میوەی کرد. ڕەنگی شوشەکە ئالتونیەکی ڕەنگاوڕەنگ بوو. ئارۆن پێی وت هاوڕێ ڕەنگی ئەو شەربەتە دەبینی؟ گەر فەیلەسوفێکی فینۆمینۆلۆژی بویتایە، ئەوا بە شێوەیەکی فەلسەفی قسەت لە بارەیەوە دەکرد! چاوەکانی سارتەر لە خۆشیانا گەشانەوە. ئەو چاوەڕێی ئەوە بوو لە فەلسەفە: چاوەڕێی ئەوەبوو وەك خۆیان چۆن هەن ئاوا قسە لە شتەکان بکات،*

*یان بەو شێوەیە لێیان بدوێت کە هەن و لەبەرچاون، ماوەیەکی زۆر بوو چاوەڕێی ئەوەی دەکرد. دەیویست فەلسەفە لە قولە بەرزو بڵندەکانەوە دابگرێتە ناو واقیعی ژیانی ڕۆژانە. ئەمەش سەرەتای فەلسەفەی بوونخوازی بوو.*

بەڵام هاوڕێیەتی نێوان ئەم دوو دۆستە ئازیزە، وەك باسمانکرد زۆری نەخایاند، "سارتەر" لە وەڵامی پەیوەندیکردنی "ئارۆن" بە حیزبی دیگۆلیەوە، پارتێکی تایبەت بە خۆی دامەزراند، بەناوی (ڕێخراوی دیموکراسی شۆڕشگێڕ)ەوە، بەڵام زۆر بەردەوام نەبوو، چونکە لایەنگرانی هەریەك بەلایەکدا چوون. پاش ئەوە ڕووداوێك هاتە پێش، بوە مایەی تێکدانی پەیوەندی نێوان ئەو دوو هاوڕێ خۆشەویستە.

کاتێك "ئارۆن" بڕیاری دا بەشێوەیەکی بەردەوام لە ڕۆژنامەی (لیڤیگارۆ)دا بنووسێت "سارتەر" ئەوەی وا لێکدایەوە کە پەیوەندیکردنە بە بەرەی دوژمنەوە: واتە بە بەرەی "دیگۆل"و ڕاستڕەو و بۆرژوازیەت و .. هتد.

"سارتەر" لە بەرنامەیەکی ڕادیۆییدا قسەیکردو وتی: *(دیگۆل لە ڕووی جەستەیی و سیاسیەوە بە متلەر دەچێت!)*. بەم پێچواندنە دژوەیش، قیامەتێك لە فەرەنسادا دروستبوو. "ئارۆن" زۆری پێ تێکچوو، دەستیکرد بە هێرشکردنە سەر "سارتەر"و حیزبەکەی، "سارتەر"یش بە شاڵاوێکی توند وەڵامی دایەوە. "موریس میرلۆپۆنتی" کە هاوڕێی هەردووکیان بوو، هەوڵی دا نێوانیان باش بکات و ئاشتیان بکاتەوە، بەڵام هەوڵەکەی بێسوود بوو.

"میرلۆپۆنتی" بە "سارتەر"ی وت: *"پێت وا نیە لەم هێرشەتدا بۆ سەر ئارۆن، زیاد لەپێویست پێت لێهەڵبڕیوە، ئەمەش دەبێتە مایەی ئەوەی بۆ یەکجاری پەیوەندی نێوانتان بپچڕێت؟* "سارتەر" لە وەڵامدا وتی: *لە نێوانماندا شتێك نەماوە تا دەستی پێوە بگرین و بە ئەنگیەوە بێین! هەموو شتێك تەواو* بوو. دوای ئەوەی شەڕی ئایدیۆلۆژی لە نێوانیاندا هەڵایساو، بە درێژای ساڵانی جەنگی سارد: واتە لە کۆتایی چلەکانەوە تا کۆتایی حەفتاکان (بۆ ماوەی سی ساڵ) بەردەوام بوو. هەر شتێ مەسی کۆمۆنیزم و یەکیەتی سۆڤیەتی بکردایە "سارتەر"ی دەوروژاندو، ڕازی نەدەبوو لەهەر لایەنێکەوە بێت هێرش بکرێتە سەریان. هەر ئەمەش بووە مایەی ئەوەی پەیوەندی لەگەڵ هاوڕێیەکی ئازیزی تری دابڕێت، ئەویش "ئەلبێر کامۆ"بوو، "سارتەر" ئەویشی فڕێدایە تاریکستانی کۆنەپەرستی و بەرەی دوژمنەوە. وەك دەزانرێت "کامۆ" لە ساڵی 1948 پەیوەندی خۆی بە حیزبی شیوعیەوە پچڕان.

ئەمەش پەیوەندی بە "سارتەر"ەوەو ئاڵۆز کرد، بەڵام پەیوەندیان نەپچڕاند تا "کامۆ" کتێبە بەناوبانگەکەی (مرۆڤی یاخی) بڵاوکردەوە.

"کامۆ" لەو کتێبەیدا، ڕەخنە ئاراستەی ئەو میسالیە شۆڕشگێڕانەیە دەکات، کە دواجار دەبێتە مایەی دیکتاتۆریەت و تیرۆری پۆلیسی، "سارتەر" ئەم کتێبەی بە هێرشێکی شەخسی بۆ سەر خۆی دایە قەڵەم و پێی وابوو ئەوە کە مەبەستە لە ڕێی ئەم کتێبەوە لێی بدرێت. بۆیە فەرمانی دا بە یەکێك لە نووسەرانی گۆڤارەکەی (کاتە نوێکان) بۆئەوەی خوێندنەوەیەکی ڕەخنەیی ئەو کتێبە بکات، بە مەبەستی بەرپەرچدانەوەو پوچەڵکردنەوەی بیروبۆچوونەکانی ناوی. ئەم کارەش ئەنجام درا. لە پای ئەوەدا "کامۆ" بڕیاریدا هەموو پەیوەندیەکی خۆی بە "سارتەر"ەوە بپچڕێت. "سارتەر" بە نامەیەکی خەمناك وەڵامی دایەوە، تیایدا دان بە کۆتایی پەیوەندی نیوانیان دەنێت و دەڵێت: *تەنانەت هاوڕێیەتیش بۆتە دیکتاتۆریەت. یان دەبێت لە هەموو شتێکدا برادەرم بیت، یان مەبە..*

دوای ئەوە، سەرەی پەیوەندی برین لەگەڵ هاوڕێیەکی تری یەکێك لە کۆمەڵەکانی (کاتە نوێکان) هات: "موریس میرلۆپۆنتی". "میرلۆپۆنتی" دوای "سارتەر" بە دوەم فەیلەسوفی فەرەنسا دادەنرا، بگرە هەندێك بە یەکەم فەیلەسوفیان دەدایە قەڵەم.

"میرلۆپۆنتی" وازی لە پشتیوانی کردنی بلۆکی سۆڤیەتی هێنا، دوای ئەوەی خەسڵەتی دسبیۆتیزمیانەی ستالینیەتی بۆ ئاشکرابوو. لەم بارەیەوە کتێبێکی بەناوی (سەرکێشیەکانی دیالەکتیك)ەوە نووسی، ئەمەش سەرەتای کۆتایی بوو لە نێوان ئەوو (بلۆکی پیشکەوتن)دا، لەسەرروو هەموویشیانەوە "سارتەر" و کۆمۆنیزم. کار گەیشتە ئەوەی "سارتەر" بڵێت: *هەرچی دژی کۆمۆنیزمە سەگەر، هەرگیز هەڵویستی خۆشم ناگۆڕم!!*.

ئەوەی راستی بێت دوای ماوەیەکی زۆر نەبێت (واتە تا ساڵی 1968)، "سارتەر" هەڵویستی خۆی نەگۆڕی، بەڵام بۆئەوە هەڵوێستی گۆڕی تا خۆی فرێبداتە ئامێزی چەپێکی هەرزەکار یاخود چەپێکی توندڕەوەوە، چەپێك کە ئەمجارە سەرچاوەی بیروبۆچوونەکانی "ماوتسی تۆنگ" بوو، نەك بیروبۆچوونی "لینین" یاخود "ستالین".

"سارتەر" توانی لە رێی لێهاتوویی لە بواری ئەدەب و درەوشانەوەی ئەستێرەی بەختی لە بواری فیکردا، کاریگەری لەسەر دوو نەوە لە گەنجانی فەرنسا هەبێت؛ نەوەی رزگاری کە دوای جەنگی دووەمی جیهانی هات و نەوەی شۆڕشی ئاياری 1968 کە چەپێکی منداڵ و هەرزە بوو.

لە جاری یەکەمیاندا "سارتەر" رەوایەتیەتی فیکری کردە بەر کۆمۆنیزم و دووەم جاریش ئەو ڕەوایەتیە فکرییەی کردە بەر چەپی توندڕەو.

هەندێك پێیان وایە توندڕەوی "سارتەر" لەسەر ئاستی زمان، فەرەنسای لە تیرۆرو توندڕەوییەکی فیعلی پاراست، وەك ئەوەی لە ئەڵمانیادا روویدا.

ئەمە مانای وایە کە "سارتەر" بێئەوەی پێی بزانێت، رۆڵێکی ئیجابی لە بەرژەوەندی کۆمەڵگای فەرەنسی گێڕاوە. هەرچۆنێك بێت خاوەنی (بوون و نەبوون) و (رەخنەی ئەقڵی دیالەکتیکی) و (هێڵنجدان) و.. هتد، رۆڵێکی گەورەی لەسەر گۆڕەپانی رۆشنبیری فەرەنسی و نێودەوڵەتیدا بینیوە، سەرباری خلیسکان و نووچدانە ئایدیۆلۆژیەکانی.


سارتر

کەس ناتوانێ نکوڵی لە خۆشەویستی و هەوڵ و قوربانی ئەو بکات، لە پێناو میللەتانی کۆلۆنیالی کراو، یان چەوساوەدا. لە قۆناغێك لە قۆناغەکاندا ئەو نوێنەری ویژدانی ئازادی فەرەنسابوو، وەکی هەریەك لە "ڤولتێرو ئەمیل زۆلا" لە سەردەمانی پێشوودا.

لە سالانی حەفتادا و لە گۆڕەپانەکانی پاریسدا دروشمێك باو بوو دەیوت: (لەگەڵ سارتەردا لەسەر هەڵە بیت، چاکترە لەوەی لەسەر ڕاستی بیت لەگەڵ ئارۆندا!)

شایەنی باسە "ریمۆن ئارۆن" بەخۆی، دان بە پێشدەستی و شۆرەت و نێوبانگی "سارتەر"دا دادەنێت. سەرەرای هەموو ئەو شەڕو ململانێ

# ڕەخنەو تۆژینەوەی ئەدەبی

- پۆڵ ڕیکۆر و هونەری خوێندنەوە — ئەحمەد ئەبوزەید
- ڕۆشنبیران لە غوربەتدا — ڤرانز نویمان

# ئیرادەو راڤە

## پۆل ریکۆر و هونەری خوێندنەوە

■ ئەحمەد ئەبوزێد
● و. لە عەرەبییەوە: شاهۆ سەعید

پۆل ریکۆر یەکێکە لەو فەیلەسوفانەی کە جیهان لەوێنەی دەقێکی گەورەو بەرفراواندا دەبینێ، دەق-یش لەوێنەی جیهانێکی چڕو بچوککراوەدا دەبینێ.. واتە بە بڕوای ئەو سنورەکانی نێوان دەقی نوسراو و جیهانی بینراو لە بنەڕەتدا ئەو سنورانەن کە بۆ بەرتەسککردنەوەی ئاسۆکانی لێکدانەوەو خوێندنەوەی ئێمە بەرامبەر دەق/ جیهان دانراون. ئەو سنوربەندییە تەنها گرفتی پەرتبوونی پەیوەندیی نێوان دەقناسی و جیهاناسی لێنەکەوتوتەوە، بەڵکو کێشەیەکی میتۆدیشی لێکەوتۆتەوە، چونکە زیادەڕۆیی لە پابەندبوون بە میتۆدێکی دیاریکراوەوە میتۆد دەکاتە ستراتیج لەبری ئەوەی بیکاتە ئامرازێك بۆ ناسینی بەرامبەر. لێرەوە هێرمینوتیکا ئەو میتۆدە یان راستتر ئەو هەمە میتۆدەیە کە کردەی ناسین دەکاتە ئامانجی سەرەکی نەك شێوازی گەیشتن بەو کردەی ناسینە. واتە کەسی بیریار یان رەخنەگر یان خوێنەر بۆی هەیە لەیەك کاتدا چەندین میتۆدو فەلسەفەی جیاواز لەیەك موتوربە بکا لەپێناو دەوڵەمەندکردنی پرۆسەی خوێندنەوەو نزیکبوونەوە لە رەگەزە زیندووەکانی ژیان. ریکۆر لە شوێنێکدا بە ئاماژە باس لە کردەی خوێندنەوە دەکا وەك چێژێکی ئاڵتەرناتیف لە بەرامبەر چێژی پراکتیسکردنی ژیاندا. واتە ئەوکاتانەی سنورەکانی پراکتیسکردنی ژیانی راستەقینە بەرتەسك دەبنەوە دەبێ پەنابەرین بۆ خوێندنەوەی جیهان و بەدەقکردنی ژیان.

لە بەرامبەر فەیلەسوفە جەماوەرییەکانی دیکەی فەرەنسا وەك ژان پۆل سارتەرو میشێل فۆکۆو ژاك دریدا.. پۆل ریکۆر ئەو فەیلەسوفەیە کە تا ئێستا بایەخی وەك پێویست پێنەدراوە، چونکە ئەو هێندەی موژدەی مەعریفەیەکی بەچێژمان پێدەدا، هێندە موژدەی ژیانێکی بەچێژمان نادالێ.

وەرگێڕی کوردی

یەکێك لەو دەربڕینە جوانانەی کە زەینم بەسەریەتی، رستەیەکی جۆن وایتمان ی رەخنەگری ئینگلیزییە دەربارەی ژیانی فیکریی لە فەرەنسا. وایتمان لەویدا دەڵێ سەرەڕای ئەو گۆڕانکارییە ریشەیی و خێرایانەی کە فەرەنسا لە چەند ساڵی رابردوودا پیای تێپەڕی، تا ئێستا ئەو وڵاتە توانایەکی باشی لە بەرهەمهێنانی کەسایەتی کاریزمای هەیە کە دەکرێ ناویان بنێین "پاڵەوانانی فیکر"، هەروەکو چۆن بەهەمان ئەندازەو بەهەمان مانا روسیا توانای بەرهەمهێنانی "پاڵەوانانی شەترەنج"ی هەیە. جۆن وایتمان تێبینی ئەوەش دەکا کە فرێزە بەناوبانگەکەی دیکارت "من بیر دەکەمەوە کەواتە من هەم" تا ئێستا یەکێکە لە نمونەکانی ئەقڵی فەرەنسی و بنەمایەکی گشتی و سەرەکیەتی. پێش جەنگی جیهانی دووەم سێکوچکەیەکی گرنگی مامۆستایانی فیکر لەئارادا بوون: ئەندرێ جید، پۆل ڤالێری و، ئەلان. دوای جەنگیش دوانەی دژبەیەك: جان پۆل سارتەرو ئەلبێر کامۆ دەرکەوتن. ئەگەر بەهەمان ئاراستەی وایتمان بەردەوام بین، دەکرێ بڵێین دواتر تێکەڵێك لە نوسەران و زانایان و فەیلەسوفەکان پەیدابوون وەك: لیڤی شتراوس، جاك لاکان، میشێل فۆکۆ، رۆلان بارت و، جاك دیریداو چەند بیریارێکی تر کە پێشترو هەندێکیان تا ئێستاش هەڵگری (میتۆدی) بونیاتگەری و پاش بونیاتگەرین. پاشان گروپێکی تر لە پاڵەوانانی فیکر چوونە پاڵیان کە گرنگییەکی زۆر دەدەن بە زمان و ستارکتوری زمانەوانی و بایەخێکی تایبەتیش دەدەن بە راڤەکردنی دەق و لێکدانەوەی (لە چوارچێوەی) ئەوەی کە پێی دەوترێ هێرمنیوتیکا- راڤەگەری. هێرمنیوتیکا بزاوتێکی فیکرییەو (لە بنەڕەتدا) بەندە بە فەلسەفەی ئەڵمانییەوە، هەرچەندە بنەماکانی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمانێکی پێشتر. هەرچی ئەم بزاوتە فیکرییەیە لە فەرەنسا چەند بیریارێکی وەك پۆل ریکۆر لەخۆ دەگرێ کە مۆرکێکی ئەکادیمی بەسەریانەوە زاڵە، جیاوازە لە مۆرکی ژیانی بیریارەکانی پێشوو کە سەرقاڵی کێشەکانی ئینسان و کۆمەڵگا بوون و بەشدارییان لە رووداوە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی کۆمەڵگادا دەکرد.

## هرمنیۆتیکا

هرمنیوتیکا بەو ئاراستە جیاوازانە دەوترێ کە چەند فەیلەسوف و بیریارێك بەهۆیانەوە پێیەنی، (لە رێگایەوە) بایەخێکی تایبەت بە کێشەکانی تێگەیشتن و راڤەکردن و لێکدانەوە دەدەن. واتە وشەی هرمنیوتیکا بە تیۆری لێکدانەوەو میتۆدەکانی دەوترێ. ئەو وشە یۆنانییەی کە وشەی هرمنیوتیکای لێوەرگیراوە لەیەك کاتدا ئاماژە بۆ پرۆسەی ئاخاوتن و پرۆسەی لێکدانەوەش دەکا، بەو مانایەی کە ئاخاوتن شێوازێکە بۆ تەفسیرکردنی بیروبۆچوونی کەسێك بۆ خەڵکانی تر، لەکاتێکدا هرمنیوتیکا لە بەکارهێنانە فەلسەفی و ئەکادیمیەکەیدا واتە لێکدانەوەی دەقەکان.

سەرەتای هرمنیوتیکا دەگەڕێتەوە بۆ هەوڵی لێکدانەوەی کارەکانی هۆمیرۆس و شاعیرە گریکەکان، هەربۆیە پەیوەندیی لەنێوان لێکدانەوە لەلایەك و فیلولۆجیا (زمانناسی) و رەخنەی دەق لەلایەکی ترەوە هەیە. دواتر ئەو هەوڵانە گوازرانەوە بۆ لێکدانەوەی دەقە پیرۆزەکان، واتە بزاوتەکە لەسەر دەستی زانا کلاسیکی و تیولۆجییەکان سەری هەڵدا کە لە هەوڵی داڕشتنی چەند یاسایەکدا بوون بۆ لێکدانەوەی دروستی دەقە کلاسیکی و ئاینیە بنەڕەتیەکان. بەڵام هێندەی نەبرد ئەو هەوڵانە لەوە فراوانتر بوون و دەقە ئەدەبیەکانیشیان گرتەوە، بەڵکو ئەو بوارەشی تێپەڕاندو بوارەکانی سایکۆلۆجیا، سۆسیۆلۆجیا، ئەنترۆپۆلۆجیا، مێژوو،

لەگەڵ تەواوی زانستە مرۆییەکانی لەخۆگرت بەوپێیەی ژیانی مرۆڤ پرۆسەیەکی مانا بە شتەکان دەبەخشێ و پێویستە بە مەبەستی تێگەیشتن و راڤەکردن و لێکدانەوە بخوێنرێتەوە.

بە دەربڕینێکی ئاسانترو روونتر دەکرێ پێناسەی هرمنیوتیکا بکرێ بەوەی کە "هونەری خوێندنەوە"یە، واتە هونەری هەڵوەشاندنەوەی دەقەکان و لێکدانەوەو دۆزینەوەی ماناکانیان. بەپیارە هرمنیوتیکیە تازەکان- لە ناویشیاندا فەیلەسوفی سۆسیۆلۆجیای ئاینیی پۆل ریکۆر- ئەرکێکی تازەیان بۆ هرمنیوتیکا زیادکردووە، بەوەی کە بیرۆکەی دەقیان درێژکردۆتەوە بۆ هەموو بوارەکانی بوونی مرۆیی، بەوپێیەی خودی ژیانی مرۆیی جۆرێکە لە دەق -یان راستتر شتێکە لە شێوەی دەق- کە دەکرێ بخوێنرێتەوە، هەروەها بەوپێیەی کە ژیان بەرجەستەکەری مانایەکە دەکرێ لە رووی مەیدەنییەوە ئاشکرا بکرێ و روونبکرێتەوە. ئەمەش بە جۆرێك رووەدا هەروەك چۆن خەونەکان لەرێگای دەروونشیکارییەوە دەخوێنرێنەوە.

میتۆدی لێکدانەوە لە بنەڕەتدا لەسەر گریمانەیەك دادەمەزرێ کە (دەڵێن) ئاخاوتن دوو مانای هەیە یەکێکیان مانایەکی دیارو ئەوی تریان مانایەکی شاراوەیە، یان مانایەکی پەنهانو ناوەکییە. بەوپێیە زمانیش دوو ئەرکی هەیە یەکێکیان ئەرکی دەربڕینە، ئەوی تریان ئەرکێکی رەمزییە، کە ناچارمان دەکات بەدوای ئەو شتەدا بگەڕێین ئاماژەی بۆ دەکرێ. ئەم جیاکارییە دوو ئاراستەی سەرەکی لێکدانەوەی لێکەوتەوە: ئاراستەیەك بەرەو گەڕانەوەی ماناو سەرلەنوێ بنیاتنانەوەی، ئەمەش ئەو ئاراستەیەیە کە پیاوانی ئاینیی پێڕەوی لێدەکەن و گرنگی بە گەڕاندنەوەی مانای رەسەنی هێماکانی "سەردەمی نوێ- کتێبی پیرۆز" دەدەن. ئاراستەی دووەم لەسەر بنەمای گومان دامەزراوە کە چەند بیریارێکی وەك نیچە، مارکس، فرۆیدو چەندانێکی تر ئەستۆ دەگرن ئەوانەی بایەخ بە شیکردنەوەو پارچەپارچەکردنی مانا دەدەن -تەنانەت کۆکردنەوەی بەشەکانی مانا وەك ئەوەی پەیڕەوانی ئاراستەی یەکەم ئەنجامی دەدەن- (چونکە ئەوان) مانا دەگەڕێننەوە بۆ چەند فاکتەرو ئەنگیزەیەکی پەنهانو شاراوە.

## رەسەنایەتیی ریکۆر

کارەکانی پۆل ریکۆر-ی فەیلەسوف دەریدەخات کە لەژێر کاریگەری بوونگەری و فینۆمینۆلۆجیاو بوتیادگەریدایە، لەکاتێکدا ناوی ئەو بەشێوەیەکی پتەو بەندە بە ئاراستەی راڤەگەری یان هرمنیوتیکاوە. ئەو پێشتر گرنگییەکی زۆری دەدا بە لێکۆڵینەوەو پێشکەشکردنی فیکری بەشێکی زۆری فەیلەسوفەکانی پێش خۆی، تا ئەو ئەندازەیەی زۆرجار ساڵێکی تەواوی وانە وتنەوەی زانکۆیی تەرخانکردووە بۆ پێشکەشکردنی فیکری تاقە فەیلەسوفێك لەو فەیلەسوفانەی لەژێر کاریگەرییاندا بوو وەك هایدگەر، هۆسرڵ و یاسپرز. لەگەڵ ئەوەشدا نوسینەکانی خەسڵەتی رەسەنایەتی و تازەگەرییان پێوە دیارە کە زادەی ئەو هەڵوێستە رەخنەییەیەتی بەرامبەر کاری کەسانی تر. هەروەها ئەو نوسینانە چەند بوارێکی جیاواز دەگرنەخۆ وەك لێکۆڵینەوە فەلسەفی و کۆمەڵایەتی و ئاینی و کولتورییە گشتییەکان، تەنانەت هەندێ لەو وتارانەی لەکاتی سەرۆکایەتیکردنی زانکۆی نانتێردا نوسیبوی باسی لە پارادۆکس (مفارقە)ی هێزە سیاسییەکان و پەیوەندیی نێوان دەوڵەت و هاوڵاتی، ژیان و هونەر، ژیان و مەرگ و خاڵەکانی بەیەکگەیشتنی نێوان ئاین و فەلسەفە کردبوو.

پۆل ریکۆر لە ڤالانس-ی خۆرئاوای فەرەنسا لە 27ی فێبرایەری 1913 لەدایکبووە. هەرچەندە ئێستا

88 ساڵی تێپەڕاندوە بەڵام هەر چالاك و خاوەن بەرهەمە (دەکرێ بوترێ) ئێستاش هەمان هێزو تواناو وردی جارانی پاراستوە. لە دوای تەواوکردنی زانکۆ لە پاریس لە ساڵی (1937)ەوە سەرقاڵی وانەبێژی بووە لە خوێندنگا ئامادەییەکاندا، لە جەنگی جیهانی دووەمدا سەربازی کردووەو، لەلایەن هێزەکانی ئەڵمانیاوە بە دیل گیراوە، لە ساڵی (1940)ەوە تا کۆتایی جەنگ لە زینداندا بوە.

دواتر لە ناوەندی نەتەوەیی بۆ توێژینەوەی زانستی لە پاریس تا ساڵی 1948 دەستبەکاربوە، پاشان لە زانکۆی ستراسبۆرگ تا ساڵی 1957 وەك ئوستادێك وانەی وتۆتەوە.. لە قۆناغێکی تردا چۆتە سۆربۆن و، دواتریش لەسەر داوای خۆی پۆستی عەمیدی زانکۆی دەیەمی پاریسی وەرگرتووە کە بە زانکۆی نانیتر ناسراوەو رۆڵێکی گرنگی لە رووداوەکانی 1968ی خوێندکارەکانی فەرەنسادا بینیوە. هەر ئەو رووداوانە ناچاری کردووە دەست لەو پۆستەی بکێشێتەوە. پاش ماوەیەك سەرلەنوێ و لەهەمان زانکۆدا وەك ئوستادێکی خۆتەرخانکردو دەستی کردۆتەوە بە وانەوتنەوە. لە هەمان کاتیشدا وەك ئوستادێکی وانەبێژ لە زانکۆی شیکاگۆ دامەزراوە.

کاتێ خوێندکاری زانکۆ بوو لەژێر کاریگەری گابرێل مارسیل-ی پێشەنگی رەوتی بوونگەریی مەسیحیدا بوو لە بەرامبەر رەوتی بوونگەریی سارتەدا. دواتر فیکری یاسبرز و فینۆمینۆلۆجیای ئەڵمانی (هوسرڵ و هایدگەر) کاریان لێکرد. ئەم کاریگەریە فیکریانە بە نوسینەکانیەوە دیارن. کارلێکردنی گابرێل مارسیل لەسەر ئەو لەو نوسینانەیدا دەردەکەوێ کە بایەخی بە کێشە ئاینیو تیۆلۆجیەکان داوە. هەروەها کاریگەریی فینۆمینۆلۆجیاو کێشەی لێکدانەوە لەسەر ئەو لەو شوێنانەدا دەردەکەوێ کە دەربارەی هێرمنیۆتیکا نوسیویەتی کە بەهێرمنیۆتیکای فینۆمینۆلۆجی ناسراوە.

پرۆفیسۆر جۆن تومیسۆن کە یەکێکە لەوانەی بایەخ بە فیکری ریکۆر دەدات دەڵێ: پۆل ریکۆر بە درێژی ژیانی فیکریی خۆی بایەخی بە کێشەی خودی مرۆیی کارا یان کەسایەتی مرۆیی کارا داوە، هاندەری بنەڕەتی لە پشتی هەموو کارە فەلسەفیەکانی ئەوەوە بریتیە لە بڕوابوونی وجودیی بەوەی کە بوونی مرۆڤ مانایەکی هەیە، لێرەوە سەرەڕای بوونی شەڕو ئازارو بەکۆیلەکردنی مرۆڤ (یان نەبوونی ئازادی)، ئەوەی لە بووندایەو مانایەکی هەیە زۆر لە سەرو ئەو شتەیە کە مانای نییە. ماناو بوون ئەو دوو لایەنەن کە پرۆژەی فەلسەفیی ریکۆر- یان تێدا چڕدەبێتەوە، واتە فیکری فەلسەفیی ئەو تا ئاستێکی زۆر فیکرێکی وجودییە، چونکە بوونی مرۆیی بابەتی فەلسەفەی ئەوە، هەروەها فیکرێکی فینۆمینۆلۆجی راڤەییە لە رێگای ئەو میتۆدەی پەیڕەوی دەکا لە کردنەوەو لێکدانەوەی نهێنی ئەو نیشانانەی کە بەکاردێن بۆ تەعبیرکردن لە وێناو گۆشەنیگاو ئارەزوی ئێمە بەرامبەر بوونیان.

## *ئیرادە.. گومان و باوەڕ*

کێشەی ئیرادە یەکێکە لە بابەتە جەمسەریەکانی فیکری وجودی و فینۆمینۆلۆجی، ریکۆر هەر لە بەرهەمە سەرەتاییەکانیەوە بایەخێکی گەورەی بەو کێشەیە داوە بەو ئومێدەی کارێکی مەزن لەو بارەیەوە گەڵاڵە بکا کە دواجار کتێبی "فەلسەفەی ئیرادە"ی لێکەوتەوە. سەرەتا بەنیاز بوو ئەو کتێبە بە سێ بەش پێشکەش بکا، بەشی یەکەمی "ئیرادەکردەو بێ ئیرادە" لە ساڵی 1950دا دەرکەوت، بەڵام دەستی لەو پرۆژەیە هەڵگرت و رووی کردە بواری گرنگیدان بە ویژدان و هەست و هەڵبژاردن، هەر لەو بارەیەوە کتێبی "ئەو مرۆڤەی

هەڵەی لێدەوەشێتەوە"ی نووسی کە بریتییە لە لێکۆڵینەوەیەك لە ئەنترۆپۆلۆجیای فەلسەفیدا، دواتر کتێبێکی سەبارەت بە رەمزیەتی شەڕ نوسی کە بە بڕوای هەندێك سەرەتای بایەخدانی ریکۆر بوو بە هێرمنیوتیکا، یان راستتر سەرەتای راستەقینەی گەشتی ئەو بوو بەو رێگەیەدا کە لە کتێبی "لێکدانەوە: لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی فرۆید"دا گەیشتە لوتکە، ئەو کتێبە لە ساڵی 1965دا دەرکەوت و ساڵی 1970 کرا بە ئینگلیزی لەژێر ناونیشانی "فرۆید و فەلسەفە". لەو کتێبەدا بوارە رەخنەیی و نارەخنەییەکانی لێکدانەوەی روونکردۆتەوە لەڕێگای دانانی ئەو دوو لایە لە رووبەڕووبوونەوەیەکی دیالیکتیکیدا کە ناوی دەنێ رووبەڕووبوونەوەی هێرمنیوتیکای باوەڕ و هێرمنیوتیکای گومان. ئەگەر هێرمنیوتیکا سەرەتا هەروەك باسمان کرد بەندبووبێ بە خوێندنەوەی کتێبی پیرۆز (ئینجیل)ەوە، کە ریکۆر بە هێرمنیوتیکای پیرۆز ناوی دەبا، پەیبردن بە مانا و یادهاتنەوەی مانا دەگەڕێنێتەوە بۆ (ئەو پرۆسەیە) بە مەبەستی لێکدانەوەی باوەڕ، کە بە پلەی یەکەم جێگای بایەخی پیاوانی ئاینە.. ئەوا هێرمنیوتیکای گومان بەندە بە کارەکانی توێژینێکی دیاریکراوی ئەو بڕیارانەی کە پێیان وایە دەق تەنها روخسار یان سەرخانێکە کە حەقیقەتی جەوهەریی لەژێرەوەیە، ئەمەش مانای ئەوەیە کە هێرمنیوتیکای گومان بایەخ بە مانای رەسەن و بنەڕەتی دەدا لە رێگەی دەمامك پێفڕێدان و ئاشکراکردنی "هوشیاری ساختە"، ئەوەش لە پرۆسەکانی رەخنەگرتن لە ئایدیۆلۆجیادا بەرجەستە دەبێ، هەروەکو لای مارکس لە ئابووری شیکاری و لای فرۆید لە دەروونشیکاریدا دەردەکەوێ.

ریکۆر ئەم هێرمنیۆتیکایە بە جۆرێك لە راڤەکردنی ئارکیۆلۆجی لەقەڵەم دەدا چونکە رابوردو هەڵدەکۆڵێ لەپێناو ئاشکراکردنی ئیرادەی ... سەرەتایی و پەنهانەکان کە لە پشت ئەو مانا هەستپێکراو و دیاردە رواڵەتییەکانەوە خۆی حەشارداوە. واتە ئەواو پێچەوانەی هێرمنیوتیکای باوەڕ کە بەرەو خودی دیاردەکان دەڕوا لەپێناو ناسینی توانای ئەو دیاردانە لە ئاشکرابوونی ئەو خۆحەشاردانەدا.. واتە هەوڵدەدا پەردە لەسەر ئەو شتە هەڵماڵێ کە خاوەنی دەق لەڕاستیدا مەبەستێتی، تەنانەت گەر بە ئاشکراش نەیدرکێنێ. لێرەوە لەبری ئەوەی هێرمنیوتیکای باوەڕ بە قوڵایی نهێنییە تاریکەکانی دەقدا رۆبچێ هەوڵدەدا دەق لەبەر رۆشنایی خودی خۆیدا تەماشا بکا، هەربۆیە راڤەی ئەو بەرەو داهاتووە، ئەو راڤانەش راڤەی ئاتامادەنین، راڤەی ئارکیۆلۆجی نین.

هەندێ لە رەخنەگران ریکۆر – یان بەوە تاوانبارکردووە کە لە نوسینەکانیدا هێڵێکی بیرکردنەوەی رێك و لۆجیکی و دیاریکراو پەیڕەو ناکا، تەنانەت رەنگە پەیوەندییەکی لۆجیکی لە یەکبەدوایەکداهاتنی ئەو نوسینانەیدا نەبێ کە ژمارەیان لە سەد تێدەپەڕێ و لەنێویاندا بیست ویەك کتێبی بنەڕەتی هەن. بەڵام ریکۆر لە دیدارێکدا کە رۆژنامەی (لۆموند)ی فەرەنسی لەگەڵیدا سازیداوە، لە 1ی فێبرایەری 1991دا بڵاوکراوەتەوە، نکوڵی لەو تۆمەتە کردووە و ئەوەی روونکردۆتەوە کە هەر کارێك لە کارە گەورەکانی ئەو زەمینەی زەینیی بۆ ئەو کارە خۆشکردووە کە بەدوایدا هاتووە. لەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە بەرهەمە گەورەکانی ئەو زادەی پرۆسەیەکی فیکریی بزۆك و گەشەسەندووە کە تیایدا زەین بەشێوەیەکی سروشتی جوڵە دەکات، نەك تەنها لە بابەتێکەوە بۆ بابەتێکی تر بەڵکو تەنانەت لە بوارێکیشەوە بۆ بوارێکی تر بە گوێرەی زنجیرەیەکی پەسەندو ماقوڵ. گرنتیی هەر کارێك لە کارەکانی ریکۆر رووبەڕێکی بەئاگی لەدوای خۆی

بەحێوێنشوەوە کە پێویستی بە تەواوکردن هەبووە، بۆ نموونە کاتێ لە کتێبی "ئیرادەکردەو بێ ئیرادە" بۆوە بۆی دەرکەوت کە پێویستە کێشەی ئیرادەی شەڕانی چارەسەر بکا ئەوەبو کتێبی "مرۆڤێك کە هەڵەی لێدەوەشێتەوە" نوسی.. لە کۆتایی ئەو کتێبەشدا دەرگای بە گرارەیی هێشتەوە بۆ لێکۆڵینەوە دەربارەی کێشەی هێما "رەمزیەتی شەر".. ئەوەشی بۆ دەرکەوت کە دوو شێواز هەیە بۆ ئەو لێکۆڵینەوەیە، یان لەڕێگای ئەفسانەوە یان لە ڕێگای دەروونشیکارییەوە واتە لە روانگەیەکی پاتۆلۆجییەوە، (بە مانایەکی تر گەشتە ئەو دەرەنجامەی) کە دوو خوێندنەوەی جیاواز لەئارادان بۆ تێگەیشتن لە هێماکان و لێکدانەوەیان، یەکەمیان لەناو هێماکاندا بەدوای ئەو ئامازانەدا دەگەڕێ کە مانای بەرزبوونەوەو پاکێتی و گەیشتنە لووتکەیان تێدایە، ئەوی تریشیان بەدوای ئاشکراکردنی ماناکانی روخان و شکستدا دەگەڕێ لەنێو ئەو هێماو ئەفسانانەدا، بەو مانایەی کە یەکێك لەو دوو خوێندنەوەیە هێڵێکی ئاینی- لاهوتی گرتۆتەبەر کە لەگەڵ هیرمنیوتیکای باوەڕدا دەگونجێ، دووەمیشیان ڕێگەی هیرمنیوتیکای گومانی گرتۆتەبەر کە لە کارەکانی نیچەو فرۆیددا دەردەکەوێ. دواجار ململانێیەك لەنێوان ئەم دوو ئاراستەیەدا هەیە کە ریکۆر کتێبی "راڤەکان: چەند وتارێك دەربارەی هیرمنیوتیکا"ی بۆ تەرخانکردووە.

## پرسیارێکی کۆن

بەهەرحاڵ پول ریکۆر بە درێژایی کات و لە تەواوی نوسینەکانیدا بایەخێکی تایبەتی دا بە لایەنە ئەخلاقی و سیاسیەکانی بوونی مرۆیی و هەندێ لەو کێشە بنەڕەتیانەی کە پەیوەست بوون بەو بوونەوە وەك کێشەی دادپەروەری و کێشەی بەرپرسیارێتی.

هەروەکو پرۆفیسۆر جون تومبسۆن-یش دەڵێ گرنگترین بەشداریی ریکۆر لە فەلسەفەدا کە هەمیشە بۆی دەمێنێتەوە بریتیە لەو شێوازەی کە توانی لە ریگایەوە خوێنەرەکانی سەرلەنوێ ئەو پرسیارە سەنتراڵە کۆنەی فەلسەفە لە خۆیان بکەنەوە: ئێمە کێین؟

ژیانی پۆل ریکۆر ژیانی ئوستادێکی ئەکادیمییە، دوور لە کێشەو رووداوە کتوپڕەکان، دوور لە بەشداریی راستەوخۆ لەو رووداوە گەورانەدا کە لە کۆمەڵگادا روویان داوە، ئەو بۆ نمونە کەسێکی جیاوازە لە جان پۆل سارتەر و هەندێ لەو فەیلەسوفە بونیادگەرو پاش بونیادگەرانەی وەك دریدا کە بەشدارییان لە بزاوتی خوێندکارانی 1968دا کرد، خودی خۆی لەو بارەیەوە دەڵێ کە هەمیشە ژیانی ئەو ژیانێکی ئەقڵیی ناوەکی بووە. لەو دیدارەدا کە رۆژنامەی لۆمۆند لەگەڵیدا سازیداوە وتویەتی ئەو کوڕی هەتیوی یەکێك لە قوربانیانی جەنگی جیهانی یەکەمە، ئەو منداڵێکی بچوك بووە کاتێ باوکی لەو شەڕەدا کوژراوە، هەربۆیە ئەو لە ماڵی باپیرانیدا گەورە بوو، ئەو ماڵەی کە بەپێی وەسفی خۆی لە یەك کاتدا یاسای توندو خۆشەویستیشی تێدا بووە، لەم بارەیەوە دەڵێ: "ژیانی من بەهایەکی نییە.. ژیانی من هەمیشە کارەکانم بووە، واتە کتێب و کارەکانم.. کتێبەکانم پاشماوەی منن، رەنگە مێژووی بۆچوونە فەلسەفیەکانم رێگایەك بن، بەلام مێژووی ژیانم بەو شێوەیە نییە".

## سەرچاوە

د. احمد ابو زيد، الارادة و التأويل.. بول ريكور و فن القراءة.

العربي/ العدد 512- يوليو 2001، ص 24-29.

# رۆشنبیران لە غوربەتدا

■ فرانز نویمان

● و. لە فارسییەوە: نەوزاد حارس

"ئەگەر ولاتەکەم منی ناوێت، منیش ئەوم ناوێت. جیهان گەورەو فراوانە"

ئـەم وتەیـەی هۆگـۆ گرۆتیـۆس، مافناسـی بەناوبانگو پسپۆڕ لە مافە "سروشتییەکان" و مافـە نێودەوڵەتیـەکان کـە پـاش دوور کەوتنـەوەی لـە مەترسیی زیندانی مۆریس دو ڕانژ، لـە سـاڵی 1621دا وای وتوە. گرۆتیۆس بە ناچـاری دە سـاڵ لـە پـاریس ژیـانی بەسـەر بـردوو، لـەوێ، دوور لـە نیشـتمان، بـەناوبانگترین کتێبـی De jure belli ac Pacis (یاسای جەنگ و ئاشتی)ی نووسی.

بەڵام ئەم هەستەی گرۆتیۆس و چارەنووسی ئـەو نابێت وامان لێبکات باوەڕمـان پێبهێنێت کـە هەست یـان چارەنووسـی کەسـێك کـە ئـەمڕۆ نیشـتمان جێدەهێڵێت، جگە لەمە هیچی تر نیە. دوو گۆڕانکاری بنچینەیی روویداوە: یـەکیان لـە ئـەرکی رۆشنبیرداو، ئەوی تر لە دەوروبەری کۆمەڵایەتی ئەو.

رۆشنبیر ویژدانـی رەخنـەگری کۆمەڵگایـە لەهـەر یـەکێك لـە قۆناغـە مێژووییـەکانیدا، یا لایـەنی کـەم دەبێـت وا بێـت. ئـەرکی ئـەو رووبەڕووبوونـەوەی رەخنەگرانەیـە بەرامبـەر بـە کۆمـەڵگاو نیشـاندانی ئـەوەی کۆمـەڵگا تـا چ ئەندازەیـەك ئـازادی بەدەسـت هێناوە یاخود بەدەستی نەهێناوە. ئێستا کاتی ئـەوە نیە ئەوە بسـەلمێنم کە بۆچـی دەبێت وا بێت. ئـەم مەسـەلەیە لـەو وێناکردنـەوە، کـە تـەوەرەی زانسـت کۆمـەڵگاو سیاسـەتە –واتـە وێنـاکردنی ئـازادی– ، پێویست دەبێت. بەڵام چونکە هیـچ کۆمەڵگایـەك – چ لە رابوردوودا و چ ئێستا– هەرگیز نـەیتوانیوە ئازادی مرۆڤ بەتـەواوی بهێنێتـە دی، ئـەرکی رۆشـنبیر بـۆ رەخنـەگرتن و هەڵسـەنگاندن هـەروەك خـۆی دەمێنێتـەوە. رۆشـنبیر ویژدانـی کۆمەڵگایـەو، لەبەرئـەوە، بـە دەربڕینێکـی تایبـەتی، هەمیشـە دەرکـراو و بـێزراوە، چونکـە ویـژدان، بەتایبـەتی لـە سیاسـەتدا، هـەرگیز سـەرچاوەی ئاسوودەیی دەروون نییە.

بەرجەستەترین شێوەی ئـەرکی رەخنەگرانـەی رۆشنبیر، سوکراتە کە فەیلەسـوفی بـە "بێگانەیـەکی

هەمیشەیی لەنێوماندا" و کاری ئەو بە گومان کردن و پرسیار کردن دەربارەی سروشتیی فەلسەفیی هەموو شێوازێکی حکومەت و هەموو کۆمەڵگایەك دەناسێنێت[1] و، دەڵێت:

بۆیە من هەمیشە یەکێك بووم و یەکێك دەبم لەو کەسانەی کە بێگومان دەبێت لایەنی ئەقڵ بکەنە ڕێنما، بە چاوپۆشین لەوەی ئەم لایەنە ئەقڵییە کە پاش تێڕامان و بیرکردنەوە بە باشتر لە لایەنەکانی تر دێتە پێش چاوم، هەرچییەك بێت؛ وە لەو ڕووەوە کە دەبینم بەشم لە ژیاندا ئەمە بووە، ناتوانم حاشا لە قسەکانی خۆم بکەم[2].

هەر ئەم کەمە دەربارەی گشتگیرکردنی کێشەی پەیوەست بە ئەرکی رۆشنبیرەوە ئێستا بەسە، چونکە مەبەست تەنیا ئەوەیە کە بەم هۆیەوە ڕێگە بۆ شیکردنەوەی چارەنووسی جیاوازی رۆشنبیران لە سیستەمە سیاسییە جیاوازەکاندا ئاسان بکرێت.

ئاشکرایە کە ئەرکی رۆشنبیر لە شار – دەوڵەتەکانی گریکدا، هەم سەختترو هەم ترسناکتر بوو لەهەر جێگایەکی تر. لە گریک دا، سیاسەت و کولتوور یەك شتن یان لایەنی کەم بە یەك شت پێناس دەکرێن. مەدەنیەتی جیهانی ناسراو لە یەك خاڵدا چەقی بەستووەو پاشماوەی جیهان یەکسەر دوچاری بەربەریەت بوە، یان وا دێتە پێش چاو کە ئاوا بێت. لەبەرئەوەی سیاسەت و کولتوور یەك شتن، دوورخستنەوە یەکسانە بە مەرگ. بەڵام لە قۆناغی یۆنانی و ئیمپراتۆریدا، بارودۆخەکە دەگۆڕێت. رۆشنبیر ئازادی زیاتری دەست دەکەوێت، چونکە دەبینین کە ئەگەر لەناو سیاسەتیشدا نەبێت، بوونی هەر تەحەمول دەکرێت. سیاسەت چیدی لەگەڵ کولتووردا یەك شت نیە. ئامانجی فەلسەفەی سیاسی ئەپیکۆرۆس راستەوخۆ ئەوەیە کە رەوایەتی بە کاری رۆشنبیرێك بدات کە لە سیاسەت دوور دەکەوێتەوەو دەڵێت چیدی چاوەڕوانی دادو عەدالەت لە دەوڵەت ناکات و تەنیا چاوەڕوانی جێگیرکردنی ئەمن و ئاسایشی هەیە، بەڵام رەواقیەکان هەروەها خوازیاری ئەخلاقن لە سیاسەتدا و ئەم چاوەڕوانیەشیان دەبێتە هۆی ناکۆکی توندوتیژ. دوورخستنەوە لە دۆخێکی وادا، گەرچی چیتر زیانە ئەخلاقیەکانی رابوردووی نیە، هێشتا لەرووی فیکرییەوە بە هەمان ئەندازە کارەسات بارە. ناڵەو ماتەمی ئۆڤیدیۆس[3] کە ئۆگستۆس (ئیمپراتۆری رۆما) بۆ کەناری دەریای رەشی دوورخستبۆوە، باشترین نمونەی چارەرەشیی شاعیرێکە کە بەشێکی لێکدانەبڕاوی مەدەنیەتی رۆمایەو بەو شێوەیە لەرێی بەرزیی ئەودا ئازاری چەشتووە.

دۆخی سێیەم، دۆخی کولتووری گشتیە کە ناوەڕۆکەکەی مەسیحیەت و زمانەکەی لاتینیە و تیایدا دوورخستنەوە یان وڵات جێهێشتن جگە لە گۆڕینی شوێنی نیشتەجێبوون هیچ مانایەکی نیەو دەربارەکان و زانکۆکان بۆ راکێشانی زانا دوورخراوەکان دەستپێشخەری لە یەك دەکەن و جیاوازیە نەتەوەییەکان بێ مانایەو بەهۆی خوێن ساردی و گوێ پێنەدانی مەزهەبی فراوانەوە کە لە رۆڵی زاڵ و بێ هاوتای کڵێسا لە بواری کولتووردا سەرچاوەی گرتووە، مەیدانی چالاکیی بەرهەمهێن لە هیچ جێیەك بۆ رۆشنبیری دوورخراوە تەنگ ناکرێت. کار دەگاتە ئەو رادەیەی کە زانای گەڕۆك –بە چاوپۆشی لەوەی کە بە هەڵبژاردنی خۆی گەڕۆك بوبێت یان بەزۆر– لەوە بەدواوە دەبێتە یەکێك لە دیاردە تەواو ئاساییەکان.

بەڵام چەند ئاوارتنێکیش (استثناء) هەیە. دوو دۆخ کە تیایاندا ئەو حوکمە گشتییەی سەرەوە بەتەواوی راست نیە، یەکیان دۆخی زانا سیاسیەکانەو، ئەوی تر دۆخی هەڵگەڕاوەکان. لێرەدا نامەوێت دەربارەی هەڵگەڕانەوە بکۆڵمەوە. بەڵام

باسی دوو نمونه لە گروپی یەکەم دەکەم: دانتێ و مارسیلۆسی پادوایی. دانتێ کاتێك کە بە ناچاری فلۆرانسا جێدەهێڵێت، لە دەربڕینی هەستی خۆیدا دەڵێت: "لە غوربەتدا نان تامی چەند سوێرەو، سەرکەوتن و هاتنەخوارەوە لە پلیکانەی بێگانەکان چەندە سەختە". دانتێ نەك تەنیا شاعیرو زانا، بەڵکو سیاسەتمەداریش بوو. دوورخستنەوە، homo Politics (یان مرۆڤی سیاسی) لەودا نابوت کرد، بەڵام شاعیرو زانای گەیاندە ئەندازەی کەماڵ. وێناکردنە سیاسیەکانی ئەو لە غوربەتی نیشتماندا لە رەگ و ریشەوە گۆڕا. گەشت بۆ ڤیرۆناو بۆلۆنیاو پاریس و ئۆکسفۆردو لەندەن و کۆڵۆن و شارەکانی تر ئەوی لە تەنگیی دیدگای سنورداری هەرێمایەتی و خۆماڵی رزگار کردو گەیاندیە چەند ئەندێشەیەك لە سیاسەتدا کە ئەگەرچی لە سەدەی چواردەهەم (ی زاینیدا) سەرچاوەی کاریگەرییەکی شایستە نەبوو، بەڵام دوایی بوو بە رەقیبی کورت بینی ناوچەیی و ناسیۆنالیزم.

زانایەکی سیاسی دی، مارسیلۆسی پادوایی بوو کە پاش دوورخستنەوەی لە پاریس، چووە ناو رژێمێکی سیاسی دیەوە، واتە دەزگای لودڤیکی باڤاریایی، بە یارمەتی ئەو سەرقاڵی بە پراکتیك کردنی پرۆژەیەکی گەورەو فراوان بوو ئامانجی هێنانە دی دەوڵەتێکی یەکسەر نائاینی، (دەوڵەتێك کە بنەما تیۆرییەکانی لە کتێبەکەی خۆیدا Defensor Pacis (بەرگریکەری ئاشتی) پەروەردە کردبوو.

لەگەڵ هەموو ئەمانەدا سەرنجدانی ئەم خاڵە – بەتایبەتی بۆ تێگەیشتنی ناسیۆنالیزم– گرنگە کە قۆناغی فراوان بوونی مەسیحیەت، دوبارە دۆخی یەکەمی نوێ کردەوە کە تیایدا کولتورو سیاسەت بەتەواوی یەك شت بوون. وردبوونەوە لە یەکێك لەو گۆڕانکاریانەی کە لە زماندا رووی دا، تێگەیشتنی مەبەستەکەم ئاسانتر دەکات.

رۆمانیەکان هەروەك گریکییەکان لە رابوردوودا، رۆشنبیران یان هونەرمەندانی نەیاریان بەدوورخستنەوە مەحکوم دەکرد. بۆ ئەم سزایە زاراوەی "extermination" یان بەکاردەهێنا کە بە مانای دەرکردن بۆ پشت سنوور بوو. بەڵام لە دەوروبەری سەدەی سێیەم (ی زاینیدا) زاراوەی ناوبراو مانای گۆڕی و مانای ئێستای –واتە سڕین و لەناوبردنی جەستەیی (یان کوشتن)–ی وەرگرت[4]. هۆی ئەم مانا گۆڕینە، فراوان بوونی مەسیحیەت و پەیوەست بوونی سیاسەت بە ئاینەوە بوو. تێگەیشتنی ئەم گۆڕانە لە رووی کۆمەڵناسییەوە بەتەواوی ئاسانە: سیستەمێکی نرخاندنی نوێ باڵی بەسەر کۆمەڵگادا کێشا؛ ئەم سیستەمە نوێیە سەرتاسەری کۆمەڵگای گرتەوەو نەیاریی (مخالفت) گۆڕی بە هەڵگەڕانەوە. لەوە بەدواوە چیدی نەدەکرا لەگەڵ دوژمندا بە نەرمی رەفتار بکرێت، چونکە ئەو نەك تەنیا باوەڕی پیس دەکرد، بەڵکو دەشیا ببێت بە سەرچاوەی دژایەتی. لەهەر شوێنێك باوەڕی ئاینی یان نیمچە ئاینی نوێ، لەجێی رەزامەندی ئەقڵی، رەگەزی پێکهێنەری کۆمەڵگا بێت، دۆخێکی وەك ئەوەی دیمان دێتە دی. شێوازی نوێی ئەم مەسەلەیە، دوایین بەشی کتێبی "پەیمانی کۆمەلایەتی" رۆسۆ، لەژێر ناونیشانی "ئاینی مەدەنی"[5]ە کە تیایدا جەخت لەسەر پێویستیی پەیدابوونی ئاینێکی مەدەنی تازە بۆ بزواندنی گیانی پەیوەستیی کۆمەڵایەتی دەکات و دەڵێت کەسانێك کە بنەما ئەخلاقیەکانی کۆمەڵگا دەخەنە ژێر پێ دەبێت دەربکرێن و کەسانێك کە وا دەنوێنن پەیڕەوی ئەو بنەمایانە دەکەن بەڵام لە راستیدا ئەو بنەمایانە

دەخەنە ژێرپێ دەبێت لەناو ببرێن. کەسێك کە پوختەی دوایین بەشی کتێبەکەی رۆسۆی خستە پراکتیکەوە، رۆبسپێر لە دەورانی حکومەتی تۆقاندندا بوو. دەربارەی ئەم دۆخە دوایی دوبارە دەکۆڵینەوە.

بەڵێ، پاش جێگیربوونی مەسیحیەت، رۆشنبیر لە سەدەکانی ناوەڕاستدا دۆخێکی ئیرەیی بزوێنی دەست کەوت، چونکە کەوتبووە نێوان ئاین و دەوڵەتەوە لە ململانێی هەمیشەیی نێوان ئەم دووانە بە باشی سوودی وەردەگرت و ئازاد بوو تا ئەو رادەیەی کە کار، لەلایەك، نەگاتە هەڵگەڕانەوەو، لەلایەکی تر، نەگاتە نەیاریی سیاسی، سەرقاڵی کاری خۆی بێت و وەك ئەندامی یەکێك لەو گروپانەی کە خاوەن مافی تایبەتی و خۆهەڵسوڕێنەری ناو کۆمەڵگا بوو، دەیتوانی شوێنی نیشتەجێبوونی خۆی بگۆڕێت و، بە واتا، پایەگای کۆمەڵایەتی خۆی بۆ هەر جێیەك بخوازێت ببات.

بە پێکهاتنی دەوڵەتە تاك نەتەوەییەکان، دۆخێکی نوێ دێتە کایەوە. دوو قۆناغ لەم رەوتەدا دەبێت لە یەکتر جیابکرێنەوە: دامەزراندنی دەزگای دەوڵەتی و دەرکەوتنی هوشیاری نەتەوەیی. شتێك کە ئەم دوو قۆناغە بە یەکەوە گرێ دەدات وێناکردنێکی فەرمانڕەوایەتییە کە لە هەمان کاتدا تەم و مژێکی سەرەکی لە پەیوەندی نێوان سیاسەت و کولتووردا و دواجار لە پەیوەندیەکانی رۆشنبیرو دەوڵەتدا دروست دەکات.

حاکمیەتی دەوڵەت پێویستی بە جیایی دەوڵەت لە کۆمەڵگاو سیاسەت لە کولتوور هەیە، دەوڵەت دەزگایەکە کە جیا لە کۆمەڵگا دەرکەوتووەو دروست کراوەو، لەبەرئەوە، پێداویستی ئەو، هەڵکردن لەگەڵ هەموو بیروباوەڕێکە کە بەپێی یاسا قەدەغە نەبێت و، بە دەربڕینێکی تر، بە چالاکیەکانی ئەم "نەهەنگ"(6) ە زیان نەگەیەنێت. بەڵام "نەهەنگ"

سنورێك بۆ دەسەڵاتی خۆی نابینێت. لە شوێنێکی دیدا من گرفتی سەرەکی زانستی نوێی سیاسەتم بەم شێوەیە دەربڕیوە:

گرفتی فەلسەفەی سیاسی –گرفتیو بە رواڵەت بێ چارەسەری ئەم فەلسەفەیە– گونجاندنی ئازادیە لەگەڵ زۆر لێکردن و ناچارکردندا. هاوکات لەگەڵ سەرهەڵدانی ئابووری دراوی "نقدی"، دەوڵەت لە سەردەمی نوێدا لە بەرگی دامەزراوێکدا دەردەکەوێت کە بانگەشەی ئەوە دەکات بۆ ئەوەی بازرگانی لە رێڕەوێکی ئەمیندا گەشە بکات و هاووڵاتیان لە بەری کارو کۆششی خۆیان بەهرەمەند ببن، هێزی زۆرو ناچارکردن دەبێت تەنیا لە دەست دەوڵەتدا بێت. هاووڵاتی بە دروستکردنی ئەم دامەزراوەو داننان بە دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی ئەو دەزگایەدا، لەهەمان کاتدا ئامێرێکی دروستکرد کە دەیتوانی ئەو لەبەری شیرینی رەنج و هەوڵەکانی و لە پشتیوانی پێویست بێبەش بکات و زۆر جار دەشیکرد. لێرەوە لە هەمانکاتدا کە هەوڵیدەدا تا دەسەڵاتی حوکمڕانی دەوڵەت ئاڕاستە بکات، سەرقاڵی ئاڕاستەکردنی ئەوە بوو تا توانای دەوڵەت بۆ زۆرداریو ناچارکردن سنوردار بکات. مێژووی فکری نوێی سیاسی لە سەردەمی ماکیاڤیلییەوە تا ئێستا، مێژووی ئەمجۆرە هەوڵدانە بووە بە مەبەستی ئاڕاستەکردنی ماف و زۆرداری یان یاساو دەسەڵات لە تەنیشت یەکترەوە بوە. هیچ تیۆرێك لە زانستی سیاسەتدا نییە کە ئەم دوو کارە پێکەوە نەکات. تەنانەت زیادەڕەوترین تیۆری لایەنگری دەسەڵاتی رەها (وەك تیۆرەکانی هۆبزو سپینۆزا) کە سەرەتا بە رووکەش مافی تاك رەت دەکاتەوە، بەڵام ئەو مافانە دوبارە لە دەرگای پشتەوە دێنێتە ژوور: هۆبز لەو رێگەیەوە کە فەرمانڕەوا بە سوێندێك دەگۆڕێت بە نوێنەر یان کارگوزاری بازرگانی کۆمەڵگاو گەر ئەو لە کارەکانیدا سەرکەوتوو بوو ئەوا هەموو دەسەلات و تواناکان بەو

دەسپێرێت و، گەر لە جێگیر کردنی یاساو ئاسایشدا شکستی خوارد هەموو ئەو توانایانە لەو دەسەنێتەوە؛ سپینۆزا بەمجۆرە بەو پێوەرەی کە دروستی کردووەو ماف و زۆرداری یەکسان بەیەك کردووە، رێگە بەهەر گروپێکی کۆمەڵایەتی خاوەن دەسەڵاتی پێویست دەدات کە دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی بگۆڕێت بە مافو alterius iuris (واتە ناشایستە بۆ خاوەندارێتی ماف) بە sui iuris (واتە شایستە بۆ خاوەندارێتی ماف) بگۆڕێت. تەنانەت لۆك کە لایەنگری ماف و یاسایە، خۆی ناچار دەبینێت کە "دەسەڵاتی تایبەت" بدات بە شاو رێگەی پێ بدات کە ئەگەر ماف و یاسا بوونی دەوڵەتی خستە مەترسییەوە، بەبێ یاسا –وە هەندێك جار تەنانەت بە پێچەوانەی یاساوە– کار بکات".

ئەم ئەمومژە سەرەکیە لە زانستی نوێی سیاسەتدا، لە پێگەی ئەمومژاوی رۆشنبیردا دیارو بەرجەستەیە.

لە قۆناغی یەکەمدا، پێش گەشەکردنی ناسیۆنالیزم، رۆشنبیر گێرۆدەی هیچ گرفتێکی گەورە نیە، بەتایبەتی کەسێك کە لە کاری سەربازی یان بەڕێوەبەرایەتی یان دادوەری یان دراوییدا کارامەیی هەبێت کە پسپۆڕی لەوانەدا بە تەواوی جێی پێویستی شاکان بوو لە دەزگاکانی دیوانەکانیاندا، لە رووی خوێندنەوەی چۆنێتییەك کە بەو شێوەیە لە پێگەی رۆشنبیردا پەیدابووەو لە سنوری نەتەوەکان تێدەپەڕێت و توانای دەداتێ لەگەڵ هەر فەرمانڕەوایەك کە بخوازێت ملکەچی بێت و لەهەر شوێنێك کە خواستی نیشتەجێ ببێت و، ئەگەر فلانە سەرچاوەی دەسەڵاتی سیاسی ئەوی دوورخستەوە، یەکێکی دی بەخۆشحاڵییەوە پێشوازی لێ بکات، قۆناغی سەرەتا (واتە سەدەکانی پانزەهەم و شانزەهەم) و قۆناغی دواتر، واتە سەردەمی سوڵتانە رەها رۆشنگەرەکان، لەم قۆناغەدا باشترین نمونەیە.

ناسیۆنالیزم ژێرخانی مەشروعیەت دانە بە دەوڵەت و، لە هەمانکاتدا دروستکەری گرفتی بەڕاستی ئەمڕۆیی ئێمەیە. هیچ قۆناغێك وەك ئەم سەردەمە، لە دیدی ئێمەوە، ئەو گرنگی و بابەتییەی نیە، چونکە نەتەوە ماف بەخۆی دەدات چەند شتێك لە هاوولاتی داوا بکات کە لەگەڵ بوونی چەندین تیۆر کە بۆ سنوردار کردنی دەسەڵاتی ئەو دەخرێنە روو، سنورو ئەندازەیەك ناناسن. تەنیا سنورێك کە بە خەیاڵدا دێت، وەکو لۆتەر دەستنیشانی کردووە، ویژدانی مرۆڤە.

لەم قۆناغەدا بوو کە گرۆتیۆس دەژیاو گرفتی ئێستای ئێمە دروستبوو. لێکۆڵینەوەی ئەوەی چۆن خواستەکانی نەتەوە لە هاوولاتی زیادی کرد، بۆ خۆی بابەتێکی دڵ بزوێنە. دیمەن، فەرەنسای سەدەی هەڤدەهەمە کاتێك کە دەوڵەتی نەتەوەیی ئەو وڵاتە لە نێو ململانێی کاتۆلیکەکان و هوگینۆتەکاندا[7] پێکهات. لە جەنگە ئاینییەکانی سەدەی شانزەهەمدا کە بە دانیشتنی هەنری چوارەم لەسەر تەختی پاشایەتی کۆتایی هات، سەلما کە نزیکایەتی ئایینی لە شوناسی نەتەوەیی گەورەترە. بەڵام لە دەورانی سەرۆکایەتی ریشیلیۆدا، دۆخەکە گۆڕا. کەم کەم بێنەوەی هەستی پێبکرێت، وەفاداریی هاوولاتی بۆ دەوڵەتی تاك نەتەوەیی لە سەروو هەر پەیوەندییەکی تر جێگەی خۆی گرت. باشترین نمونەی ئەم مەسەلەیە لەکاتی گەمارۆدانی بەناوبانگی شاری لاڕۆشێل دا بینرا. شارنشینانی لاڕۆشێل کالڤینیست بوون و، لە هەمان کاتدا کە لەگەڵ چارلزی یەکەم پاشای ئینگلتەرادا پەیمانیان دەبەست و بێگومان خیانەتیان لە وڵات دەکرد، بەیانیان کرد کە هیچ شتێك لەو پەیماننامەیەدا نابێت بە خیانەت وەربگیرێت. کەوابوو دەبینین کە لە گەرمەی جەنگی ئاینیدا –وە بە پێچەوانەی هەشت جەنگی ئایینی سەدەی شانزەهەمەوە– ئەمجارە

هەست دەكرێت كە وەفادارییی بۆ نەتەوە بە هیچ شێوەیەك لە وەفادارییی بۆ ئاین كەمتر نییە.

لە مێژووی سەردەمی نوێ (و هاوچەرخ)دا، ناكۆكی نێوان فەرمانڕەوایەتی و ویژدانی تاك لە كۆمەڵگادا دەبێتە هۆی دەركەوتنی دیاردەیەكی نوێ كە لەم دواییەدا ناوی "ئازادی دەروونی"[8] یان لێنا. بۆ ڕونكردنەوەی مەسەلەكە، چوار نمونە باس دەكەین: سپینۆزاو ئابێ میلیە[9] و كانت و تیۆدۆر مۆمزەن. ئەم چوار كەسە لەو خەسڵەتەدا هاوبەش بوون كە ئەو سیستەمە سیاسییەی كە تیایدا دەژیان، ڕەتدەكردەوە، بەڵام ئارەزوو یان توانایان نەبوو هێرشی بكەنە سەر. سپینۆزا خۆی لە هەر جۆرە بەستنەوەیەك بەو ڕژێمە سیاسییەی كە هەیە ئازاد كرد تا بتوانێت بەو شێوەیەی كە شایستەی زانایەكە، ژیان بەرێتە سەر. ئابێ میلیە لە سەدەی هەژدەهەمدا لە سەرتاسەری ژیانیدا قەشەیەكی كاتۆلیك بوو، بەڵام لەو وەسیەت نامەیەی كە لە سێ بەرگدا لەدوای خۆی بەجێی هێشت ئەوەی ئاشكرا كرد كە كۆمۆنیستێكی بێباوەڕ بوە. ژیانی كانت بە ڕووكەش ژیانی مامۆستای زانكۆیەكی پرۆسی بوو، شانازی بەوەوە دەكرد كە هەرگیز لە وانەكانیدا دوانەكەوتوەو هیچ كاتێك ڕێساو ڕێكخستنی ژیانی ڕۆژانەی تێك نەداوە. بەڵام لە نامەكانیدا ئاشكرای كردووە كە بیری شۆڕشگێڕانە بە مێشكیدا تێپەڕیووە كە هەرگیز جورئەتی چاپ و بڵاوكردنەوەیانی نەبوە، هەرچەندە كە ئەم خاڵەشی زیاد كردووە كە هیچ كاتێك شتێكی دوور لە ڕاستیی بڵاونەكردووەتەوە. وەسیەتنامەی تیۆدۆر مۆمزەن كە تەنیا چەند ساڵێك لەمەوپێش بڵاوكرایەوە[10] وەك كەسێكی بەڕاستی لیبراڵ مەشرەب نیشانی دەدات كە لەگەڵ ڕژێمی سیاسی سەردەمی خۆیدا ناكۆكی هەبووەو لە ناخی دڵەوە لێی بێزار بووەو ئارەزووی چالاكی سیاسی لەودا چەندین جار لە ئارەزووی لێكۆڵینەوەی زانستی زیاتر بوە.

لەگەڵ ئەمانەشدا، ڕووی هاوبەشی ئەو چوار كەسەی كە بە نمونە هێنامانەوە ئەوەیە كە هەموویان بەرهەمی گەورەیان لەدوای خۆیان بەجێهێشتووەو دووان لەوان، سپینۆزاو كانت، بوون بە سەرچاوەی خزمەتی شۆڕشگێڕانە بۆ زانینی مرۆڤایەتی.

لە قۆناغی لیبراڵیزمدا (كە لە دیدی هەموومانەوە، لە ڕوانینماندا بۆ ڕابوردوو، وەك سەردەمی زێڕینی ڕۆشنبیریی خۆی دەنوێنێت) ڕۆشنبیر بەرهەمهێنەرێكی ئازادە. زانكۆی ئازادو ڕۆژنامەی سەربەخۆو سیستەمی فرەحیزبی ململانێكەر، هەمووی لەگەڵ مەشرەبی ئەو ڕۆشنبیرانەدا دەگونجێت كە لە ڕێگەی فرۆشتنی بەرهەمەكانی خۆیانەوە لە بازاڕی ئازاددا ژیانیان بەسەردەبەن لە سەرتاسەری ئەو قۆناغەی كە لە سەدەی شانزەهەمەوە دەستپێدەكات و بە سەدەی نۆزدەهەم كۆتایی دێت، ئەو كەسانەی كە خولیایەكیان لەسەردایەو ڕووبەڕووی زۆر و ستەم دەبنەوە، هێشتا دەتوانن "بۆ ئاوەوە نیشتمان جێبهێڵن" و "بۆ هیجرەتگای دەروونی بڕۆن". تەنانەت ئەگەر ماڵئاواییان لە نیشتمانی خۆیان كرد یان دەركران، هێشتا بە ئاسانی دەتوانن ماڵێكی نوێ بدۆزنەوە. لە سەدەكانی شانزەهەم و حەڤدەهەمدا، لە كۆشكی شایەكەوە بۆ كۆشكی شایەكی تر كۆچ دەكەن و، لە سەدەكانی هەژدەهەم و نۆزدەهەمدا، ڕۆشنبیرانی ئاوارە، وەكو هێرزن[11] و باكونین و بایرۆن[12]، بۆ هەر شوێنێك ئارەزوو بكەن دەچن.

لە هەمانكاتدا، دیاردەیەكی نوێ لەناو دەوڵەتە تاك نەتەوەكاندا سەر لە ئاسۆوە دەردەهێنێت و ئەویش، زاڵبوونی بیرۆكراتیەتە بەسەر كۆمەڵگادا و مەیلی گۆڕینی ڕۆشنبیر بۆ خزمەتكاری كۆمەڵگا.

رۆشنبیر لە ئەنجامدانی ئەو ئەرکەی کە لەسەر شانیەتی رووبەڕووی دژواری روو لە زیاد دەبێتەوە. ژولیان بێندا[13] رۆشنبیران بەوە تاوانبار دەکات کە خیانەتیان لە پەیامی خۆیان کردووەو لەو بنەما ئەخلاقیانە دابڕاون کە بوونیانی شیاو کردووە. جارێ لەم تۆمەتە ئەخلاقییە چاو دەپۆشین و خۆمان بە شیکردنەوەی کۆمەڵناسییانەوە سەرقاڵ دەکەین و لێرەدا دەبینین کە راستە رۆشنبیران رۆژ بەرۆژ زیاتر دەبنە خزمەتکاری کۆمەڵگا. هیچ گومانێکی تێدا نییە کە دامێنی بیرۆکراتیەت بەسەر رۆشنبیراندا کشێنراوە. ئەرکی سوقرات ئاسای ئەوان کەوتۆتە مەترسییەوەو رۆشنبیر بووەتە بەرگریکەر لە "دۆخی ئێستا"و، هەر ئەم گۆڕانە لە پایەی رۆشنبیرداو گۆڕانی دەورووبەری کۆمەڵایەتی، جێگۆڕکێی لە کولتوورێکی میللییەوە بۆ کولتوورێکی تری کردووە بە کارێکی ئاوا دژوار.

ئەم رێڕەوە لە دەوڵەتە تۆتالیتارەکاندا[14] دەگاتە لوتکەی خۆی. دەوڵەتی تۆتالیتار بە کۆنترۆڵکردنی هۆکارە ئاساییەکانی زۆرو ناچارکردن رازی نییەو ناتوانێت رازی ببێت، رێک لێرەدا لەگەڵ حکومەتی دیکتاتۆریدا جیاوازی پەیدا دەکات. ئەگەر بڕیار بێت وەک رژێمێکی دیکتاتۆری بەردەوامیی بدات بە بوونی خۆی، دەبێت سەرتاسەری بیری مرۆڤەکان کۆنترۆڵ بکات و، لەم رێگەیەوە، فەرهەنگ بگۆڕێت بە پڕوپاگەندە "تبلیغات". کەم کەس دەتوانێت لە بەرامبەر دەزگایەکدا کە بە شێوازێکی رێکوپێک بیرو ئەندێشە زەلیل دەکات، بە پێوە خۆی رابگرێت. "ئازادی دەروونی" لەمجۆرە دۆخانەدا یەکسانە بە دەستکێشانەوەی تەواو لە چالاکی هزری. وەڵامی ئەم پرسیارە کە "ئایا بەرهەمە هزرییەکانی کۆچبەران بۆ دەروون، لە ئەڵمانیاو ئیتالیادا چی بوو؟" لە یەک وشەدا کورت دەکرێتەوە: هیچ. مێژی کۆچبەران بۆ دەروون هەمووی خاڵی بوو. هیچ دەستنووسێک نەبوو کە لە رۆژانی دیکتاتۆریدا نوسرابێتەوەو، نووسەر بەهیوای ئەوەی دوای رووخانی رژێمی توتالیتار بڵاوی بکاتەوە، لە چەکمەجەی مێزەکەیدا پەنهانی کردبێت. مەبەست لەم وتەیە هێرشکردنە سەر رۆشنبیرانی دژی نازی نییە،مەبەست روون کردنەوەی ئەم مەسەلەیەیە کە بۆچی بەرهەمە هزرییەکان بوونیان نەبوو و، بۆچی تەنیا چارەی رۆشنبیرانی دژ بە رژێمە تۆتالیتارەکان، کۆچکردنی فیزیکییە.

لەوەی کە وتم ئاشکرایە کە کۆچکردن لە سەردەمی ناسیۆنالیزمدا، بێ ئەندازە لەهەر کاتێکی تر لە رابوردوو بەئازارترە. رۆشنبیرێک کە نیشتمان جێدەهێڵێت، تەنیا جێگەی نیشتەجێبوونی خۆی ناگۆڕێت. دەبێت لە پێشینەی مێژوویی و لە ئەزموونە هاوبەشەکان ببڕێت، دەبێت زمانێکی نوێ فێربێت، دەبێت بەم زمانەو لەرێگەی ئەم زمانەوە بیر بکاتەوەو شتەکان تاقیبکاتەوە، دەبێت، بە رستەیەک، ژیانێکی سەرتاسەر نوێ پێکبهێنێت. ئەوەی کە دەبێت خۆی لەگەڵدا بگونجێنێت، لەدەستدانی پیشەو کارو پارەو پلەو پایە نییە (کە بێگومان ئەوەش بە ئەندازەی خۆی ئازاراوییە)، بەڵکو دەبێت لەگەڵ قورسایی کولتوورێکی تردا بگونجێت.

تەنانەت ئەگەر کۆچکردن بە مانای رزگاربوون لە دۆخێکی بەرگە نەگیراو بێت (هەروەک لە ئەڵمانیای نازیدا بوو)، دیسان ئەمجۆرە گونجانە ئاسانتر نابێت. رق هاتنەوە لە نازیزم بە هیچ شێوەیەک باری دژوارییە دەروونییەکانی ئاسانتر نەدەکرد، تەنانەت -بەڵکو بەتایبەتی- باری ئەو کەسانەی کە دەشێت ناویان لێ بنێین "زانایانی سیاسی"، واتە رۆشنبیرانی وەک مێژوونووسان و کۆمەڵناسان و دەروونناسان و لێکۆڵەرەوانی زانستە سیاسییەکان کە پەیوەندیان بە مەسەلەکانی دەوڵەت و کۆمەڵگاوە هەبوو و ناچار

بوون -یان دەبوو ناچارین- لەگەڵ راستیە ناخۆش و درندانەکانی سیاسەتدا مامەڵە بکەن. بە ئەنقەست دەڵێین بەتایبەتی زانایانی سیاسی رووبەرووی گرفتی دەروونی دەبوون، چونکە ئەم کەسانە چالاکانە لەپێناو بەدیهێنانی سیستەمێکی سیاسی باشترو پاکترو سروشت جوانتر دەجەنگین -یان دەبوو بجەنگن- و، کاتێك کە بە ناچاری نیشتمانی خۆیان جێهێشت، چارەنووس لە سێ رووەوە دژیان وەستا، چونکە هەم وەك تاکێکی مرۆڤ و، هەم لە پلەی زانادا، هەم لە ریزی مرۆڤی سیاسیدا ئاوارەو بێ ماڵوحاڵ بوون.

ئەگەر بمانەوێت بنەمایەکی گشتی لە کۆمەڵناسیدا دابنێین دەشێت ئاوا بڵێین:

کۆچکردن ئاسانتر دەبێت ئەگەر رۆشنبیری کۆچبەر بتوانێت پایەگای کۆمەڵایەتی خۆی لەگەڵ خۆیدا بگوازێتەوە، واتە ئەو دەوروبەرە کۆمەڵایەتیەی کە بۆی دەروات، لەگەڵ ئەو دەوروبەرەی کە جێی دەهێڵێت، لەنێوانیاندا لێکچوون هەبێت.

کۆچکردن ئاسانتر دەبێت ئەگەر گوێگری نوێ جێی گوێگری کۆنی ئەو بگرنەوە کە بەگوێرەی رابوردوو پێکهاتەی لێکچوویان هەبێت، بەجۆرێك کە ئەو بتوانێت لەگەڵ ئەوانی دیدا وتووێژ بکات و ئەوانی دیش وتووێژی لەگەڵدا بکەن.

(ئەم چەمکە دووانەییە هانز شپایەر لە نووسینەکەی خۆیدا پەروەردەی کردووە[15].

ئێستا ئەگەر ئەم دەستەواژە گشتیانە لەو پێنج دۆخەی کە بینیمان بەکاربهێنین، بەم ئەنجامانەی خوارەوە دەگەین:

ئەگەر وەك گریك لە رۆژگاری کۆندا، مەدەنیەت لەیەك خاڵدا سەنتراڵ ببێت و، ئەگەر سیاسەت و کولتوور یەکێك بن، کۆچکردنی رۆشنبیر بەشێوەیەکی ئاسایی دەبێتە هۆی وشکبوونی توانا فیکرییەکانی و لەوانەیە مەرگی فیکریی چاوەڕێی بێت.

لە مەدەنیەتی گشتی سەدەکانی ناوەڕاستدا، پایەگا کۆمەڵایەتیەکان و گوێگران لە هەموو شوێنێك، کەم تا زۆر، یەکێك بوون. خوێندکاران و مامۆستایانی زانکۆ لە سەدەکانی ناوەڕاستدا خەڵکی هەموو وڵاتەکان بوون و بەیەك زمان دەئاخاوتن و دەیاننووسی و لە بەها سەرەکیەکاندا بەشدارو هاوبەش بوون.

لە سەردەمی دەرکەوتنی دەزگا دەوڵەتیەکان بە مانا نوێیەکەی، ئەو کەسانەی کە شارەزایی تایبەتیان، بەتایبەتی لە کاروباری سەربازی و بەڕێوەبەرایەتیدا، هەبوو، مافیان بەخۆیان دەدا کە داوای کرێی زیاتر بکەن و، لە کۆشکی هەموو شاکاندا، پایەگای کۆمەڵایەتی و گوێگری - بەشێوەیەکی سەرەکی- یەکسانیان هەبوو.

پەیدابوونی دەوڵەتە تاك نەتەوەییەکان، ئازادی رۆشنبیری لەبەر ئەو هۆیانەی کە باس کرا دژوارتر کرد، بەڵام هێشتا رێگای کۆچکردن بۆ دەروون و، لە سەدەکانی هەژدەهەم و نۆزدەهەمدا، بۆ وڵاتانی دی لەبەردەمیدا کراوە بوو.

ئاشکرایە کە دەربارەی تۆتالیتاریزمی ئەڵمانیا دەبێت باسی وردەکاری دیاریکراوی بکەین. ئەم کارە تەنیا بەهۆی شیکردنەوەی دۆخی راستەقینەی ئەڵمانیاو پێگەی رۆشنبیری ئەڵمانی شیاو دەبێت.

ماوەیەکی زۆر پێش 1933، شێوازی بیرکردنەوەی رۆشنبیری ئەڵمانی تێکەڵ بە گومان کردن و نائومێدی و نزیك بە ناباوەڕی و گاڵتەکردن بە بنەماکان بوو. ئەوەی کە بە شۆڕشی 1918 ناسراوە، دوو قوتابخانەی سیاسی دژ بەیەکی لێکەوتەوە: یەکیان دیلسۆنیزم و ئەوی دی بۆلشەفیزم بوو. دەربارەی پێکدادانی هێزە فیکرییە دژ بەیەکەکان لە ئەورووپا، بەتایبەتی لە ئەڵمانیا، هەرچەندێك بڵێین

کەمە. تیۆری بالا بلندی ویلسۆن[16] دەربارەی مافی دیاریکردنی چارەنووس لە چوارچێوەی یاخود بەدەر لە چوارچێوەی کۆمەلگای نێودەولەتی بە مەبەستی کۆتایی هێنان بە جەنگ و کێشمەکێش، نیشاندەری ئاواتەکانی لیبرالخوازانی ئەلمانیا و پەیڕەوکەرانی هەستانەوەی دیموکراتیکی کرێکاری ئەو ولاتە بوو. شۆڕشی لینین لە دیدی کرێکاران و هەندێك لە رۆشنبیران وەك دەرکەوتنی مەسیحی چاوەڕوانکراو و نەمانی ستەمکاری و ئازادی مرۆڤ و کەوتنی دەسەلاتی سیاسی بوو.

هەردوو تیۆرەکە دۆڕان. دیموکراسی تەنانەت پێش ئەوە دۆڕا بوو، چونکە لە نزیکەوە لەگەل شکست (ی ئەلمانیا لە جەنگی جیهانی یەکەم)دا پەیوەست بوو بوو و هەرگیز ئەو چالاکی و باوەڕ بەخۆبوونەی کە لە ولاتە ئەنگلۆساکسۆنەکاندا هەیبوو، بەدەستی نەهێنابوو. لیبرالیزمی ئەلمان لە ئەنجامی سیاسەتەکانی بیسمارکدا بەرەو گەندەلی دەچوو و ئازادیی بە فراوانخوازیی ئیمپریالیزمی فرۆشتبوو. سۆشیال دیموکراتی ئەلمانیا وەك دەزگایەکی بیرۆکراتی پانوپۆڕدا شێوا "مەسخ"بوو و ئازادی کۆمەلایەتیشی بە بەهای هەقدەستی زیاتر فرۆشتبوو. بۆلشەڤیزم بە پەلە گۆڕا بۆ دەزگایەکی تیرۆریستی کە لە فەلسەفەی مارکس بە خراپی سوودی وەردەگرت و تەنیا ئامانجی زیادکردنی هێزو توانای یەکێتی سۆڤیەت بوو لە دەرەوەو پتەوکردنی دەسەلاتی گرۆی بزوێنی باندی دەسەلاتدار لە ناوەوەی ئەو ولاتە بوو.

لەم بۆشاییەدا، دوبارە هەمان تیۆری کۆنی ناسیۆنالیستەکان و لایەنگرانی نوێکردنەوەی مەزنیی ئەلمانیا بالی بەسەر رۆشنبیرانی ئەلمانی و بەتایبەتی ژیانی زانکۆکاندا کێشا. زانکۆکان بوونە بنکەی بیروباوەڕی دژە دیموکراسی. بەهەلە وەرنەگیرێت. من نالێم ئەرکی زانکۆکان جاڕدانە بۆ دیموکراسی.

لەم بارەیەوە، من بەتەواوی لەگەل باوەڕەکانی ماکس ڤیبەر لە وتارە ناسراوەکەیدا، پیشەی زانست[17]، هاوڕام. بەلام گالتەکردن بە دیموکراسی و بزواندنی هەستی نەتەوایەتی و سروود وتن بۆ ستایش کردنی رژێمەکانی رابوردوو و پەردە دادان بەسەر هەموو ئەمانەدا بە خۆنیشاندان بە "ناسیاسی" بوون بێگومان و بە دلنیاییەوە لە ئەرکەکانی زانکۆ نییە.

رێگەم بدەن ئەزموونە تایبەتیەکانی خۆمتان لا باس بکەم. کاتێك کە لە بەهاری 1918دا چوومە زانکۆی بیرسلاڤ، ئابووری ناسی ناوداری ئەو زانکۆیە کە لە یەکەمین وانەی خۆیدا بڕوانامەی ئاشتی 1917 کە لەو رێکەوتنەدا پێشنیاری ئاشتی بەبێ لکاندنی زەمینی ئەوانی دی و بێ غەرامەت کرابوو، ئیدانە کردو خوازیاری لکاندنی لۆن وی و بریەو، گۆڕینی بەلجیکا بۆ سەرزەمینی ژێر چاودێری ئەلمانیاو، داگیرکردنی بەشێکی گەورە لە ئەورووپای رۆژهەلات و، بەدەستهێنانی کۆلۆنیالی لە دەرەوەی ئەورووپا بوو. تەنانەت مامۆستای ناودارتری ئەدەبیات، دوای رێزنان لە فەلسەفەی ئایدیالیزمی کانت، دەستی بە دەرهاویشتنی ئەم مەسەلە رەهایە لەو فەلسەفەیە کرد کە ئەلمانیا دەبێت سەربکەوێت و دەبێت حکومەتی پاشایەتی هەبێت و دەبێت تەنیا بەو مەرجانەی کە باسکرا ئاشتی قبولبکات. کاتێك لە پایزی 1918دا چووم بۆ لایپزیك، دیم مامۆستای ئابووری ئەو زانکۆیە –هێشتا لە ئۆکتۆبەری 1918دا– بە پێویستی دەزانێت پشتیوانی خۆی بۆ مەرجەکانی ئاشتی یەکێتی پسان جێرمانی و بەڕێوەبەرایەتی سوپای ئەلمانیا بەیان بکات و، مامۆستای مێژوو بەلگەی حاشاهەلنەگری دەهێنایەوە کە دیموکراسی بە خودی خۆی دژ بە گیانی ئەلمانیەو گەرچی دەشێت شیاوی ئەنگلۆساکسۆنە مادی رەوەکان بێت، بەلام لەگەل ئایدیالیزمی ئەژادی جێرمانیدا دژایەتی هەیە. کاتێك کە لە هاوینی

1919دا گواسترامەوە بۆ ڕۆستۆك، دیسم بۆ بەرچدانەوەی پڕوپاگەندەی مامۆستایان دژ بە جولەکە کە بە ئاشکرا ئەنجامدەدرا، چارە نییە جگە لەوەی کە لەنێوان خوێندکارانی زانکۆدا گروپێك پێکبهێنم. سەرەنجام کاتێك کە لەکۆتاییدا گەیشتمە فرانکفۆرت، یەکەمین ئەرك کە ڕووبەڕووی بوومەوە یارمەتیدانو پارێزگاری کردن لە مامۆستایەکی سۆسیالیست و تازە کار بوە لە بەرامبەر هێرشە سیاسی و جەستەییەکانی خوێندکاران بۆ سەر ئەو - خوێندکارانێك کە بە نهێنی سوودیان لە پشتیوانی زۆربەی مامۆستاکان وەردەگرت-.

دەبێت تێبینی ئەو خاڵە بکرێت ئەو کەسانەی کە ئەو پڕوپاگەندانەیان بڵاودەکردەوەو ئەو کارانەیان دەکرد، مامۆستایانی پلە دوو نەبوون، هەموویان - وەك دەڵێن- ئەستێرەی پلە یەکی زانکۆکانی خۆیان بوون. قوتابخانەی بەهاداری ویلهێلم فۆن هومبۆلت[18] چیتر بوونی نەمابوو. شێواندنی زانست لە ئەڵمانیا، لە کتێبێکی بچوك بەناوی خراپ بەکارهێنانی زانست[19] بە وردی و هەستیاری جوان وەسف کراوە.

ڕاستە کە لە 1924 تا 1930 دەوڵەتێکی بەپەلە پێکهات. حکومەتی کۆماریی سەقامگیر دەردەکەوت. کودەتاو "پوچ"[20]ی کاپ[21] و هەڵاوسان و "پوچ"ی یانەی خواردنەوەی هیتلەر و ڕاپەڕینی کۆمۆنیستەکان، هەمووی وا دەهاتە پێشچاو هی ڕابوردوو بێت. ویلسۆنیزم بە ڕووکەش ڕەنگ بوو بگاتە شتێك. فراوانی و گەشانەوە لە ئەمەریکا، کاریگەریەکی سەیری کردبووە سەر ئەڵمانیا. "فۆردیزم"[22] (بە وتەی ئەڵمانیەکان) بە چارەسەری هەموو گیروگرفتێك دەهاتە پێشچاو. بەڵام پاشان 1930 گەیشت و قەیرانی گەورەی ئابوری و بێکاری پەیدابوون و گروپە سیاسییەکان کەم کەم لێکهەڵوەشان و هاوکات لەگەڵ ئەوەدا، مەیلی نوێکردنەوەی مەزنی ئەڵمانیا لە زانکۆکاندا بەهێزو توندتر بوو و دەستکەوتە بە ڕووکەش شکۆدارەکانی ئەو دەوڵەتە بەپەلەیە بە با چوو - یان، بە دەربڕینێکی باشتر- نازیزم هاتە دی.

کۆچکردنی ڕۆشنبیران بەهۆی نازیزمەوە، لە ڕەگو ریشەوە لەگەڵ کۆچەکانی ڕابوردوودا جیاواز بوو. چوار هۆکار لەم بارەیەوە دەبینت لە یەکتر جیابکرێنەوە (هەڵبەتە ئەگەر فەرامۆش نەکرێت کە ئەم چوار هۆکارە دەشێت هەمووی لە یەك کەسدا کۆببنەوە، هەروەك زۆرجار لە ڕابوردوودا ڕووی دەدا): هۆکاری سیاسی، هۆکاری نەژادی، هۆکاری ئاینی و هۆکاری ئەخلاقی. پاڵنەری سیاسی، سەراسەر ڕوانینە سیاسییە جیاوازەکان -لە پارێزگارخوازی و ناسیونالیزمەوە تا کۆمۆنیزم-ی لە ئەڵمانیادا دەگرتەوە. بەم پێیە، لەنێوان وڵات چۆلکەراندا هیچ جۆرە یەکێتییەکی سیاسی نەبوو و نەدەشیا ببێت. دووەم، ڕاوەدونان و ئازارە نەژادیەکان بوو کە جولەکەو نیوە جولەکە و تەنانەت چارەکە جولەکەی دەگرتەوە، بێ گوێدانە ئەوەی کە ئەمجۆرە کەسانە دژایەتی ڕژێمیان کردووە یان نا. سێیەم، هۆکاری ئاینی بوو، چونکە نازیزم بە ئاشکرا دژی مەسیحیەت بوو، هەرچەندە شەڕ دژی ئاین، لەبەر هۆکاری تاکتیکی، هەرگیز بەشێوەی ڕووبەڕووبوونەوە نەچووە قۆناغی جێبەجێکردنەوە. وە سەرەنجام بێز هاتنەوەی ئەخلاقی لە ڕژێم بوو، هاوکات لەگەڵ باوەڕی چەسپیو بەوەی کە گەندەڵیی ئەخلاقی ڕژێم تەنانەت بواری "کۆچکردن بۆ دەروون" ناهێڵێتەوە.

لەبەر ئەمانە، هیچ لێکچوونێك لەگەڵ کۆچەکانی 1848دا نەبوو، چونکە کۆچکردن لەو سەردەمەدا تەنها ڕوکارێکی سیاسی هەبوو و دوورخراوەکان و وڵات چۆلکەران لەبەر هەمان هۆ ئەوەیان بە دیاردەیەکی کاتی دادەنا.

دارییم تەنیا رژێمی سیاسی ئەڵمانیای نەگۆڕی، ئەڵمانیای ژێراوژوور کرد، لێرەوە زۆرێک لە کەسەکان لە سەرەتاوە -یا پاش ماوەیەکی کورت- جێهێشتنی وڵاتیان یەکسان دادەنا بە بڕینی پەیوەندی تەواو لەگەڵ ئەڵمانیاو چاندنی درەختی ژیان لە خاکێکی تردا.

ڕێگەم بدەن دوبارە بگەڕێمەوە بۆ ئەزموونەکانی خۆم. من بۆئەوەی نزیکی ئەڵمانیا بم و پەیوەندیم لەگەڵیدا نەپچڕێت، لە یەکەمین سێ ساڵدا، واتە لە 1933وە تا 1936، لە ئینگلتەرادا گوزەراندم. جگە لە خوێندنی سەرو «گتفورا لە زانستە سیاسییەکاندا لە کۆلیجی ئابووری لەندەندا، لە کۆڕو کۆبوونەوەی پەنابەندەکانیشدا چالاکیم هەبوو. لە ئینگلتەرادا بوو کە بە باشی پەیم بەوە برد کە چارەڕێ کردنی ڕوخانی رژێم لە ناوەوە دەبێت بە گوێ بسپێردرێت. سیاسەتی گرووپە فەرمانڕەواکان لە بەریتانیادا کە هەوڵی دڵدانەوەیان (لە هیتلەر) دەدا، ئاشتیخوازیی پارتی کرێکاران کە لەو کاتەدا حیزبی ئۆپۆزیسیۆنی دەوڵەت بوو، هێواش هێواش من و زۆری تری بەو ئەنجامە گەیاند کە رژێمی نازی نەک تەنیا لاوازتر نابێت، بەڵکو بە پشتیوانی دەسەڵاتە گەورەکانی ئەورووپا، بەهێزتر دەبێت. لەبەرئەوە، دۆسییەکە دەبێت بەتەواوی لە ڕووی دەروونی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە دابخرێت و ژیانێکی نوێ دەستپێبکرێت.

بەڵام ئینگلتەرا وڵاتێک نەبوو کە کارێکی وا تیایدا مەیسەر بێت. من و ئەوانی دی هەموو ئینگلتەرامان خۆش دەویست، بەڵام کۆمەڵگای ئینگلیزی زیاد لە رادە خۆیی و تێکهەڵکێش و تواناکانی (بەتایبەتی لەو ڕۆژانەی بێکارییەدا) زیاد لە رادە سنووردارو سیاسەتەکانی نادڵگیر بوون. هەستم دەکرد هەرگیز وەکو ئینگلیزەکان ناتوانرێت ئینگلیزی بیت. لەبەرئەوە، وا دەهاتە پێشچاو کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا تەنیا وڵاتێک بێت کە لەوانەیە ئەم جێگۆڕکێ سێ لایەنە -وەک مرۆڤ، وەک ڕۆشنبیرو وەک زانای سیاسی- بە سەرکەوتوویی لەوێ شیاو بێت.

دەربارەی ئەوەی کە ئەم جێگۆڕکێیە -نەک تەنیا دەربارەی من، بەڵکو دەربارەی سەدان کەسی تریش- بە سەرکەوتوویی بەئەنجام گەیشت، پێش هەموو شتێک قەرزاری وڵاتە یەکگرتووەکان و خەڵکی ئەمەریکاو زانکۆکانی ئەو وڵاتە بوو، باشترین بەڵگەش ئەو ڕاستییە سەرسوڕهێنەرەیە کە ئەگەرچی کرێی مادی و نامادی خزمەتکردن لە زانکۆکانی ئەڵمانیادا بەشێوەیەکی گشتی لە هی ئەمەریکا زیاترە، تەنیا ژمارەیەکی زۆر کەم بە باشتریان زانی (دوای جەنگ) بگەڕێنەوە بۆ ئەڵمانیا.

چ شتێک لەسەر ڕۆشنبیرێک کە لە 1936دا بۆ ئەمەریکا وڵاتی جێدەهێشت قووڵترین کاریگەریی هەبوو؟ بە باوەڕی من، سێ شت: بەرنامەی ڕۆزفیلت و خولق و خووی خەڵک و ڕۆڵی زانکۆکان.

ئێستا بواری ئەوە نییە کە بەرنامەی ڕۆزفیلت و خولق و خووی خەڵکی ئەمەریکا، لە ڕوانینی ئێمەی کۆچبەرانەوە لەو ڕۆژانەدا، بە وردەکارییەوە شی بکەمەوە. لە ڕوانینی ئەڵمانییەکی گومانکەرەوە، بەرنامەی ڕۆزفیلت بەو مانایە بوو کە ویلسۆنیزمی کە لە 1917وە بانگەشەی بۆ دەکرا، ڕاستییە، نەک دروشم و پڕوپاگەندە، دەیسەلمێنێت کە یەک رژێمی دیموکراسی جەنگاوەر توانای چارەسەرکردنی ئەو گیروگرفتانەی هەیە کە بەهۆیەوە کۆماری ئەڵمانی ڕووخا.

خووی خەڵکی ئەمەریکاو میهرەبانی خودی و هاوسێ دۆستی و گیانی هاوڕێیەتی و برادەریی لەواندا هەروەها بەهەمان ئەندازە -بەڵکو زیاتریش- کاریگەر و دڵگیر بوون. زۆر کەس ئەم تایبەتمەندییەی ئەوانی شیکردووەتەوەو ستایشی کردووەو پێویست بە دووبارە کردنەوەی ناکات لەلایەن منەوە.

ئـەوەندەی کەسێك لـە ئـەورووپاو، بەتایبـەتی لـە ئەڵمانیا، دەستی دەکێشایەوە، کراوەیی کۆمـەڵگای ئەمەریکا، جێگرتنی زۆر ئاسان دەکرد لەناویاندا.

بەڵام لە روانینی پیاوی زانستەوە، ئەوەی زیاد لە هەر شتێکی تر گرنگی هەیە ژیـانی زانکۆییە. پێشتر وتم کـە ئەگـەر زانـا روبـەڕووی دۆخێکی کۆمەڵایـەتی هاوشێوە بێتـەوە، جێگۆڕکێ لـە کولتوورێکەوە بـۆ کولتوورێکی تر بـە رووکـەش ئاسانتر دەبێت. بـەڵام دەبێـت تێبینـی ئـەوە بکرێـت کـە ئایـا، لـە رووی کاروبـاری زانکۆییـەوە، دۆخـی ئـەڵمانیا هاوشـێوەی دۆخی ئەمەریکایـە؟ یـان جیاوازییـەکان بـە لێکچـوون خۆیان دەنوێنن؟

زانا ئەڵمانیـەکان بەشـێوەیەکی ئاسایی لـە رووی هزرییـەوە لـەژێر کاریگـەریی سـێ شـتدا بـوون: ئایدیالیزمی ئـەڵمانی و مارکسیزم و مێژووگـەریی؛ وە ئەمانە هەرسێکیان ئەم سیفەتە هاوبەشەیان هـەبوو کـە قوتابخانـەی فیکری گشتگیرو هەمـەگیر بـوون و پەیڕەوکـەرانیان بانگەشـەیان دەکـرد کـە دەتوانـن هـەموو دیاردەیـەك لـەو سیستـەمانەدا بگونجێنـن. سەرەڕای ئەمە، لە هەرسێکیاندا، قورسایی لـە رادەی ئاسـایی بـەدەری پێشـینەو سـوننەتە مێژووییـە تایبەتیـەکان روون و ئاشکرایە. لەبـەر ئەمـە، زانـای ئـەڵمانی ئـەهلی تیـۆرو مێـژوو ـوە بـە دەگمـەن پەیڕەویی مەشرەبی ئەزمونگەری و پراکتیکی ـ بـوە. ئەمانە هەمووی رێگە بۆ گومانکاریی ئاسان دەکـەن. زانایەك کـە ئەندێشـەی مێژوویی هـەبێت، پرۆسـەی مێـژوو زۆرجار بـە دووبـارە بوونـەوەی نمونـەکانی رابوردوو دەبینێت و نوێخوازی و داهێنان، بـە نرخـی زیادکردنی پایەو گرنگیی "کاروانی مەزنی مێژوو"، بە کەم دەگرێت و بە نزمی سەیری دەکات. ئەگەر بـاوەڕ وا بێـت کـە مێـژوو بـە ئاراسـتەیەکی دیـاریکراودا کاردەکات، شێوازی بیرکردنەوەی باسکراو ـهـەروەك لە مارکسیـزمدا دەبیـنرێت ـ مـەیل بـەرەو توندڕەوی پەیدا دەکات، بـەڵام بەهـەرحاڵ هەمیشە جۆرێك لـە وشـکی و رەقـی نزیـك بـە دۆگمایـەت لە بڕیاردا بەدیدەهێنێت.

ئەم مامەڵـە تیۆری و مێژووییـە، هاوکات لەگـەڵ کـەمێك بـێ نـرخ کـردن بـۆ فەلسـەفەی ئینگلـیزی و ئەمەریکاییە (یان، لایەنی کەم، لە رابوردوودا وابـوو). هێشتا ئـاوازی گاڵتـەجاڕی مامۆسـتاکەی خـۆم لـە فەلسـەفەدا لـەکاتی باسـی لـۆك و کۆندیـاك[23] و دێویـی[24] دەکـرد لەگوێمدایـەو، لەبیرمـە بیروباوەڕەکانی وایتـهێد[25] لـەو رۆژانـەدا هـەروەك ئەمڕۆ، چۆن بە بێدەنگی پێشوازی لێدەکرا.

لەبەرئـەوە، ئەڵمانیـەکی وڵات جێهێشـتوو کـە حورمەت گرتنی تیۆرو مێژوو و نزم دانانی فەلسەفەی رەسەنایەتی ئەزموون و رەسـەنایەتی کـار لـەودا بـوو بوو بە سیفەتێکی هەمیشەیی، دەچووە ناو کەشێکی هـزری خۆشـبین و مـەیلدار بـۆ ئـەزموون و نامێژووگەرەوە کە رێك ناکۆك بـوو لەگـەڵ رابوردودا، بەڵام بێگومان باوەڕ بە راست بوونـی خـۆی بەهـەمان ئەندازە باڵی بەسەر ئەودا کێشابوو.

ئـەم جیاوازییـە بنەڕەتیـە نـەك تـەنیا لـە نـەریتی هزری، بەڵکو لە بارودۆخی زانکۆکانیشدا ئاشکرابوو. زانکۆکانی ئەڵمانیا بە چاوی شوێنی پـەروەردەکردنی نوخبەو هەڵبژاردەکان لەخۆیان دەڕوانی، وەك ئەوەی ئەم کۆمەڵی نوخبەو هەڵبژاردانە تەنیا بەپێی پێوەرە کۆمەڵایەتیـە ـئابوورییـەکان پێك بێـن، نـەك بـەپێی سـەرکەوتنە زانسـتی و فیکرییـەکان. زانکۆکـانی ئەمەریکا بازووی یەك بنەمای پەروەردەکردن بـوون و ئەویش، بەهرەمەندی هەرچی فراوانتری هاووڵاتیان لە سـودەکانی فـێرکردن و پـەروەردەکردن. پـەروەردەکردنی نوخبـە تـەنیا بەشێکی بچوکی لـە هەموو چالاکییەکانی فێرکردن دەگرتەوە.

زانکۆ لـە ئـەڵمانیادا لافـی ئـەوەی لێـدەدا کـە "Universitas"، واتـە دەبێـت بنـەماکانی زانسـتە

لەبەرئەمە، هیچ جۆرە رەوتێکی هزری پێشڕەو لە سەرچاوەی هیگلیزم یان کانتیزم تێراو نەبوو. مارکس و فرۆید لە زانکۆکانی ئەڵمانیادا بەدەر نرابوون و، رەخنەی نیچە لە چاکەکان (یان، بە دەربڕینێکی باشتر، خراپەکان)ی بۆرژوازی ئەڵمانی، بۆ خاڵی بەرامبەری سڕایەوە.

سەرکەوتنە گەورەکان، هەمووی لەبەشی مێژوو و لە بەشی مافەکاندا بەدەست هاتبوو؛ بەڵام نە مێژوو بە هیچ شێوەیەك دەیتوانی لەگەڵ راستییە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکاندا مامەڵە بکات، نە مافەکان، لەبەر ئەمانە، خوێندنەوەی ئەو راستیانە لە زانکۆکانی ئەڵمانیادا جێگەی نەبوو. لێکۆڵینەوەی زانستی بەشێوەیەکی گشتی بریتی بوو لە تیۆردانان و زانیاری کتێبی. ئەوەی کە لای ئێمە بە زانستە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان ناسراوە، زیاتر لە دەرەوەی زانکۆکان دەخوێندران.

تەنیا یەك ئاوارتن هەبوو، ئەویش ماکس ڤیبەر بوو کە لە هەر شوێنێك زانستە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان بخوێندرێت، ناوی ئەو ناسراو و جێگەی رێزو ستایشە. مەزنی ڤیبەر لەوەدایە کە ئەو چوارچێوەیەکی تیۆری (هەرچەندە، لە دیدی منەوە، بەهاو گرنگی یەکلاییکەرەوەی نییە) و دەسەڵات شکاندنی بەسەر برێکی سەرسوڕهێنەر لە زانیاری و داتا[27] و هەستی بەرپرسیاری سیاسی کە شایستەی زانایەکە، بە شێوازێکی بێ وێنە لەخۆیدا کۆکردۆتەوە. لەگەڵ ئەمانەشدا، کاریگەری و دەسەڵاتی ڤیبەر لە ئەڵمانیادا زۆر سنووردار بوو. زانستە کۆمەڵایەتیەکان لە ئەڵمانیادا بە پەیرەوکردنی ئەو خەسڵەتەی کە خاوەنی بوو و، گرنگیدان تەنها بە لایەنی شێوازناسی لە ڤیبەردا، ئەوی نابوت کرد. نە گرنگی بە جەختکردنی ئەو لەسەر پێویستی خوێندنەوەی ئەزموونگەریانە دراو، نە بە پێداگرتنی لەسەر پێویستی هەستی بەرپرسیاری زانا بەرامبەر بە کۆمەڵگا. ئەو شوێنەی کە ڤیبەر بەڕاستی تیایدا ژیایەوە، لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا بوو.

بێگومان ئەڵمانیا هەمیشە وا نەبوو. رۆژگارێك، پێش 1870، لە ئەڵمانیا و زانکۆکانی ئەڵمانیادا زانستە سیاسییەکان بوونی هەبوو و کاری پێدەکرا، جێگەی سەرنج ئەوەیە کە بورجیس[28] کۆلیجی زانستە سیاسیەکانی زانکۆی کۆڵۆمبیای (لە شاری نیویۆرك) لەسەر بناغەی شێوازی Staatswissenschaft (زانستە سیاسییەکان)ی ئەڵمانیا بنیات نا. رۆتێك[29] و وێلکەر[30] و رۆبەرت ڤۆن مۆڵ و بلۆنچلی[31] و دالمان[32] و بەتایبەتی لۆرەنتیس ڤۆن شتاین هەمووان لە زانایانی باوەڕپێکراوی زانستە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکان بوون و لە بەڕێوەبەرایەتی دەوڵەتی و شیکاری پارتە سیاسییەکان و خوێندنەوەی پراکتیکی دامەزراوە سیاسییەکان و بونیادی کۆمەڵگا، دەکۆڵینەوەو وانەیان دەوتەوە.

بە دامەزراندن و پتەوبوونی ئیمپراتۆریی ئەڵمانی، هەموو ئەمانە کۆتاییان پێهات، ئەمەش بۆخۆی رەنگدانەوەی کەنارەگرتنی لیبرالیزم بوو لە سیاسەت. لیبراڵەکانی ئەڵمانیا هەموو هۆش و هەستی خۆیان ئاراستەی تیۆری **Rechtsstaat** (واتە دەوڵەتی یاسادار یان دەوڵەتی لەسەر یاسا بنیات نراو) کردبوو. لایەنگرانی ئەم تیۆرەیە بایەخیان بە سەرچاوەو دروستبوونی یاسا نەدەدا و تەنیا گرنگیان بە مەسەلەی ناساندنی مافەکانی هاووڵاتی، بەتایبەتی مافی خاوەندارێتی، لە بەرامبەر دەوڵەتدا دەدا. بەمشێوەیە، مافە دادگاییەکان (قضائی) جێگەی زانستە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانی گرتەوە، دەبێت دان بەوەدا بنێین کە سەرکەوتنی بەڕاستی گەورە لەو بەشەدا بەدەستهات.

لە 1875 بەدواوە، **Obrigkeitsstaat** (دەوڵەتی دەسەڵاتەدار) - یان رەگەزی دەسەڵاتەداری - و

Rechtsstaat - یان ڕەگەزی یاسایی- کە مەبەست لێیان تەنیا بەرگریکردن لە مافی خاوەندارێتی بوو، خێرا زانستە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانی نابوت کرد. زانکۆکان مافناس پەروەردە دەکات بۆ بەرگریکردن لە مافی موڵکایەتی، مامۆستا پەروەردە دەکەن بۆ بڵاوکردنەوەی هونەرەکانو باشییەکانی نەژادی جێرمەن؛ تەکنیککارو تیۆریسیێن و مێژوونوس پەروەردە دەکەن؛ بەڵام چیتر زانای زانستە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکان پەروەردە ناکەن بۆ جیاککردنی کۆمەڵگاو سیاسەت. گەورەترین جیاوازی کە زانای سیاسی ڕووبەڕووی دەبووەوە، هەمان جیاوازی بنچینەیی لە ڕۆڵی پسپۆڕانی زانستە سیاسیو کۆمەڵایەتیەکان بوو.

ناتوانرێت ئەوە بنرخێنرێت کە ئەڵمانیە وڵاتە ـیهێنشتووەکان سەرچاوەی چ خزمەتێك بوون بۆ زانستە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکان. هەروەك پێشتر بە جەختکردنەوە وتم، سیفەتی ڕژێمی نازی هۆی کۆچکردنی زانایانی خاوەن دیدگای سیاسی و تیۆری لە بێخ و بنەوە جیاواز بوو. لەبەرئەوە، ناکرێت کۆچکردنی ئەوان لەگەڵ ڕاکردنی زانایانی یۆنانی لە ئیمپراتۆریەتی بیزانسی لە سەدەی پانزەهەمدا بەراورد بکرێت. زانایانی پەناهەندەی ئەورووپایی بە ئەندازەیەك لەگەڵ یەکدا جیاواز بوون کە دیاریکردنی وردی خزمەتەکانیان بەتایبەتی لە زانستە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکان -وە لە بەرامبەردا زانستە سروشتی و هەندێ جار بەشێك لە لقە تایبەتمەندەکان وەك مێژووی هونەرو مێژووی ئەدەبیات و هی تریش- نەستەمە. کارتێکردنیان ئەوەندە ناسك و ورد و پەرش و بڵاو بوو کە دیاریکردن و ئەندازەگرتنی بە هیچ شێوەیەك کارێکی ئاسان نییە.

جگە لەمانەش، هەتا پێش 1933، لە زانستە کۆمەڵایەتیەکاندا پەیوەستی دولایەنە لەنێوان ئەورووپاو ئەمەریکادا هەبوو. ڕۆشتنی کەسانێکی وەك ڕۆبەت میکیلس[33] و ویلفریدۆ پارەیتۆ و گایتانۆ مۆسکا[34] (بۆ ئەمەریکا) پەیوەندی بە کۆچەکانی دوای 1933وە نەبوو. گەشانەوەی قوتابخانەی "ڤیێنایی پۆزەتیڤیزمی لۆجیکی" لە ئەمەریکادا، بە ڕووکەش دوور لە گۆڕانکارییە سیاسییەکان لە ئەڵمانیاو نەمسادا ڕوویدا. بە ڕوانینی من، هیچ کام لەم دوو ڕەوتە سوودمەند نەبوون و هەردووکیان هاوکاری بەهێزکردنی مەیلی نامێژوویی (وە تەنانەت دژە مێژوو) و دژە تیۆریی لە زانستە کۆمەڵایەتیەکانی ئەمەریکادا کرد.

باوەڕی من و کەسانێك کە وەك من لە قوتابخانە فەلسەفی و مێژووییە گەورەکانی ئەورووپادا بە بار هاتوون ئەوەیە کە ئێمە دوو شتمان بۆ زانستە کۆمەڵایەتیەکان لە ئەمەریکادا زیادکردووە.

یەکەم و گرنگتر، جۆرێك لە گومانکاری بوو. من و زۆرێك لەوانی دی لەم خۆشبینیە سەیرەدا هاوبەش نین کە زانستە کۆمەڵایەتیەکان دەتوانێت بەزەبر جیهان بگۆڕێت. چاوەڕوانیەکانی ئێمە زۆر لەوە کەمترە، چونکە باوەڕمان وایە ئەو سنورەی کە پرۆسەی مێژوو بۆ زانستە کۆمەڵایەتیەکانی دروستدەکات، ناوچەیەکی چەندین جار بچوکتر (لەوەی بیری لێ دەکرێتەوە) دروست دەکات.

دووەم، تەقەلای ئێمە بۆ دانانی زانستە کۆمەڵایەتیەکان لەناو چوارچێوەیەکی تیۆریدا بوو. لە ڕوانینی زۆر لە ئێمەدا وا دەهاتە پێشچاو و هێشتا هەروا دێتە پێشچاو کە زیدەڕەوی لە گرنگی و مانای دراوە ئەزمونیە بەدەستهاتووەکان -لەچاو چوارچێوەی تیۆریدا- کراوەو، گرنگیدانی لە ڕادە بەدەر بە لێکۆڵینەوەی ئەزموونگەریانە، دیاریکردنی ماناو گرنگی مێژوویی مەسەلەکان دژوار دەکات و، پێداگرتن لەسەر پێویستی زانینی بڕێکی زۆر زانیاری[35]، کەم کەم لێکۆڵەرەوە دەگۆڕێت بە فەرمانبەرو؛ پێویستی بە پارەی زۆر بۆ دابین کردنی

خەرجیی ئەمجۆرە پرۆژانە، بە هیواشی وابەستەییەك بەدیدەهێنێت کە لە کۆتاییدا رۆڵی رۆشنبیر، بەپێی بۆچوونی من، دەخاتە مەترسیەوە.

دەشێت لە جەختکردنە سەر ئەم چوار مەترسیەدا زێدەڕۆیی کرابێت، بەڵام مەترسیەکە لە جێی خۆیدا هەر هەیە: زانایەکی پەنامەندە کە لە نەریتێکی تردا پێگەیشتووە، دەبێت بە سوود وەرگرتن لە زانینی مێژوویی خۆی و ئەو ئاگاییەی کە دەربارەی پەیوەندییە مێژووییەکانەوە هەیەتی، تا ئەو رادەیەی دەکرێت لەم مەترسیانە کەم بکاتەوە.

بەڵام خاڵێك کە لەوانەیە زیاتر گرنگی هەبێت ئەوەیە کە ئێمەش بەشی خۆمان بە بینینی ئەم سەرقاڵیەی زانایانی زانستە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانی ئەمەریکا، تێگەیشتوین کە لێکۆڵینەوە نابێت تەنها تیۆری و مێژوویی بێت و، ئەرکی زانای زانستە کۆمەڵایەتیەکان دروستکردنی پەیوەندیە لەنێوان تیۆرو کرداردا و، ئەم پەیوەندیەش پێویستی بە وردبوونەوەیە لە راستیە ناخۆشەکانی ژیان و شیکردنەوەیان. سوودێك کە من لە ولاتە یەککرتووەکانی ئەمەریکا دەستم کەوت هەمان تێگەیشتنی قووڵتر بوو بۆ ئەرکی زانای زانستە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکان.

زانایەکی ئەڵمانی کە بۆ دیدار دەگەڕێتەوە بۆ ئەڵمانیا، بێ ئاوارتن سەرنجی بۆ پێکدادانی گەورەی بیروباوەڕو بۆچوونەکان دەربارەی چاککردنی زانکۆکانی ئەو سەرزەمینە دەچێت. بە نزیکەیی هیچ کارێکی گرنگ بە مەبەستی چاککردنی ئەو روحەی باڵی بەسەر زانکۆکانی ئەڵمانیاو بونیادی دامەزراوەییان و گۆڕینی بەرنامەی وانەیی ئەنجام نەدراوە. مەودایەکی بەرین لەنێوان خوێندکاران و مامۆستایانی زانکۆ هێشتا هەر هەیە؛ هێشتا خوێندنی بەراستی گشتی (عام) لە زانستە مرۆییەکاندا بوونی نیەو، هێشتا زانستە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکان ئەمامێکی زۆر ناسك و تازە پێگەیشتووە. بەڵام ئەو کارە بچوکانەش کە ئەنجامدراوە، بەشێوەیەکی گشتی بە بەرەکەتی ئەو سەرمەشقەی کە پەنامەندە گەڕاوەکان و میوانە ئەمەریکاییەکانی تر داویانە = واتە بێ فیزی و گرنگیدان بە خوێندکاران و گرنگیدانی چەند جارێك زیاتر بە واقیعی سیاسی و کۆمەڵایەتی= بووەتە پراکتیك.

زانای گەڕاوە خۆی لە دۆخێکی سەیردا دەبینێت. لە ئەمەریکادا دەبێت لەگەڵ کەسانێکدا کە زیاد لە رادە نارەزووی لێکۆڵینەوەی ئەزموونگەریانە دەکەن خەبات بکات و جەخت لەسەر پێویستی لایەنی تیۆری و مێژوویی بکات؛ لە ئەڵمانیادا دەبێت بە ناچاری لایەنگری لێکۆڵینەوەی ئەزموونگەریانە بێت. گرنگی و پایەی راستەقینەی زانای ئەڵمانی کە رۆژگارێك لەبەر هۆکاری سیاسی ولاتی جێهێشتبوو، من ئەمڕۆ لەم رۆڵە دوانەییەدا دەبینمەوە.

## پەراوێزەکان

1-Plato, Republic, trans. F. M. Cornford, Book VI, Ch.22.

2-Plato, Crito, trans. B. Jowett.

3- Ovidius (بە ئینگلیزی Ovid) (43 پ.ز تا 17 ز.) شاعیری رۆمی کە بەهۆی نەزانراوەوە بە فرمانی ئۆگستۆس بۆ شارێك لە کەنار دەریای رەشدا دوورخرایەوەو بە ناچاری تا کاتی مەرگ هەر لەوێ مایەوە. (وەرگێڕ).

4-G.G. Coulton (1924). "The Death Penalty for Heresy from 1184 to 1921 A.D." Mediaeval Studies, No, XVIII. pp. 1-18.

5-"Civic Religion."

6- Leviathan . لە زاراوەی عیبری "لیڤیاتان". دێوەزمەیەکی دەریایی ئەفسانەییە کە لە تەورات و نووسینی مەسیحیەکاندا ناوی هاتووەو ئێمە لێرەدا بۆ ئاسانکردنی تێگەیشتنی ماناکەی بە "ئەمەنگ" ناومان هێناوە. یەکەمین کەس کە ئەم زاراوەیەی لە فەلسەفەی سیاسیدا بەکارهێنا فەیلەسوفی ئینگلیزی تۆماس هۆبز بوو کە کتێبێکی بەناوبانگی بەم ناوەوە نووسی و دەوڵەتی بە لیڤیاتان (یان "ئەمەنگ") چوواند، واتە

بوونەوەریك كە تواناى لە تاكەكان بالاترەو خەلكى ولات دەبێت بەپێى ویستى ئەو رەفتار بكەن. (وەرگێپ).

7— Huguenots ئەو ناوەى كە لە سەدەى شانزەهەمەوە لە پرۆتستانتەكانى فەرەنسا نرا. (وەرگێپ).

8-Inner emancipation.

9— Abbe Jean Meslier (1664— 1729) ناسراو بە قەشەى سوور، ئیلحاتى بوو پاشان پەیوەندى بە كلێساوە كرد. ماركس و كۆمۆنیستەكان چەندین جار دەربارەى بیروباوەرەكانى ئەو باس و لێكۆڵینەوەیان ئەنجامداوە. (وەرگێپ)

10— چاپى ئینگلیزى

Theodor Mommsen, Past and Present, Vol. I. No. 1, 1952, p. 71.

11— A. I. Herzen (1812—1870) نووسەرێكى رووسى كە بە هۆى چالاكى سیاسییەوە چەندین ساڵ بە ناچارى لە دەرەوەى ولات ژیانى بەسەر برد. (وەرگێپ)

12— Lord Byron (1788—1824) شاعیرى ئینگلیزى كە بەهۆى چەند مەسەلەیەكى تایبەتى و كۆمەلایەتى نیشتمانى جێهێشت و تا كۆتایى ژیانى هەرگیز نەگەرایەوە بۆ ئینگلتەرا. (وەرگێپ)

13— Julien Benda (1867—1956) فەیلەسوف و رەخنەگرى فەرەنسى و نووسەرى كتێبە بەناوبانگەكەى "خیانەتى رۆشنبیران" ە. (وەرگێپ)

14— تۆتالیتار: بەو رژێمانە دەوترێت كە دەولەت سەرپەرشتى هەموو چالاكییە ئابوورى و كۆمەلایەتییەكان بكات و دەسەلاتى سیاسى لە دەست یەك حیزبدا بێت و، نەهێشتنى هەموو جیاوازییەكى ئازادانەى كۆمەلگا بۆ حیزب و، سەركوتكردنى هەموو جۆرە نارەزاییەك و، نەهێشتنى ئازادى تاك. (وەرگێپ)

15-Hans Speier, "The Social Conditions of the Intellectual Exile". Social Order and the Risk of war, New York, pp. 86-94.

16— Woodrow Wilson (1856—1924) مامۆستاى ماف و ئابوورى سیاسى و پاشان سەرۆك كۆمارى ئەمەریكا.

(وەرگێپ)

17-Max Weber, Wissenschaft als Beruf (Scholarship as a Profession).

18— Wilhelm von Humboldt (1767—1835). زاناو سیاسەتمەدارى گەورەى ئەلمانى. (وەرگێپ)

19-Frederic Lilge, The Abuse of Learning.

20— پوچ (Putch) لە زمانى ئەلمانیدا بە مانای یاخیبوون و لە زاراوەى سەربازیدا بە مانای هێرشى لەناكاوەو لە دەقە سیاسییەكانیشدا بە مانای كودەتاى خێرایە.

21— ۆلفگانگ كاپ (W. Kapp) یەكێك لە سیاسەتمەدارە پارێزگارەكانى ئەلمانیا بوو كە لە 1920دا بە هاوكارى كۆمەلێك ئەفسەرى سوپا بە هێرشێكى برووسكە ئاسا بینا دەولەتییەكانى لە بەرلیندا داگیركردو خەریكبوو كاروبارى دەولەت بگرێتە دەست. بەلام ئەم كارەى ئەو بەهۆى بێبەرنامەیى و مانگرتنى گشتیى كرێكاران شكستى هێناو كاپ و هاورێكانى هەموو ناچار بوون هەلبێن. (وەرگێپ)

22— Fordism (بەناوى هەنرى فۆرد، خاوەن كارخانەى بەناوبانگى ئۆتۆمبێل سازى لە ئەمەریكا). مەبەستى سوود وەرگرتن لە شێوازە داهێنەرانەكەى فۆرد دروستكردنى زنجیرەى بەرهەمهێنان و فرەكردنى بەرهەم لە پیشەسازیدا. (وەرگێپ)

23— E.B.Condillac (1715—1780). فەیلەسوفی فەرەنسی و یەكێك لە پێشەواكانى قوتابخانەى رەسەنایەتى "حسى" یەكان. (وەرگێپ)

24— J. Dewey (1859—1952). فەیلەسوفی ئەمەریكى و یەكێك لە گرنگترین ئەندامانى قوتابخانەى رەسەنایەتى كار. (وەرگێپ)

25— A.N.Whitehead (1861—1947) فەیلەسوف و بیركارى ئینگلیزى. (وەرگێپ)

26-Categorical Imperative.

27— داتا (Data) : دراو

28— J. W. Burgess (1844—1931) مامۆستاى زانستە سیاسییەكان لە كۆلۆمبیا. (وەرگێپ)

29— K.W. von Rotteck (1775—1840) سیاسەتمەدارو مێژوونووسى ئەلمانى. (وەرگێپ)

30— K. T. Welcker (1790—1869) سیاسەتمەدارو زاناى ئەلمانى. (وەرگێپ)

31— J. K. Bluntschli (1808—1881) مافناس و كارگێرى دەولەتى سویسرى و یەكێك لە دامەزرێنەرانى دامەزراوى مافەكانى نێونەتەوەیى لە شارى گێنت. (وەرگێپ)

32— F.C.Dahlmann (1785—1860). سیاسەتمەدارو مێژوونووسى ئەلمانى و یەكێك لە نوسەرانى یاساى بنچینەیى ئەلمانیا لە 1848دا. (وەرگێپ)

33— R.Michels (1876—1936) ئابوورى ناس و كۆمەلناسى ئەلمانى. (وەرگێپ)

34— G.Mosca (1858— 1941) زاناى ئیتالى زانستە سیاسییەكان. (وەرگێپ)

35— زانیارى: داتە— Data

## سەرچاوە

آزادی و قدرت و قانون

فرانتس نویمان، ترجمه ء عزت الله فولادوند

دیماه 1373، شرکت سهامی انتشارات خوارزمی ص14— 38

# لە ئەدەبی گەلانەوە

• کوشتنی منداڵێک
ستیگ داگەرمان

• گۆشتی شۆر و خەیار
ستیگ داگەرمان

رادەوەستن، کە لەبەر خۆرەکەدا تیشک دەداتەوەو جیز لە بریقوباقو بۆنی بانزین و دەوەنەکە دەبینێت. هیچ سێبەرێک ناکەوێتە سەر ئۆتۆمبیلەکەو شاسپە ورەرشارەکەی ئۆتۆمبیلەکە نە هیچ قوپاوییەکی هەبەو نە بە خوێنیش سوورە.

بەلام لە هەمان کاتدا کە پیاوی نێو ئۆتۆمبیلەکە لە دیسی یەکەم دەرگاکەی لای چەپی خۆی بەرەدەدات و جۆکی سەیارەکە رادەکێشێتە دەرەوە، ژنەکەی دیسی سێیەم دەرگای دۆلابی چێشتخانەکە دەکاتەوەو هیچ شەکەرێک نادۆزێتەوە. منداڵەکە، کە دوگمەی ژێرکراسەکەی گرتبوو و تەبنانی قۆندەرەکانی گرێدابوو، لەسەر قەنەفەکە دانیشتبو و دەڕوانێتە رووبارەکە کە لە نێوان دەوەنەکان و بەلەمە رەشەکە کە لەنێو گیاکەدا سەروخوار کرابووەوە پێچدەخواتەوە. ئەو پیاوەی، کە منداڵەکەی لەدەستدەچێت، لە تەراشکردن بۆتەوەو یەکسەر ئەو کاتە ئاوێنەکە قەمچدەکات. کوپی قاوەکان، نانەکە، سەرشیرو مێشەکان بەسەر مێزەکەوەن. ئەوە تەنها شەکرە کە نوقسانەو دایکەکە بە منداڵەکەی دەڵێت راکات بۆ لای لاشۆن و هەندێ کلۆشەکەر قەرزبکات. کاتێک منداڵەکە دەرگاکە دەکاتەوە پیاوەکە لەدواوە بانگی لێ دەکات کە پەلە بکات، چونکە بەلەمەکە لە لێواری رووبارەکە چاوەڕوانەو ئەوان بە سەوڵلێدان هەندە دوور دەڕۆن کە پێشتر نەڕۆشتوونە. لەدواییدا کە منداڵەکە بەنێو باخچەکەدا رادەکات بەردەوام بیر لە رووبارەکەو بەلەمەکەو ماسییەکان کە شەڕ دەکەن دەکاتەوەو کەس ئەوە بەگوێیدا ناچرپێنێت، کە تەنها هەشت دەقەی لە ژیاندا ماوەو کە بەلەمەکە تا لەوێدا کەوتووە هەموو ئەو رۆژە و گەلێ رۆژی دیکەش دەکەوێت.

بۆ لای لاشۆن هەندە دوور نییە، تەنها راستەوخۆ بەرەبەری جادەکەوەیە، پاشان لە هەمان ئەو کاتەی منداڵەکە بە راکردن لە جادەکە دەپەڕێتەوە، ئۆتۆمبیلە شینە بچکۆلەکە دێتە نێو دێی دووەم. ئەو دێیە دێیەکی بچکۆلەیەو خانووەکانی بچووک و سوورن، مرۆڤی تازە لە خەو هەڵساو کە لیبە چێشتخانەکانیاندا دانیشتوون و کوپی قاوەکانیان بەرزکردۆتەوە وە ئۆتۆمبیلێک دەبینن بەدیوی ئەودیوی پەرژینەکەدا لەگەڵ تەپ و تۆزێکی بەرز بەدواوەیدا بەفرکان تێدەپەڕێ. ئۆتۆمبیلەکە گەلێک خێرا دەڕوات و پیاوەکەی نێو ئۆتۆمبیلەکە دار چنارەکان و ستوونی تەلەگرافە تازە بە قیر بۆیەکراوەکە تەنها وەکو تارماییەک بە تەنیشتیەوە تێپەڕدەبن، شنەبای هاوین بەنێو جامی بای سەیارەکەدا دێتە ژوورێ، ئەوان بەنێو دێکەدا فڕکە دەکەنە دەرەوە، چاک دڵنیان بەسەر رێگاکەدا دەڕۆن، ئەوان هێشتا بەتەواوی تەنهان بەسەر رێگاکەوە. ئەوەش گەلێک خۆشە کە بە تەواوی بەتەنها بەسەر رێگایەکی نەرم و پان بە ئۆتۆمبیلێک تێبپەڕی، دەشتاییەکەش تا دێت خۆشتر دەبێت. پیاوەکە بەختەوەر و بەهێزەو بە ئانیشکی قۆڵی راستی هەست بە لەشی ژنەکەی دەکات. ئەم پیاوە پیاوێکی بەد نییە. پیاوێکە پەلەیەتی بۆ سەردەریا. پیاوەکە ناتوانێ زەردەواڵەیەک ئازار بدات، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا هەر ئێستا منداڵێک دەکوژێت. لە هەمان کاتدا کە ژن و پیاوەکە بەرەو دێی سێیەم فرتە دەکەن، کیژەکە دووبارە چاوی دەنوقێنێ و ئەو بارییە دەکات کە پێش ئەوەی ئەوان بتوانن دەریا ببینن چاوی نەکاتەوە، کیژەکە لەگەڵ ریتمی چوونی بۆ ناو ئۆتۆمبیلەکە خەون بەوەوە دەبینێ کە دەریاکە دەبینێ کە دەبێت دەریاکە چەندێ روون بێت. لەبەرئەوەی ژیان هەندە بێسۆزانە بنیادنراوە کە دەقەیەک پێش ئەوەی پیاوێکی شادمان منداڵێک بکوژێت، کە هێشتاکانێ بەختەوەرەو دەقیقەیەک پێش ئەوەی ژنێک لە ترسانا هاوار بکات، دەتوانێ

جاو بلۆقێنێ و خەیاڵ بە دەربیساوە بپێچێ و دوا دەقە لە ژیانی منداڵێکدا کە دایک و باوکی ئەو منداڵە دەتوانن لە چێشتخانەکە دابنیشن و چاوەڕوانی شەکەر بن و لە بارەی دانە سپییەکانی منداڵەکەیان و سوپ‌خواردنەوە بە پەلەم بدوێن، خودی منداڵەکەش دەتوانێ چەپەرەکە پێوەدات و دەست بە پەڕینەوە بکات بەسەر جادەیەکدا لەگەڵ چەند کلۆشەکەرێکی پێچراوە لەنێو کاغەزی سپیدا لەنێو دەستی ڕاستیدا داینارە، هەموو ئەو دوا دەقەیە جگە لە ڕووبارێکی درێژی بریقەدار لەگەڵ ماسی گەورەداو بەلەمێکی پان لەگەڵ سەولێکی بێدەنگ زیاتر هیچ شتێکی تر نابیندرێ.

پاشان هەموو شتێ درەنگە، پاشان ئۆتۆمبیلێکی شین بەناپێکی لەسەر جادەکە وەستاوەو ژنێکی قیژەکەر دەستی لەسەر دەمی لادەبات و دەستەکە خوێنی لێدێت، پاشان پیاوێک دەرگای ئۆتۆمبیلەکە دەکاتەوەو لەگەڵ ئەوەشدا کونێکی گەورەی ترسێنەر لەناخیدایە هەوڵدەدات خۆی بەپێوە ڕابگرێت، پاشان هەندێ کلۆشەکەر بێمانایانە لەنێو خوێن و چەوەکەدا پەرش و بڵاوبوونەتەوەو منداڵێکیش بەسەر سکدا بێجوڵە کەوتووە، لەگەڵ دەموچاوێک کە زۆر بەتوندی لەسەر جادەکە شێلرابوو، پاشان دوو مرۆڤی بێڕەنگ دێن، کە هێشتاکە نەیانتوانیوە قاوەکانیان بخۆنەوە، بە ڕاکردن بەنێو چەپەرەکەدا دێن و تەماشایەکی ئەو ڕێگایە دەکەن کە هەرگیز لە یادیان ناچێتەوە. چونکە ئەوە ڕاست نییە کە کات هەموو برینێک سارێژ دەکات، کات برینی منداڵ کوشتنێک سارێژ ناکات و ئەوە گەلێک بە خراپی ئازاری دایکێک سارێژ دەکات، کە لەبیری چووبوو شەکەر بکڕێت و منداڵەکەی بۆ شەکەر قەرزکردن بەسەر جادەکەدا ڕەوانە دەکات وە بەهەمان شێوەی خراپیش پەشیمانی لەلای ئەو پیاوەی کە کوشتی کە جارێک لە جاران بەختەوەر بوو سارێژ دەکات.

چونکە ئەو کەسەی کە منداڵێکی کوشتووە ناچێت بۆ سەردەریا، ئەو کەسەی کە منداڵێکی بە ئۆتۆمبیل کوشتووە لەسەرخۆ و بە بێدەنگی بەرەو ماڵەوە دەڕواتەوە، ژنێکی لاڵ و دەست لەنێو دەست کلۆمدراویشی لە تەنیشتدایە، هەموو ئەو دێیانەی کە بەنێویاندا تێپەڕ دەبن تاکە مرۆڤێکی شادمان بەدی ناکەن، هەموو سێبەرەکان گەلێک تاریکن و کاتێکیش لە یەکتری جیادەبنەوە هێشتا هەر لەژێر بێدەنگیدان، ئەو پیاوەی کە منداڵەکەی کوشت دەزانێت ئەم بێدەنگییە دوژمنی ئەوە و پیاوەکە پێویستی بە ساڵەهای ساڵ دەبێت لە ژیانیدا بۆ ئەوەی بەسەر ئەو بێدەنگییەدا زاڵبێت بەوەی هاوار بکات کە ئەوە هەڵەی ئەو نەبوو. بەڵام پیاوەکە دەزانێ کە ئەوە درۆیە و شەوانە لەجیاتی ئەوە لە خەوەکانیا ئاواتی ئەوە دەخوازێ کە تەنها یەک دەقەی ژیانی بۆ بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی تا ئەو تەنها دەقەیە بەبارێکی تردا بەرێت.

بەڵام ژیان هەندە بێسۆزە بەرامبەر ئەوەی کە منداڵێکی کوشتووە کە هەموو شتێ دوای ئەوە درەنگە.

## پەراوێز

1- جخار "kyrkklocka" زەنگی گەورەی سەرکڵێسا.

2- ناڕەنار، گریانی بە ئەسپایی و لەسەرخۆ- مەحوی شاعیر دەڵێ

"گوتم ڕاستی سەبا مەستە، گوتی مەشرەب موخالیفە
گوتم ناری، گوتی بایە، گوتم نەرجس، گوتی دووڕە".

## سەرچاوە

لە کۆمەڵە چیرۆکی "باری شەوانە" وە وەرگێڕاوە.

# گۆشتی شۆڕو خەیار (*)

■ ستیگ داگەرمان

● و. لە سویدییەوە: عەبدوڵڵا قادر دانساز

ئەو کاتەی نۆ ساڵان بووم و ڕێی تێدەچێت ئەوە تەمەنێکی کەم بێت بۆ تەمەنی منێکی وەکو هەموو ئەو نۆساڵانەکانی تر کە بە ڕێگای قوتابخانەوە بەدەم چۆمێکی زەرداو و لێخنەوە ڕەتدەبووین، بەردمان لەو چۆمە دەگرت تاوەکو سەمۆڵە زەردەکە شەقیدەبرد، هاوینان، بەهاران و پایزان بەسەر ئاوەکەوە پێشبڕکێی تیـژڕەوی تەپەدۆر، دەنکە شقارتە و قابوغە شقارتەمان هەبوو. دەنکە شقارتەکان دەیانبردەوە، چونکە زۆربەی جار تەپەدۆرەکان و قاوغە شقارتەکان لەو تەنگەبەرییانەی نێوان بەردەکاندا گیریان دەخوارد. جارێکیان من و هاوڕێکانم دوو "چاونیۆن"(1)ی گەورەی قەڵەوی ناشرینمان دۆزییەوە کە بە زگەخشێ لەبن ئاوەکەوە ڕێیاندەکرد، هەڵمکێشانە دەرەوە خستیانمە نێو تویشەبەرەکەمەوە، بەڵام کەس نەیدەویست ئەوانە لە ماڵیاندا بێت. ئەوجا فڕێمدانەوە نێو چۆمەکە، بەو هیوایەی کە ئەوان بژین. ئەو سەردەمە هەردەم ئەژنۆکانمان داڕزابوون، قەتماغەی برینەکان هەردەم تازەو نەرم بوون و، زۆربەی جار کە لە سارپێژبوون نزیکدەبوونەوە ئۆتۆمبیلێکی ئارەقگرتنەوە بە ڕێگاکەوە دەهات ئیتر پیاو پێویستە خۆی پێوە هەڵواسێت یاوەکو داری بڕوای بەنێو یەکچوو کەوا لە چۆمەکەدا گردبووبوونەوە ئیتر پیاو پێویستە بەسەریاندا رابکات.

بەڵێ ڕێگای قوتابخانە پڕبوو لە سەرەڕۆیی، ڕێگای چوونە قوتابخانە هەندەی ڕێگای گەڕانەوە بۆ ماڵ دوور نەبوو. "خاوەن زەویوزارەکان" باخێکی لە دارسێوی هەبوو بە بەری کاڵ و کرچەوە. هەروەها ئەو خانووەی کە چۆلکرابوو و دواتریش بوو بە کلێسایەکی بێ خاچ، باڵندەکان بە تاریکی لەژێر سەربانەکەیەوە هەڵدەفڕین، خشتە سورکراوەکانی سەربانەکەی داتەپیبوونە نێو خانووەکەوەو سەر زەویەکەیان داپۆشیبوو، هەموو شتێ، پێپلیکانەکان،

دەرگاکان، چوارچێوەی پەنجەرە پستە پەسەت بەستراوەکان، بە شێوەیەکی وەها گەنیبوون کە لە هەمان کاتدا، هەم ترسی دەخستە بەرت، هەم ختختەی دەدای و هەمیشە دڵتی بەلای خۆیدا پەکێشدەکرد. هەروەها پەرێزنە رەشپۆشەکانی ناوچەکەش هەبوون کە بە رێگاوە بۆ کۆڵێتێکی سەر رێگاوە زۆربەی جار بە پەلە خۆیان لە نێوان دارەکانەوە نیشاندەدا هەرگیز بیر لەوە مەکەرەوە کە خەڵکی چەندە پیر بوون وەکو لەو سەردەمەدا بێگومان تەمەنی ناوەنجی دووسەد ساڵێك دەبوو. هەروەها شتێکیش هەبوو کە قەدەغە بوو، شتێلێك کەوا پیاو بە تەولوی دەربارەیانی نەدەزانی. لەگەڵ ئەوەشدا، بێئاگایەتی تەنها ئەفسانەیەك بوو، چونکە ژیان لەو سەردەمەدا پڕی بوو لە سیمبولی لیقاوی، بگرە هەموو شتێ کە پیاو دەیکرد دوو مەبەستی هەبوو: بەتەنها لەبەر خۆشی بەرد لە کیژان بدات ئەوا ئەوە دەکرا وەك شتێکی شەر راڤە بکرێت، جارێکیان کاغەزی کاغەزێنکردن بەجێما، کە نیوەیان باران دایپڕاندبوون لە هەورازێکا بە درێژایی دەم چۆمەکەوە دۆزییەوە، تەنها "مایە"ی شمارتی ماچە تارادەیەکی باش مابووەوە و ئەوەم چاك بە بیرا دێت کە چۆن ئەوانەی چاکبوون لەوانەی زیاتر فوازێ بوویبوون جوێکردەوە. کاتێك تەشتی جل شۆردنەکان لە ملەکانی دیار چۆمەکە قولپیسان دەدا ئەوەیان بەزمێکی ترسناك بوو، هەروەکو بڵێی ئەوە ژیانی لەوە زیاتر دووجا دەکردەوە لەوەی ئەو کاتە هەبوو، شقارتە دزین لە کەوانووە بە هێزم کارکردووەکان و پاشان لە پشت دیواری کادانێکدا لە تاریکایدا دایانگیرسێنی، ئەوەم بە بیردا دێتەوە کە جارێکیان هاوڕێیەکم بە تاقە یەك دەنکە شقارتە ئاگری بەردا لە قووتووە شقارتەیەکی پڕی دزراوەوە، پڕ لە دەنکە شقارتەی بەکارنەهێنراو، کاتێك ئەوە فیشەکەی کردو لە هەواکەدا گڕی سەندبوو هاوڕێکەم فڕێیداوە نێو چۆمەکەوە. بە بیرم دێتەوە کە منیش وا بۆی دەچووم ئەوە کوتامکارییە بەو شێوەیە تەنت بەفیڕۆ بدرێت لە کاتێکدا پیاو دزیبێتی. بەڵێ، پیاو هەرگیز هێندە بە رەوشت نەبوو وەك لەو سەردەمەدا بوو.

زۆربەی ئەوانەی کە سەرنجی بوون بیسانوانێت

زۆربەی جار لە رێگای چرپەچرپەوە دەهاتنە کایەوە لە داڵانەکانی قوتابخانەکە ترس چرنوکی لە یەکێ قایمدەکرد. لێرەدا زۆربەی جار پیاو لە چرپەچرپێکی تهێنیدا پەنجەی بۆ درێژدەکرا کە پیاو دەیتوانی لە دەمێکەوە بۆ دەمێکی کە بەدوای درێژەی ئەو شتە بکەوێت و هەرگیزیش نەیدەتوانی زانیاری دەربارەی ئەوەی ئەو شتە چی بوو بەچنگکەوێت، ئێستا بە خۆ ئەوە شتێکی ناوازە بوو. دەربارەی کەسێك کە کوڕێك بوو دەچپێنرا کە چیکنە[2] لە ماڵیاندا هەیە؛ یا وەکو یەکێکی کە لەوانە ئەو کچە لە ناوەندی وانەدا میزی کردۆتە خۆیەوە؛ لە ماوەی پشووەکە لە ژوورەوە گلدرایەوە و میزەکەی سڕییەوە. بەڵام هەرچی ئەو تاوانانەی کەوا من بە خۆم پێیان هەڵسابووم هەرگیز پێم نەزانی. بە رێگایێکی درێ پێنەکراوەوە هەموو ئەو هەواڵانە دەهاتن کە دەبوایە بە بێدەنگی بە گوێی ئێمەدا بکوترانایە. کوڕێك لە پۆلی چوارەمدا گیانەوەری ئەشکەنجە دابوو؛ بێگومان گوریەیەکی بەردابووە نێو قەفەزێکەوە کە چەند مارێکی تێدابوو، مامۆستا لە ماڵیان بنووەو سەرزەنشتیکردبوو. ئەو کوڕە ئەوکاتە پسانتۆلی درێژی لەپێ دەکرد لەگەڵ ئەوەشدا لە پۆلی چوارەم بوو و کوڕێکی باڵا بەرز و بە پێشا چەماوە بوو لەو دەوروپشتە بەتەنها دەخولایەوەو لە پشووەکاندا شەقی لە بەرد هەڵدەدا، ئەو داوەرەی کە لە جێگایەك لە جێگاکان لە ناخی ئێمەدا بوونی هەبوو سزای بە درێژیی ژیان دوورخرانەوەی بەسەریا دابوو. لە پشووەکاندا لەنێو سەوزەگیاکە رادەکشایم

# گۆشتی شۆڕو خەیار(*)

■ ستیگ داگەرمان

● و. لە سویدییەوە: عەبدوڵڵا قادر دانساز

ئەو کاتەی نۆ ساڵان بووم و ڕێی تێدەچێت ئەوە تەمەنێکی کەم بێت بۆ تەمەنی منێکی وەکو هەموو ئەو نۆساڵانەکانی تر کە بە ڕێگای قوتابخانەوە بەدەم چۆمێکی زەردلو و لێخنەوە ڕەتدەبووین، بەردمان لەو چۆمە دەگرت تاوەکو سەهۆڵە زەردەکە شەقیدەبرد، هاوینان، بەهاران و پاییزان بەسەر ئاوەکەوە پێشبڕکێی نیسترەوی تەپەدۆر، دەنکە شقارتە و قابوغە شقارتەمان هەبوو، دەنکە شقارتەکان دەیانبردەوە، چونکە زۆربەی جار تەپەدۆرەکان و قاوغە شقارتەکان لەو تەنگەبەرییانەی نێوان بەردەکاندا گیریان دەخوارد. جارێکیان من و هاورێکانم دوو "چاونیۆن"(1)ی گەورەی قەڵەوی ئاشوینمان دۆزییەوە کە بە زگەخشێ لەبن ئاوەکەوە ڕێیاندەکرد، هەڵمگێشانە دەرەوە خستیانمە نێو تویشەبەرەکەمەوە، بەڵام کەس نەیدەویست ئەوانە لە ماڵیاندا بێت. ئەوجا فڕێمدانەوە نێو چۆمەکە، بەو هیوایەی کە ئەوان بژین. ئەو سەردەمە هەردەم ئەژنۆکانمان داڕزابوون، قەتماغەی برینەکان هەردەم تازەو نەرم بوون و، زۆربەی جار کە لە سارێژبوون نزیکدەبوونەوە ئۆتۆمبیلێکی ئارەقکردنەوە بە ڕێگاکەوە دەهات ئیتر پیاو پێویستە خۆی پێوە هەڵواسێت یاوەکو داری برواى بەنێو یەکچوو کەوا لە چۆمەکەدا گردبووبوونەوە ئیتر پیاو پێویستە بەسەریاندا رابکات.

بەڵێ ڕێگای قوتابخانە پڕبیبوو لە سەرەڕۆیی، ڕێگای چوونە قوتابخانە هەندەی ڕێگای گەڕانەوە بۆ ماڵ دوور نەبوو. "خاوەن زەویوزارەکان" باخێکی لە دارسێوی هەبوو بە بەری کاڵ و کرچەوە. هەروەها ئەو خانووەی کە چۆلکرابوو و دواتریش بوو بە کلێسایەکی بێ خاچ، باڵندەکان بە تاریکی لەژێر سەربانەکەیەوە هەڵدەفڕین، خشتە سورکراوەکانی سەربانەکەی داتەپیبوونە نێو خانووەکەوەو سەر زەویەکەیان داپۆشیبوو، هەموو شتێ، پێپلیکانەکان،

دەرگاکان، چوارچێوەی پەنجەرە بە پەت بەستراوەکان، بە شێوەیەکی وەها گەنیبوون کە لە هەمان کاتدا، هەم ترسی دەخستە بەرت، هەم ختختەی دەدای و هەمیشە دڵتی بەلای خۆیدا بەکێشدەکرد. هەروەها پیرێژنە رەشپۆشەکانی ناوچەکەش هەبوون کە بە رێگاوە بۆ کۆلیتێکی سەر رێگاوە زۆربەی جار بە پەلە خۆیان لە نێوان دارەکانەوە نیشاندەدا. هەرگیز بیر لەوە مەکەرەوە کە خەڵکی چەندە پیر بوون وەکو لەو سەردەمەدا: بێگومان تەمەنی ناوەنجی دووسەد ساڵێك دەبوو. هەروەها شتێکیش هەبوو کە قەدەغە بوو، شتێلێك کەوا پیاو بە تەواوی دەربارەیانی نەدەزانی. لەگەڵ ئەوەشدا، بێئاگایەتی تەنها ئەفسانەیەك بوو، چونکە ژیان لەو سەردەمەدا پڕی بوو لە سیمبولی لیقاوی، بگرە هەموو شتێ کە پیاو دەیکرد دوو مەبەستی هەبوو: بەتەنها لەبەر خۆشی بەرد لە کیژان بدات ئەوا ئەوە دەکرا وەك شتێکی تر راڤە بکرێت، جارێکیان کاغەزی کاغەزێنکردن بەجێماو، کە نیوەیان باران دایپزاندبوون لە هەورازێکا بە درێژایی دەم چۆمەکەوە دۆزییەوە، تەنها "مایە"ی شازنی ماچە تارادەیەکی باش مابووەوە و ئەوەم چاك بە بیرا دێت کە چۆن ئەوانەی چاکبوون لەوانەی زیاتر فرازێ بووبوون جوێکردەوە. کاتێك تەشتی جل شۆردنەکان لە ملەکانی دیار چۆمەکە قوڵپیان دەدا ئەوەیان بەزمێکی ترسناك بوو، هەروەکو بڵێی ئەوە ژیانی لەوە زیاتر دووجا دەکردەوە لەوەی ئەو کاتە هەبوو، شقارتە دزین لە کووانووە بە هێزم کارکردووەکان و پاشان لە پشت دیواری کادانێکدا لە تاریکاییدا دایانگیرسێنی. ئەوەم بەبیردا دێتەوە کە جارێکیان هاوڕێیەکم بە تاقە یەك دەنکە شقارتە ئاگری بەردا لە قووتوە شقارتەیەکی پڕی دزراوەوە، پڕ لە دەنکە شقارتەی بەکارنەهێنراو و، کاتێك ئەوە فیشکەی کرد و لە هەواکەدا گڕی سەندبوو هاوڕێکەم فڕێیداوە نێو چۆمەکەوە. بەبیرم دێتەوە کە من وا بۆی دەچووم ئەوە گوناهکارییە بەو شێوەیە شت بەفیڕۆ بدرێت لە کاتێکدا پیاو دزیبێتی. بەڵێ، پیاو هەرگیز هەندە بە ڕەوشت نەبوو وەك لەو سەردەمەدا بوو.

زۆربەی ئەوانەی کە سەنگین بوون بیانزانیت زۆربەی جار لە رێگای چرپەچرپەوە دەهاتنە کایەوە. لە داڵانەکانی قوتابخانەکە ترس چرنوکی لە یەکێ قایمدەکرد. لێرەدا زۆربەی جار پیاو لە چرپەچرپێکی نهێنیدا پەنجەی بۆ درێژدەکرا کە پیاو دەیتوانی لە دەمێکەوە بۆ دەمێکی کە بەدوای درێژەی ئەو شتە بکەوێت و هەرگیزیش نەیدەتوانی زانیاری دەربارەی ئەوەی ئەو شتە چی بوو بەچنگکەوێت، ئێخۆ بەخوا ئەوە شتێکی ناوازە بوو. دەربارەی کەسێك کە کوڕێك بوو دەچپێنرا کە چیکنە[2] لە ماڵیاندا هەیە، یا وەکو یەکێکی کە لەوانە ئەو کچە لە ناوەندی وانەدا میزی کردۆتە خۆیەوەو، لە ماوەی پشووەکە لە ژوورەوە گلدرایەوە و میزەکەی سڕییەوە. بەڵام هەرچی ئەو تاوانانەی کەوا من بەخۆم پێیان هەڵسابووم هەرگیز پێم نەزانی. بە رێگایلێکی درك پێنەکراوەوە هەموو ئەو هەواڵانە دەهاتن کە دەبوایە بە بێدەنگی بە گوێی ئێمەدا بگووترانایە. کوڕێك لە پۆلی چوارەمدا گیانەوەری ئەشکەنجە دابوو، بێگومان گوربەیەکی بەردابووە نێو قەفەزێکەوە کە چەند مامرێکی تێدابوو، مامۆستا لە ماڵیان بووەو سەرزەنشتیکردبوو. ئەو کوڕە ئەوکاتە پانتۆڵی درێژی لەپێ دەکرد لەگەڵ ئەوەشدا لە پۆلی چوارەم بوو و کوڕێکی باڵا بەرز و بە پێشا چەماوە بوو لەو دەورووپشتە بەتەنها دەخولایەوەو لە پشووەکاندا شەقی لە بەرد هەڵدەدا، ئەو دادوەرەی کە لە جێگایەك لە جێگاکان لە ناخی ئێمەدا بوونی هەبوو سزای بەدرێژیی ژیان دوورخرانەوەی بەسەریا دابوو. لە پشووەکاندا لەنێو سەوزەگیاکە رادەکشاین

گەلووزەکان[3]مان هەتاوەکو دەگەیشت بە ناوەوەی بە ناوکەکەی بە قەپ دەهانجان یا وەکو بە شەق لە تۆپێکی تێنسی لەکارکەوتوو بدەیت و بەنێو کونێکی نێو دیواری قوتابخانەکەوە رەتیبکەی. هەروەها منیش هەرچەندە ستۆکهۆلمیش بووم، جارێکیان لەو قارەمانێتیەدا سەرکەوتنم بەدەستهێنا. هەرچی کچەکانیش بوو بە کۆمەڵ بە تەنیشت رێگای تەنیشت قوتابخانەکە دەوەستان، سنووری نێوانمان وەك هیچ شتێکی تر نەبوو گەلێك رەق و جێگیر بوو.

باس لە دادوەرەکەی ناخی ئێمە هاتە ناوانەوە سیڤەرد، ئەو کوڕە گیانلەبەر ئەشکەنجەدەرەکە لە یەکێ لە پشووەکاندا، لەلایەن مامۆستاوە فەرمانی بەسەرا درا کە بە شەق هەڵدان لە بەردەکانی حەوشەکەدا پێڵاوەکانی نەدڕێنێت. ئەو پێڵاوانە هی قایمقامیەت بوون چونکە خێزانەکەیان هەژار بوو. کاتێك مامۆستا رۆشت ئەوجا ئەو دەمەلاسکەیەکی دڕندانەی لەدوای مامۆستا کرد.

ئەوکاتە کوڕێك کەوا بە دزەکە ناومان دەبرد، چونکە ئەوە بڵاوبووبووەوە کەوا ئەو لە وانەی جوملاستیکدا چاوێلکەی دارتاشەکەی دزیبوو، رایکرد بۆ بەردەم مامۆستا. راوەستا و هاواری کرد.

"مامۆستا سیڤەرد دەمەلاسکێ لە مامۆستا دەکات!"

ئەوجا مامۆستا گەڕایەوە دواوەو سیڤەردی بە سوقانەکانی گۆناکانیەوە هەندە بەرزکردەوە چاوەکانی سیڤەرد هاتنە ئاستی چاوەکانی مامۆستاوە بۆ جووتە دەقیقەیەك بێدەنگ وەستان. پاشان مامۆستا سیڤەردی داگرتە سەر زەوی و ئیتر ئەوێی بەجێهێشت و بەرەو ژوور رۆشت بۆ قوتابخانە. ئەوجا سیڤەرد جارێکی تر دەمەلاسکێی بۆ کرد و ئەمجارەیان زۆر ناشرینتر. بەڵام پێش ئەوەی دزەکە فریای هاوارکردن بکەوێت یەکێك لە ئێمە دەستی خستبووە بان دەمی و دەمی قەپاتکرد. ئەوە شتێك بوو بە ئێمەی ووت ئەوا ئیتر ئەوە بەسێتی. لەگەڵ خشتەی سزاکانماندا گەلێك وردبین بووین، دزی کردن لە بەرامبەر ئەشکەنجەدانی گیانلەبەران هیچ نەبوو. جارێکیان دزەکە لەبەر تەختەڕەشەکە راوەستابوو ئەوجا مامۆستا دەستی خستە گیرفانەکانی دزەکەوە کە پڕبوو لە تەباشیر. کاتێك وانەکە کۆتایی پێهات دزەکە گلدرایەوە، بە واقوڕماوی و ترسەوە لە خوار پێپلیکانەکانی قوتابخانەکە چاوەڕوانی بووین. بەڵام کاتێك ئەو هات هەستمان بەوە دەکرد شتێك لەلای ئەو جیاواز بوو: بۆنێك، شێوەیەك لە رۆشتن، میتۆدێکی تفکردن؟ و وەك کاری هەمیشەییمان لەکاتێکدا رووبەڕووی نەناسراو دەبووینەوە دوژمنانە بە ساردی بێدەنگ دەبووین لەگەڵ ئەوەشدا دزەکە بە شادمانییەوە بەرەو رووی ئێمە گومەتەی دەکرد.

"تەباشیرەکانیان لێم نەسەندەوە. مامۆستا تەنها قژی راکێشام. ئەو کرامباوگایە. مامۆستا وتی، لە دەمبوزێکەوە دەستپێدەکات و بە تاسێکی زیوین کۆتایی پێدێت. بەڵام تەباشیرەکانم لێ نەسێندراوە".

ئەوە یەکەمین جار بوو ئێمە گوێمان لە گەشتی دزی بێت لەو چوار سەد جارەی کەی کە دواتر لە قوتابخانە گوێمان لێبوو. بەڵام بێگومان دزەکە ترسی لێ نیشتبوو چونکە وا دەهاتە پێشچاو کەوا ئێمە دەمانەوێ شەڕی لەگەڵ بکەین. ئەوجا ئەو لەپێش ئێمەوە دەڕۆشت، دەستەیەکی ئێجگار گەورە بووین، بەرەو دیوی پشت قوتابخانە سوورەکە دەچووین و وەك ئەوەی بڵێیت ماوەی نێوانی ئەو و ئێمە پڕ بوو لە بێزکردنەوەمان. لەوێ قادرمەیەکی لە پلێت دروستکراوی لێبوو کە بەرەو سەری سەریانەکە بڵند بووبووەوە، چونکە بای دەهات دەشەکایەوە.

ئەوکاتەی دزەکە چەند پلەیەکیش سەرکەوتبووە سەرەوە هاواری کرد: "مەرج دەکەم کە

سەرنەکەومە سەرەوەو خاچێک لەسەر پشتەکە بکێشم".

هەندێک لە ئێمە هاواری کرد: "گوڕە مەلێنێت".

پاشان بۆ خۆمان لەنێو گێلەکە دانیشتین و دوای گەشتە سەرەوەو زووە ئاڵمبارەکەی کەوتین، ئە ئەوەی سەنگێکی چکۆلانەی لەو بە هەمان شێوە جسگر، وەکو قەبی لە پلەی قالرمەکە قایمدەکرد، هەرچەندە زیاتر سەرەوەکەوت توکوتیژتر دەڕۆشت، ئیتر ئێمە تێگەشتبووین لەوەی ئەو زۆر دەترسا. ئەوە زیاتر بەرەو سەرەوە چووتەی زۆر لەسەرخۆ بریبوو بەو هیوایەی کە زەنگەکە لێبترێت. ئێستاکە ئەکە بە گوێرەکی زیاتر هەڵیکرابوو و قالرمەکەشی ڕاکەوەشاند پێش ئەوەی هاوارمان لێبکرد وا مامۆستا هات ڕێگەمان پێدابوو سێ لەسەر چواری قالرمەکە هەڵگرتنە سەرەوە و، سێ لەسەر چواری ئەوەش سزایەک بوو بۆ ئەو شتەی کە کردبووی.

پاش ئەوە هەموو شتێ چووە بارێکی ئاساییەوە، ڕێگەی پێنەدرا لە پشووی نانخواردنی بەیانیاندا لە ـ ماڵەکەدا لەسەر تەختەکەی ئێمە دابنیشێت و وەکو ئێمەی ئەولی تر نانوکەرەکەی بخوات. لەسەر تەختەیەکی تردا کچەکان دادەنیشتن، ئێمە کاغەزی نانوکەرەکانمان بۆ ئەوی توڕدەدا. تەنها سیفەرد هیچ جێگەیەکی نەبوو لێی دانیشێت، زۆربەی کات لەبەر پەنجەرەکە دەوەستا و بە قەڵەمی ڕەش وێنەی سەیر سەیری لەسەر جوارچێوە سپییەکەی پەنجەرەکە دەکێشا. کاتێک ئەو دەچووە دەرەوە بۆ نێو حەوشەکە و بەردی دەگرتە تریستۆلا[4] کانی ئەلیی[4] مکە هەمووماں دەچووینە بەر پەنجەرەکە و تەماشای ئەو شتەمان دەکرد کە ئەو کێشابووی. هەمیشە پڕ لە جۆرە تووڕەبوونێکی بێ هاوتا ئۆتمان دەخواست کە مامۆستا بهاتبایەو ببینێ سیفەرد چی کردووە.

هەردەم لە پشووەکانی نانی بەیانیدا من و هاوڕێکەم پێکەوە دادەنیشتین، باوکی ئەو باخەوان بوو و لەوانەشە هەر لەبەر ئەو هۆیە بێت کە ئەو هەردەم خەیار بەسەر نانوکەرەکەیدا بوو، قیزی لە خەیار دەکردەوە، بەڵام لە ماڵەوە دەترسا لە بارەی ئەو شتەوە قسە بکات. هەندێ جار بۆ سەر نانوکەرەکەم گۆشتی شۆرم پێدەدرا، ماڵەوەمان لەو باوەڕەدا بوون کە باشترین شت لای من ئەوە گۆشتی شۆرە کە من دەیزانم تەنها لەبەرئەوەی لەو کاتەی لە ستۆکهۆڵم بووم ئەوەم پێدەدرا، بەڵام کەس بەوەی نەدەزانی کەوا من بەوە ڕاهاتبووم لەوێدا پارچە گۆشتە شۆرەکان بخەمە نێو یەکێ لە مێزە چۆڵەکانی پۆلەکەوە. بێگومان ئێمە دەمانتوانی ئاڵوگۆڕ بکەین. بەڵام لە هەمان کاتدا نە من حەزم لە خەیار بوو، نە هاوڕێکەشم حەزی لە گۆشتی شۆر بوو. بۆیەکە هەردووکمان هاتینە سەر ئەو ڕایەی قاشە خەیارو گۆشتە شۆرەکان لەسەرخۆ فڕێبدەینە پشتی ئەو مێزەی کەوتبووە قەد دیوارەکەوە و قاشەکان هەتا سەرزەوییەکە بەردەبوونەوە خوارەوە. سەرتاپای پایزو سەرتاپای ئەو زستانە خەیارو گۆشتی شۆرمان فڕێدەدایە پشت مێزی نانی بەیانییەوەو لە ڕێگای گەڕانەوەماندا لە قوتابخانەوە بەرەو ماڵ هەردەم فەنتازیای ئەوەمان دەکرد ئەگەر بێتو ئێمە مێزەکە بجوولێنینەوە دەبێت چۆن ڕووبارێک لە گۆشتی شۆرو خەیار بەسەر زەوییەکەدا ڕێبکات و هەموو قوتابخانەکە نوقم بکات. بەڵام هەرگیز نەماندەوێرا جێگۆڕکێ بەوان بکەین و هەردەم هەوڵی ئەوەمان دەدا جێگای تازە لە پشتی مێزەکە بدۆزینەوە بۆ ئەوەی شتی زیادەی سەر نانوکەرەکانمانی بەسەردا فڕێبدەین بەو شێوەیەی بارگرانییەکە بە هاوسەنگترین شێوە بێت کە دەکرێت.

ئیتر ئەو شتە ڕوویدا کە ڕۆژی خۆی هات و نۆرەی من بوو لە دوای هەمووان‌دا بمێنمەوە و هەوای

بۆلەكــە بگــۆرێمو تەختەســرەكە بنــەكێنم و تەختەڕەشـەكە بسڕمەوە. تووشـى ئارەزوويـەكى وەحشەتناكى ئەو شتە بووم كە سەيرى ئـەوە بكـەم كە ئايا پشتى مێزەكـەمان چۆن دەهاتە پێشچاو. لەكاتێكدا بیرم لەو چاوپێكەوتنە دەكردەوە كە بەرەو رووم دەبێتـەوە لـە رادە بـەدەر زیاتر دڵم بریبوو لـە مێلنجكردن و لەكاتێكدا گەلێك جار بـەڕێوە بووم بـۆ دەرەوە بۆ نێـو دالانەكـە فیكـەم لێدەدا و دەگەڕامـە دواوە. بـۆ ئـەوەی چكێـك ئـەو بەیەكلاكردنەوەیـە دوابخەم بە تەباشیر نیشانم گرتبوو لە مێزی مامۆستا لە پۆلەكەدلو "گوستاف ئـادۆلف"[6]ی قەڵـەو كە بە دیوارەكـەوەترابوو و، هـەروەها بـەنێو ژوورەكـەدا هـاتوچۆم دەكـردو قزولییانــە ســەرمێزی كچــەكانم هەڵدەدایـەوەو شتم لـەنێو شتەكانیاندا هـەڵدەگرت، قـزولی و لەهـەمان كاتیشـدا سـەرپەرزیش بــەوەی نـەتوانیت دزی بكـەیت. بـەڵام لـە كۆتـاییدا پێویسـتە هـەر بـڕۆم بــەلای مێزەكــەوە لەگــەڵ ئەوەشــدا نەمدەتوانی بەرگەی ئەوە بگـرم. بگـرە مێزەكـەم بـۆ دوور لە دیوارەكە توورڕلوە لاوەو چاوەڕوانی بیسـتنی ئـەو دەنگە كپـەی هەرەسـی گۆشتی شۆڕو خـەیار بووم. بەڵام تەنانەت چركەیەكی چكۆلانەش چییـە لـە هـەموو خـانووە تاریكەكـەوە نـەهات، لەسـەر ئـەژنۆ دانیشـتم دەسـتم بـە هـەر هـەموو دیوارەكـەدا گـێڕاو چاوەڕوانی ئەوە بووم بەدەستا هەڵبخلیسكێم كـەچی لەوێدا تەنـها دارە رووتوقوتەكـە بوونـی هـەبوو. هیـچ پارچەیـــەك لـــە ســـەرتۆی نانوكەرەكـــەمان لەو پشتەدا نەبوو.

بۆ بـەیانی رۆژی دوایـی بـەبێ ئـەوەی كـەس لـە ماڵەوە ئەوە ببینێ كیسەیەكی چكۆلانەی زیـادەم پـڕ كرد لە گۆشتی شۆڕ، لـەنێو ئەوانـەدا بـەلای كەمـەوە دە پارچە گۆشتێكی تیادا هەبوو و، لە پشـووی نـانی بەیانیدا بەقەد هەموو دیوارەكەدا بەرمدانە خـوارەوە. پاشان كـاتێك كـە لـە هـەموو قوتابخانەكـەدا بەتـەنیا بـووم و لـە پشـت مـێزی مامۆستا دانیشـتبووم و وام نیشـاندەدا ئـەوە تاقیكردنەوەیـە، چرای بنمیچەكـەم كوژانبـووەوەو بۆنــی گوڵــەكانی تاقیكردنەوەكــەم دەكـرد ئەوانـەی من و هاوڕێكـەم راهـاتبووین لـەنێو دارستـانەكە كۆیانبكەینـــەوە، لـــەپڕێكدا لـــەنێو دالانەكـەوە گوێم لە هـەنگاونانێكی خـێرا بـوو. لـە ترساندا رەپبووم چونكە لەو بـاوەڕەدا بـووم شتێكی رێپێنـەدراوم كـردووە بـــەوەی لـە پشـت مێزەكــەی مامۆستا دانیشتبووم. بەڵام هـەنگاوەكان لە دەرەوە وەستا، لەبـەر خـاتری ئـەوەی ئەگـەر بێتـو كەسـێك بهاتبایەتـە ژوورەوە، بـە هێمـن بوونـەوە هەسـتامە سەرپێ و وام نیشاندەدا تەختەڕەشـەكە دەسڕمەوە. ئەوجا گوێم لێ بوو چۆن مێزەكەی نانخواردنی بـەیانی لابرا، بە زەوییەكەدا كێرەی دەهات و لە دواییدا پـاڵی پێوەنرا بـۆ جێگاكـەی خـۆی جـیرەی لێـوە هـات. كەسـێك لـــە دەرەوە چـــووە بـــەر پەنجەرەكـــەی دالانەكەوە، تەنانەت لـەپاش ئـەوەی بـەبێ جووڵـەش راوەستابوو خزە لە چەكمەكانییـەوە دەهـات. ئـەوجا چرای ژوورەكەم هەڵكرد و رامكردە بەردەم دەرگاكەو لەوكاتەی دەرگاكەم والاكـرد لـەو گـوڕزە رووناكییـەی لە دەرەوە دەیدا لە تاریكایی دالانەكە سیفەرتم بینـی بـە خۆچەماوەیی لـەوێدا راوەسـتاوەو لـەنێو لـەپیدا گۆشتی شۆڕو خـەیار دەخـوات، بـە ئـەوس و بەسـەر جوڵاندنەوەیەكی دڕندانەی وەهای وەكو چۆن سەگێك قەپ لە گۆشـتێك دەگرێت. هـەموو ئـەو شتانەی لـە ماوەی زستاندا لە ئـاخمدا كۆببوونـەوە: ئـارەزووی شاراوە، هزری چەپێنرلو، دركـكردن بـە بێدەسـەڵاتی، ئێرەیی بـردن بــە شــارەزابوون، تــاوانی بــە نیــوە هۆشیارییەوە، زۆر بە توندی پەسـتانی خستبووە سـەر نـاوەرۆكی منـەوە تـا ئـەو رادەیـەی پێویستە هاوار بكەم:

"ئەی دزی كرامباوگا، ئەی دزی كرامباوگا، ئـەی دزی كرامباوگا!"

پاشان بەنێو تاریکاریی داڵانەکەوە بۆ سەر پێپلیکانەکە راماکردو سیڤەرد کەوت لەنێو بەفرەکەدا تەقلەی لێدەدا، من گورج بەسەر ئەوەوە بووم و زرانیەکانم چەقاندە هەردوو لاشانیەوە. ئەو کورانەی تۆپەڵە بەفریان دەگرتە کونی دیواری ژێرزەمینەکە بەنێو بەفرەکەدا بە تەپەتەپ بە هەنگاوی قورس بەرەو ئێمە هاتن. من شێتانە هاوارم دەکرد:

—دزی کردووە، دزی لە من و ئینگێ کردووە.

پێکەوە لەشە درێژو لاوازەکەیمان وەرچەرخاندە سەرپشت، یەکێک بە چاکی لەسەر قاچەکانی دانیشت و قەیتانە چەرمینەکانی لە چەکمەکانیەوە دەرکردو توڕیدانە نێو بەفرەکەوە، یەکێکی کە قۆڵەکانی بەرزکردەوەو رێگەی بە بەفری تازە دا بیبێژرێنە سەر پشتی، یەکێک بە دەستی پەتی دەستی بەسەر سینگی رووتیدا دەگەڕاند، خۆم دوگمەی بلوزەکەیم ترازاندو بەفرم ئاخنییە پشتیەوەو هەرچەندێ پێمکرا دەستم بیەم دەستم بەرەو خوارتر دەبرد. دووبارە چاوەکانی بە بەفر دیوارکراو دەمیشی بە بەفر سواقدرا. لەپڕێکا، هەروەک بلێی ملکەچی جۆرە هێمایەکی نهێنیمان کردبێت، دەستمان بە راکردن کردو ئەومان بە تەنیایی بەجێهێشت. بە هەڵچوویی بە راکردن گەڕامەوە نێو قوتابخانەکە، سەرمام بوو لەگەڵ ئەوەشدا گەرمام بوو، پارچە خەیارو گۆشتە شۆرەکان لەسەر زەوی داڵانەکە کەوتبوون. پەنجەرەیەکم کردەوەو هەستم بەو سەرما قورباقە ئاسایانەی گۆشتی شۆر و خەیارەکانی نێو دەستم دەکرد، بە بێزکردنەوەیەکی باس نەکراو توڕمدانە دەرەوە بۆ نێو بەفرەکە.

پاشان بەنێو دەرگای پۆلەکەوە چوومە ژوورەوە، سەرمام بوو لەگەڵ ئەوەشدا گەرمام بوو. پەستانێکی لەوەوپێش نەناسیاو لە ناخمدا کاریدەکرد، هەستم بەوە دەکرد کە من لەسەرخۆ لەناوەوە بتەقێمەوە، بە هەموو لایەکدا بەنێو ژوورەکەدا دەخولامەوەو دەمکێشا بە سەرقاپی هەموو مێزەکانداو دەمویست بزانم چی بکەم، بەڵام جگە لەوەی لە پشت مێزی گەورەترین کچدا دابنیشم و بە پارچە تەباشیرێك هێمایەکی بێ ئابڕویانە لەسەر دیوی ژێرەوەی سەر مێزەکە بکێشم هیچ شتێکی تری کەم بەخەیاڵدا نەهات.

بەڵام لە کۆتاییدا داوەرەکەی ناخی من کە دەبێ تەمەنی لە نۆ ساڵان زیاتر بووبێت پێی وتم چەند ترسنۆکانە رەفتارم کردووە، ئایا بردنی ئەو شتەی ئێمە فڕێماندا وە دزیکردنە؟ هێشتاکە گوێنەدەرانە بەڵام لەسەرخۆ داوەشیوانە چراکانم کوژاندەوەو رۆشتم. قەیتانی چەکمەکانی سیڤەردم لە کلیلە بەفریکدا دۆزییەوەو خستیانمە گیرفانمەوە. لە رێگای بەرەو ماڵ گەڕانەوە بە پەلە دەچووم بۆئەوەی لە تەنیایی لەوە زیاتر لەگەڵ داوەرەکەمدا رزگارم بێت. ئەوکاتە ئەو شتە هاتە پێشم کە لەپڕێکا سیڤەرد ببینم، ئەو لەمبەری رێگاکەوە شەقی لە پارچە سەهۆڵێك دەدا بۆ ئەوبەری رێگاکە.

هاوارمکردو دام بە شانیدا "ماندوو نەبیت".

ئەوجا ئەو پەڕییەوە بۆ لای چەپ وە لەکاتێکدا کە دەڕۆشت نیگای شۆڕکردبووە سەر ئاوڕێژی قەراغی رێگەی گوندەکە. بەڵام من کە دەمویست هەموو شتێ دووبارە چاکبکەمەوە بە تەواوی بە تەنیشتی ئەوەوە دەڕۆشتم و وتم:

"سیڤەرت، ئایا نانوکەرەیەکت دەوێت؟"

ئەوجا ئەو بەبێ ئەوەی وا نیشانبدات کە من دەبینێت پەڕییەوە بۆ لای راست.

دووبارە من وتمەوە: "ئایا نانوکەرەیەکت ناوێت"، بەڵام هیچ وەڵامێك نەبوو.

لە نائومێدیما بۆ ئەو تاقانە کەسەی لەتوانایدا بوو لە شەرمەزاریم بۆ ئەو شتەی کە کردوومە رزگارم

بکات –ئەوکاتە لەو باوەڕەدا بووم کە ئەوە شتێکی هەتاهەتایی بێت– ئەو نەیەوێت یارمەتیم بدات. بە فورسی خۆم هەڵواسی بەوا و هەموو ئەو شتانەی کە لە ناخمدا بوون بەسەر ئەودا هەڵمڕشت. هەمووشی بەو هیوایەوە لە کۆتاییدا گوێم لێی بێت، هاوار بکات: برۆ ملت بشکێنە! ئێخۆ من بەلای کەمەوە خۆم بڵێم: دەمەوێت دووبارە هەموو شتێ چاکبکەمەوە، بەڵام ئەو داوام لێدەکات برۆم و ملم بشکێنم!

بەڵام ئەو لەو شوێنەدا رێگای پێدابووم خۆمی پیا هەڵواسم و هەرچییەکیشم دەوێت هەڵیڕێژم. ئەوجا ئەوم بە تەقڵە فرێداوە نێو بەفری سەر کەناری جادەکەوە بەو هیوایەی بەشکوم لە کۆتاییدا ئەوە بڵێم: دەمەوێت دووبارە هەموو شتێ چاکبکەمەوە، بەڵام ئەو تەنها پیای دەکێشام. بەڵام سیڤەرد بە ویستی خۆی رێگەی دا لەنێو کلیلە بەفرەکەدا بنرێتە ژێر. بە بۆکس دامگرتبوو و هەر جێیەکی کە بەردەستم دەکەوت پیام دەکێشا و لەسەر چاوە نوقاوەکانی هەناسەبڕکێم بوو.

–ئـــــەی دزی کرامباوگـــــای کرامباوگـــــای ئەشـــکەنجەدەری گیانلەبـــــەران دزی کرامباوگـــــا کرامباوگای ئەشکەنجەدەری گیانلەبەران.

بەڵام هەر هەمووی هەروەکو بڵێی کەوا لەگەڵ یەکێکی کەدا روویدابێت و لەبەر بێئاگایم بەهۆی نائومێدییەکی توڕەبووانە سیڤەرتم بەجێهێشتو رامکردو رامکرد، لەپڕێکدا بە تەواوی لەبەردەم کڵێساکە دەستمکرد بە گریانو بێگومان بە درێژایی هەموو رێگای چونەماڵەوەم گریام چونکە نەمدەتوانی هیچ ببینم. بە بێن هەستمدەکرد کە لادێیەکان بەسەر تاخورکەکانیانەوە زیلیان دەبردە سەر کێلگەکانیانو گوێشم لە زرنگەی زەنگۆڵەکان بوو کە وەکو جۆرە رەوە باڵندەیەکی شین بەسەر هەموو دەشتاییە سپییەکەی خۆرنۆزانەکە دەفرینو ئێخۆ ئەوەشم دەزانی کە دارستانەکەش دوکەڵی چکۆلانەی ئەو تەمومژی زستانەی رەوانە دەکرد، چونکە کاتی ئەو رووداوە بەتەواوی ئا لەو ساتەوەختەدا بوو، بەڵام بۆ رۆژی دوایین کوڕی ئاشەوانەکە پێی وتم کە ئەوان بە تەنیشت دارئەفریێ[7] کەی باوکم راوەستابوون و داوایان لێ کردووم لەگەڵیانا برۆم بۆ ماڵەوەیان و لەنێو کەنووە گەنمە گەورەکانا یاری خنکانیان لەگەڵدا بکەم، بەڵام من ئەوانم نەبینیوە. راستییەکەش ئەوە بوو: من ئەوانم نەدیبوو.

## پەراوێز

*[*] چوارەم چیرۆکی کۆمەڵە چیرۆکی "یاری شەوانە"یە، ناوی سویدی چیرۆکەکە: "Saltkött och gurka"*

*Nattens lekar, 1981, MalmÖ, P. A. Norstedt & SÖners FÖrlag, p. 46-53.*

*١– چـــاونێۆن "nejonÖgon": جـــۆرە مارماســـییەکی چکۆلانەیە، جۆرێکی هێجگار باریکەلەو درێژکۆلەیە پەری هەناسەدانەکانی بە چەندین چاو دەچن.*

*٢– چیکنە "Vägglus": جۆرە سپێیەکە لە ماڵاندا پەیدا دەبێت و بە لاتینی پێی دەوترێت "Cimex lectularius" و خۆی دەترنجێنێتە نێو ماڵان( بە رۆژ لەنێو مۆبیلەکاندا خۆی دەشارێتەوە)، نێو لانە کۆتر، کولانە مریشکو باخی ئاژەڵانەوە: رەنگی پرتەقاڵیو قاوەیی تۆخەو بێ باڵەو لەسەر مژینی خوێنی مرۆڤو ئاژەڵو باڵندە دەژێت، وە پێشی دەوترێت: چیکنە، تاپۆ. جۆرێکی کەی هەیە کە بە پەرەسێلکەوە دەئاڵێتو پێی دەوترێت: چیکنەی پەرەسێلکە "Svalans Vägglus" کە بە لاتینی پێی دەوترێت "Oeciacus hirundinis" بە پەرەسێلکەوە دەئالکێ، بەڵام بەشێوەیەکی کاتییش دەچێتە ماڵانەوەو*

# گفتوگۆ

## گفتوگۆیەك لەگەڵ

## (محەمەد ئەركۆن)دا

هاشم سالح

# گفتوگۆیەك لەگەڵ "محەمەد ئەرکۆن"دا


- هاشم سالح
- و. لە عەرەبییەوە: هانا


**هاشم سالح:** *بە درێژایی ئەم ساڵانەی دوایی، ئسوڵیەت بۆتە یەکێک لەو مەسەلانەی جیهانی عەرەبی بە خۆیەوە سەرقاڵکردووە. چۆن لەم دیاردەیە تێدەگەیت و، هۆکارەکانیشی چۆن لێکدەدەیتەوە؟*

**محەمەد ئەرکۆن:** لە چێوارچێوەی ئیسلام خۆیدا، ناتوانین لە ئسوڵیەت تێبگەین، گەر پشت و پە ئسوڵیەتی ناو ئایینەکانی دیکەی بەراورد نەکەین، ناشتوانین بەشێوەیەکی دروست تاوتوێی بکەین گەر میتۆدە مێژووییەکانمان بەسەردا پراکتیزە نەکرد. بۆ نموونە وەکی ئەوەی لە خۆرئاوادا بەسەر ئسوڵیەتی مەسیحیدا کرا، کاتی ئەوە هاتوە فیکری عەرەبی یاخود ئیسلامی دەست بە لێکۆڵینەوەی ئەو شتانە بکات کە لە دەرەوەیدا روودەدەن، بەتایبەتی لە بواری ئەو لێکۆڵینەوە تازانەی بە شێوەیەکی گشتی لە دەوری ئایینەکان خولدەخوات. مەبەستم ئەو لێکۆڵینەوانەیە کە پەیوەستە بە واتای دیاردەی ئایین و ئەو ئەرکانەی لە کۆمەڵگەدا رایدەپەڕێنن.

لێرەوە بانگی موسڵمانان دەکەم تا زیاترو زۆرتر بایەخ بەوە بدەن کە مێژوو فێرمان دەکات. بایەخ بەوە بدەن کە زانستە کۆمەڵایەتیەکان دەربارەی دیاردەی ئایین پێمان دەڵێن. بەم پێیە، بۆئەوەی لە دیاردەی ئسوڵیەت تێبگەین، ئەوا ناچار دەبین تا لە ڕێی زانستە کۆمەڵایەتیەکانەوە بۆی بچین. مەبەستم ئەوەیە، پێویستە زانستە کۆمەڵایەتیەکان (یاخود زانستە ئینسانیەکان) بەسەر تراداسیۆنی ئیسلامیدا جێبەجێ بکەین. وەك چۆن پێش ماوەیەکی زۆر لە ئەورووپا بەسەر تراداسیۆنی مەسیحیدا پراکتیزە کرا. ئەڵبەتە موسڵمانە کۆنسێرڤاتیڤ و ئسوڵیەکان بەرپەرچمان دەدەنەوە دەڵێن: زانستە کۆمەڵایەتیەکان بەسەر تراداسیۆنی ئیسلامدا پراکتیزە نابن، چونکە بەرهەمی خۆرئاوایە. بەم پێیەش موسڵمانان پەیوەندییان پێیەوە نیە!.

ئەم هەڵوێستە سلبیە لە زانستە ئینسانی و کۆمەڵایەتیەکاندا بە تەنها ئسوڵیەکان ناگرێتەوە، بەڵکو تا ئێستاش ئەمە هەڵوێستی زۆربەی زۆری

ڕۆشـنبیرانی عـەرەب و ئیسـلامییە. ئەڵبەتـە لـەناو ئەمـەدا چـەند حاڵـەتێکی ڕیزپـەڕ هەیـە، مایــەی خۆشحاڵیشـە کە چـەند حاڵـەتێکی ڕیزپـەڕ هەیـە. بـەمجۆرە موسـڵمانان بـەداخراوی لـەناو بازنــەی ترادسیۆنێکی داخراو بەسەر خۆیدا دەمێننەوە.

ئـەوان نایانـەوێت بـواری گفتوگـۆو مشــتومڕ بەرفراوان بکرێت و، دەرگاکـان بخرێنـە سەرپشت تـا هەوایەکی تازە لێیان بدات. ئـەوان نایانـەوێت زانستە کۆمەڵایەتیەکان بەسەر ترادسیۆنی خۆماندا پراکتـیزە بکرێــت، لــە پێنــاو نوێکردنــەوەی ترادســیۆن و ســەرلەنوێ تــەئویلکردنی ئیســلامدا، بــەو پێیــەی دیاردەیەکی ئاینی مەزنە لە ڕیزی دیاردەکانی تردا.

ئەوان لەوە ناگەن کە میتۆدی بەراوردکاری لەگەڵ ئەوانی دیدا چەند بەسوودە، بە مەبەستی تێگەیشتن لە خود. جگە لـە ئیسلام، چـەندەها ئاینی تر لـە جیهاندا هەیە، ئـەوەتانێ مەسیحیەت و یەهودیـەت و بوزیەت و هیندۆسیەت و.. هتد، هەیە.

کەواتـە ئیسـلام وەکـی دیاردەیـەکی ئـاینی، بەشـێوەیەکی ڕەهــا، جیـاواز نیـە لــە تــەواوی دیاردەکانی دیکـە، ئـەو دیاردانـەی پـەیوەندییان بـەو ئاینانـەوە هەیـە کـە باسمان لێکردن. ئەڵبەتـە ئـەو هەڵوێسـتەی لـێرەدا وەریدەگریـن هەڵوێسـتێکیی زانستییە. ئەمـەش تــەواو پێچەوانــەی هەڵوێسـتی ئیمـــانی دۆگمـــایی یـــاخود هەڵوێســـتی خۆبەدەستەوەدەری ویژدانیە کە بـە درێژایی سـەدان ســاڵ، بــە مــیرات لــە بــاب و باپیرانمانــەوە بۆمان ماوەتەوە.

مسوڵمانی تەقلیدی یان ئسوڵی لە هیـچ شتێکدا، هەڵوێستی لە هەڵوێستی مەسیحیەکی تەقلیدی یاخود یەهودیەکی ئسوڵی جیاواز نیە. لەبەرئـەوەی هەریـەك لـەوان لـەناو خۆیدا داخراوەو پێیوایـە کـەوا خـۆی ڕەهایەو، لـە دەرەوەی خۆشیدا هیـچ شـتێکی تـر بوونی نیە، یان وەکـی بڵێیـی ئەوانـەی وەك ئـەو نین گومڕاو سەرلێشێواون.

مەبەسـتم لــە هەڵوێسـتی خۆبەدەسـتەوەدەری ویژدانیش، ئەوانـەن کـە دەیانـەوێت تەنها لــە ڕێــی ئیمانێکی تەقلیدیـەوە قسـە لەسـەر ئیسلام بکرێـت، بـەدەر لـەوە هـەموو ئاقارێکی شـیکاری ئـەقڵانی و زانسـتی وەلاوە دەنێـن. مادامـەکیش ئـەم ئاقـارە باڵادەستە ئیتر مەحاڵـە یـەك هـەنگاو بـەرەو پێـش بچین. کەواتە وا پێویست دەکـات ڕەخنـەی مێژوویی ڕادیکاڵ بەسەر ئسـوڵیەکان و غـەیرە ئسوڵیەکانیشدا پراکتیزە بکرێـت، واتـە بەشێوەیەکی گشـتی بەسـەر فیکری تەقلیدیدا جێبەجێ بکرێت.

***هاشم سالح: هەندێك دەڵێن گوایە ئسوڵیەکان پەیڕەوی ئاقارێك لە ئاقارەکانی ئیسلام دەکەن، هـەرچی ئاقـاری ئـەقڵانی و ئینسـانیە (واتـە ئاقاری موعتەزیلەو فەیلەسوفەکان) پشـتگوێ دەخەن. ڕات چیە سەبارەت بەم قسانە؟***

**محەمەد ئـەرکۆن:** بێگومـان، بـەڵام ئـەو ئاقـارە ئسوڵیە (یـاخود سـەلەفیە)ی لـە سـەدەی سیانزەوە جێگیر بـوەو دەسـتی بـە تەشەنەسـەندن کـردوە، داهێنان و بەرهـەمی ئـەمڕۆ نیـە. ئسـوڵیەکانی ئـەمڕۆ ڕەگ و ڕیشەیان لە ڕابـردوودا هەیـە، تەنانـەت وەکـی دەبینین ڕەگ و ڕیشـەیان لـە ڕابردوویەکی دووریشدا هەیـە. ئـەوان لەسـەر زەمینەیـەکی ســازو لـەبار کاردەکـەن، یـان تـۆ بڵـێ گەشـەدەکەن، زەمینەیـەك لـەمێژە ئامادەکـاری بـۆ دەکـرێ و ڕێــی بــۆ خۆشدەکرێت. ئـەهێنی هـێزو توانـاو تەشـەنەکردنی خێراو بـە پەلـەیان لێرەدایە. قوتابخانـە فیقهیـەکان بەتەواوی لە وڵاتانی ئیسلامیدا بڵاوبوونەتەوە، لەهـەر وڵاتێکیشدا یەکێك لەو مەزهەبانـە پـەیڕەو کـراوە: لـە تورکیـا مەزهـەبی حەنـەفیان پـێ پەسـەند بـوە، لــە ســعودیە حەنبــەلی، لــە میســـر شـــافعی و،

لە مەغریبی گەورەدا مالیکی و، لە ئێران جەعفەری شیعی و.. هتد.

ئەم تایبەتمەندێتیە بەرتەسك و سنووردارە بە پاشەکشەیەك لە فرە ئایدیۆلۆژی و فیکری، دادەنرێت، کە لە سەردەمی کلاسیکی، یان لە سەردەمی زێرینی تەمەنی شارستانی عەرەبی-ئیسلامیدا لە ئارەدا بوە. پلورالیزم بەر لە پێخستنە ناو سەردەمی دووبارەکردنەوەو تەقلیدو جوینەوەوە (واتە لە سەردەمی داوەشان و داخستنی دەرگای ئیجتیهاد)دا، شتێکی مومکین و ڕێپێدراو بوو. بۆیە هەر ئەوەندە بەس نیە کە بڵێین ئسولیەت لادانێکە لە ئیسلام، یاخود بڵێین پەیوەندی بە ئیسلامەوە نیە. لەبەرئەوەی ئەمە چارەسەری کێشەکە ناکات. گرفتەکە لەمە قوڵترەو ئسولی و غەیرە ئسولیەکانیش دەگرێتەوە. ئسولیەکان کەسانێکن بێگومان بە هەموو تێکستەکانی فیکری ئیسلامی ئاشنا نین، بەڵکو تەنها بەو ئاقارە ئاشنان کە بە درێژایی مێژوو باڵادەست بوە. واتە ئاینزا سونیەکان لەلایەك، ئاینزا شیعیەکان لەلایەکی تر، بەڵام هەریەك لە مەزهەبی سونەو شیعە هەر لە سەرەتای سەدەی سیانزەوە دووچاری چەقبەستنێکی ترسناك هاتن، یاخود چوونەوەیەکێکی ترسناکیان بەخۆوە بینی، ئەمەش تا سەدەی بیستەم بەردەوام بوو. واتە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆمان. ئەم داخرانە مێژووییە تا ئێستاش بە شێوەیەکی زانستی لەلایەن موسڵمانەوە تاوتوێ نەکراوەو لێکۆڵینەوەی لە بارەوە ئەنجام نەدراوە. گەر لێکۆڵینەوەی لە بارەوە بکرایە، ئەوە دەگەیشتین کە ئەو ڕەوشەی تێی کەوتووین دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەدە تاریکانەی چووینە ناوی‌و هەتا ئێستاش لێی نەهاتوینەتە دەر.

ئەمە مانای وایە ئێمە میراتگری ئەو سەردەمانەین کە لە جەوهەری فرەیی یاخود بە برشتی فیکری و ئایدیۆلۆژی خاڵییە، نەك میراتگری ئیسلامی شکۆداری سەردەمی کلاسیکی بین (ئیسلامی کلاسیکی شەش سەدەی یەکەمی کۆچی دەگرێتەوە، واتە تا دەوروبەری مردنی ئیبن روشد). ئەمە حەقیقەتێکی مێژووییەو جێگای گومان نیە.

بەم پێیە پێویست بەوە دەکات بە شێوەیەکی مێژووییانە سەیری مەسەلەکان بکەین. تا بزانین ئسولیەت بۆچی گەشە دەکات و لە هەمو جێیەکدا تەشەنە دەسێنێ و پەلوپۆ دەهاوێت. ناکرێت لەم شتانە تێبگەین گەر بێت و لە چوارچێوەی ماوەیەکی زەمەنی کورتدا سەرنجمان دا، واتە لە ماوەی بیست ساڵی رابردوودا (با بڵێین لە ساتەوەختی بەرپابوونی شۆرشی -خومەینی-یەوە لە ساڵی 1979)دا، بەڵکو پێویستە مەسەلەکان لە چوارچێوەی ڕوانگەی مێژوویی ماوە درێژەوە دەستنیشان بکەین، وەك ئەوەی مێژونووسی بەناوبانگ (فێرنان برۆدێل) باسی لێدەکات..

واتە بۆئەوەی لە نهێنی ئەم دیاردەیە تێبگەین کە لە ئێستادا تەواوی جیهانی ئیسلامی گرتۆتەوە، بۆئەوەی ڕەگوڕیشەی وەها دیاردەیەك دەستنیشان بکەین، ئەوا پێویستە هەشت سەدە بگەڕێینەوە دواوە. بەمجۆرە دەبینیت کە زانستی مێژوو، مەسەلەکانمان بەجۆرێك بۆ ڕۆشندەکاتەوە، کە لەوەوبەر بەر لەئارەدا نەبووە. ئەمە گەر زانیمان چۆن چۆنی لە ڕووی میتۆدیەوە بەکاری بێنین، یاخود بە چ شێوەیەك بەسەر ترادسیۆی ئیسلامی دێرینماندا پراکتیزەی بکەین. ئەمە بیری ڕەخنەیی لەناو ئیسلامدا نوێدەکاتەوە، ئێمەش لە هەلومەرجی ئێستادا ئەوپەڕی پێویستیمان پێیەتی، هاوکات لەگەڵ ئەمەشدا، فیکری ئیسلامی بەسەر ئاقاری زانستە ئینسانیەکان و زاراوەکانی و دەسکەوتە مەعریفیەکانیدا دەکاتەوە، ئەو دەسکەوتە مەعریفییانەی مەحاڵە لەمڕۆ بەدواوە پشتگوێیان بخەین..

بەمجۆرە دەبینین کە پراکتیزەکردنی ئاقارو ڕێبازە مۆدێرنییەکان بەسەر لێکۆڵینەوەی ترادسیۆنی ئیسلامیدا شتێک نییە بە تەنها خوازیاری بین، بەڵکو خواستێکی پێویست و هەنووکەییە، بۆئەوەی فیکری ئیسلامی لە قەتیسمانی زەمەن و دووبارەبوونەوەی سەردەمەکان ڕزگاربکەین.

**هاشم ساڵح: تۆ تەواوی پرۆژە فیکرییەکەت لەژێر ئەم ناونیشانە پاڵ و پێوەند دەخەیت: ڕەخنەگرتن لە عەقڵی ئیسلامی. مەبەستت چییە لەمە؟**

**محەمەد ئەرکۆن:** ئەم پرۆژەیە بۆ یەکەمجار لەوکاتەدا لەدایکبوو کە سەرقاڵی ئامادەکردنی کارنامەکەم بووم، بۆ بەدەست هێنانی دکتۆرای دەوڵەت دەربارەی (مەسکویە) وەکو فەیلەسوف و مێژوونووسێک. (ئیبن خەلدون) نموونە بە (مەسکویە) دێنێتەوە، ئەمەش بەڵگەی گرنگی ئەو دەسەلمێنێت. ئەم بڕیارە ئاسۆیەکی گەورەی لەبەردەمدا کردمەوە، لەبەرئەوەی ئازادییەکی سەرسوڕهێنەرم لەبیرکردنەوەدا لا بەدی کرد، گەر بێت و لەگەڵ عەقڵی ئایینی دۆگماتیستی باودا بەراورد بکرێت، لای (مەسکویە) ئەوەم بەدیکرد کە ئەو عەقڵ بە شێوەی فەیلەسوفە یۆنانییەکان بەکاردێنێت. ئەو بە فیعلی فیکری یۆنانی ئەزبەر کردبوو، فیکرێک کە پێشتر دەقەکانی وەرگێڕدرابوونە سەر زمانی عەرەبی. بەرلەوەی (مەسکویە) لە سەدەی چوارەمی کۆچی (دەیەمی زایینی)دا چاو بە دنیا هەڵبێنێ و پێبگات، ئەم بیرمەندە موسڵمانە پابەندی عەقڵی ڕەخنەیی فەلسەفی بوو بە هەموو ڕەهەندەکانییەوە. پاشان دوای ئەوە ئاشنای ئەو بیرمەندانەی تر بووم کە هاوسەردەمی (مەسکویە) بوون، لە ڕیزی پێشەوەشیاندا (ئەبو حەیانی تەوحیدی). بەمجۆرە کارنامەیەکی تەواوم دەربارەی ئەو سەردەمە ڕۆشنبیرە نووسی، ئەوەی (مەسکویە و تەوحیدی).

وەکو دەزانرێت ئەوان پێکەوە لە ڕەنگی نامە گۆڕینەوەوە، یان پرسیارو وەڵامەوە، کتێبێکی هاوبەشیان داناوە، ئەویش کتێبی (الهوامل و الشوامل)ە، کە لە ڕەنگەکانی ترە نموونەی دەگمەنی یەکێکە لە گەنجینەکانی ترادسیۆنی عەرەبی ئیسلامی. بەڵێ خوێندنەوەم بۆ "مەسکویە و تەوحیدی" لە عەقڵییەتی بەرتەسکی دۆگمایی ڕزگاری کردم، ئەو عەقڵییەتەی مەخابن تا ئەمڕۆش بەسەرماندا باڵادەستە.

***هاشم ساڵح: جیاوازی چییە لە نێوان پرۆژەکەی تۆ بۆ ڕەخنەگرتن لە عەقڵی ئیسلامی و پرۆژەکەی (محەمەد عابد جابری) بۆ ڕەخنەگرتن لە عەقڵی عەرەبی ئیسلامی؟***

**محەمەد ئەرکۆن:** پێموایە (جابری) بەشداری لە بزاوتی ئیستهلاککردنی ئایدیۆلۆژیانەی ترادسیۆندا دەکات. بە مانایەکی تر، ئەو دەیەوێت دەسکەوتەکانی سەردەمی کلاسیکی، یان سەردەمی زێڕینی تەمەنی شارستانی ئیسلامی، نیشانبدات. دەیەوێت عەرەبی ئەمڕۆ لەوە دڵنیا بکاتەوە کە ئەوان ڕۆژێک لە ڕۆژان ڕابردوویەکی شکۆداریان هەبووە، لە ئێستاشدا دەتوانن پشتی پێببەستن، تا لە ڕێیەوە بتوانن ڕووبەڕووی تازەگەری ئەوروپی ببنەوە، بەڵام کێشەکە ئەوەدایە کە چارەسەر لە ئیستهلاکی ئایدیۆلۆژیانەی کەلەپووردا نییە، یان لە شانازیکردن بە باب و باپیرانەوە نییە، بەڵکو لەوەدایە ئەم کەلەپوورە بکرێتە خاڵی دەسپێک بۆ ڕاگەیشتن بە کاروانی شارستانییەت و سەردەم.

ترادسیۆنی عەرەبی ئیسلامی لە سەردەمی کلاسیکیدا، هەر بە کوت و بەندی کەشوهەوای عەقڵی سەدەکانی ناوەڕاستەوە دەمێنێتەوە، سەرەڕای

گرنگی و مەڵبەندی، ئیراسمۆس چارەسەر نیە بەڵکو ئەو ئامرازەیە کە پێت بزانین، چۆن چۆنی بەکاری دێنین، و گەشەی پێدەدەین و تێی دەپەڕێنین، ئەوا دەتوانین بگەینە چارەسەر. هاوکات لەگەڵ ئەمەشدا چەمکی ئەقڵی ئیسلامی و زیاتر مەلموسترە لە چەمکی ئەقڵی عەرەبی. لەبەرئەوەی ئەقڵی ئیسلامی لەناو تێکستی و ئەقڵی ئینسانەکاندا ئامادەیی هەیە، دەتوانین بەشێوەیەکی ئاشکراو هەستپێکراو دەستی لێبدەین، لەبەرەمەی ئێمە هەموو رۆژێک پەری دەکەوین، کەواتە ئاوێتەبوونکردنی لە رێی ئەنتۆلۆژیەیەکی رەخنەیی مێژووییەوە، نەک ئەنتۆلۆژیەیەکی تەجریدی و خەیاڵ ئامێز، کارێکی ئاساوە. بەم مانایە رەخنەگرتن لە ئەقڵی ئیسلامی یەکەمین هەنگاوێکە پێویستە بنرێت تا موسڵمانان بۆ بچنە ناو نوێگەرییەوە و ببنە خاوەنی نوێگەری.

ئەوەی راستی بێت (جابری) خۆی لە بەکارهێنانی چەمکی "رەخنەگرتن لە ئەقڵی ئیسلامی لاداوە، ئەو چەمکەی بە رەخنەگرتن لە ئەقڵی عەرەبی گۆڕیوە". ئەمەش بۆئەوەی لە سەرئێشەو گیروگرفت و بەرپرسیارێتی بەدوور بێت. ئەمە فێڵێکی ئاشکراو روونەو لەکەس شاراوە نیە. ئەو کێشانەی ئەمڕۆ سبەینێ رووبەڕوومان دەبێتەوە بریتیە لە کێشەی رەخنەگرتن لە ئەقڵی ئیسلامی، لەبەرئەوەی ئەقڵی عەرەبی بۆ خۆی ئەقڵێکی ئاینیە، یان تۆ بڵێی ـا ئێستاکانی عەقڵانی ئاینیی لە بووندا، ئاینیەیە پاڵدووە. کەواتە چۆن دەتوانین رەخنە لە ئەقڵی عەرەبی بگرین، بێئەوەی رەخنە لە ئەقڵی ئاینی بگرین؟! ئەمە کارێکی مەحاڵە. بەمجۆرە ئەوا رەخنەگرتن لە ئەقڵی تیۆلۆژی سەدەکانی ناوەڕاست، کە سەدان ساڵە باڵادەستە بەسەر مانەوە، ئەرکی گەورەی تەواوی رۆشنبیری عەرەبی پێکدەهێنێت.

بەبێ ئەنجامدانی ئەم کارە، نە ئازادی هەیە، نە رزگاربوون، بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیە کە لە ئێستادا رووبەدات.. ئەڵبەتە ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە (جابری) هیچ شتێکی نەکردوە، بێگومان ئەو هەوڵەی ئەو بەسوودەو لە گرنگترین ئەو هەوڵانەیە کە ئێستا لە گۆڕەپانی عەرەبیدا هەیە، بەڵام ئەمە بەس نیەو سەبوری نادات، پێویستە ئەمە تێپەڕێنین بەرەو ئەوەی قوڵتر و دوورترە.

بە کورتیەکەی پێویستە بچینە ناو جەوهەری گیروگرفتە راستەقینەکانەوە، نابێت بە بیانووی لەبەرچاوگرتنی میللەت یاخود جەماوەر و.. هتد، خۆمانی لێ لابدەین.. پێویستە رەخنە بگاتە رەگوڕیشەی شتەکان، نەک بەوەندە بوەستێ خەلکەیان بدات یان بە ئاسکیەوە دەستیان بۆ بەرێت.

***هاشم ساڵح: بۆچی خۆرئاوا سەردەمی رێنیسانس یاخود دابڕانی لەگەڵ سەدەکانی ناوەڕاست بەخۆیەوە بینی، بەڵام ئێمە نەمانبینی؟***

**محەمەد ئەرکۆن:** ئێمە دوو هەوڵدانمان بۆ رابوون بەخۆمانەوە بینی، بەڵام هەردووکیان لەباربران، یەکەمیان وەک باسمانکرد لە سەردەمی کلاسیکیدا روویداو، دووەمیان لە سەدەی نۆزدەهەمدا بوو. ئەگەر بوار لە بەردەم رێنیسانسی یەکەمدا بڕەخسایەو بەردەوام بوایە، ئەوا ئێمە جڵەوی رەوتی مێژوومان دەگرتە دەست و رۆشنگەری فکریشمان دەناردە ئەورووپا، یان بەلانی کەمەوە ئەوا ئێمە لەم رۆشنگەرییەدا پێشیان دەکەوتین.

راستیەکەی ئێمە بە درێژایی هەردوو سەدەی نۆیەم و دەیەمی زایینی/ واتە سێیەم و چوارەمی کۆچی، لە بوارەکانی زانست و ئەدەب و فەلسەفەدا لە پێشەوە بووین، لە سەرەتای سەدەی دوانزەوە

ئەورووپا زۆر شتی لێوەرگرتبن، بەڵام بە داخەوە ئەم ڕێنیسانسە فکرییە شکۆدارە زۆر نەژیاو لەلایەن چینێکی کۆمەڵایەتی کراوەی وەکو چینی بۆرژوازی لە ئەورووپا پشتیوانی لێنەکرا. ئاشکراشە ئەگەر دروستبوونی ئەم چینەو کرانەوەی بەسەر بیروبۆچوونە تازەکان و پشتیوانیکردنی لە فەیلەسوفانی ڕۆشنگەری لە سەدەی هەژدەدا نەبوایە، ئەوا ئەورووپا نەیدەتوانی لە دروستکردن و دامەزراندنی ئەو شارستانیەتەی ئەمڕۆ لەبەرچاوماندایە سەرکەوتوو بێت.. چونکە ئەوە چینی بۆرژوازیەت بوو کۆسپ و تەگەرەکانی دەرەبەگایەتی لەناو کۆمەڵدا ڕامالی، هەر ئەویش بوو کە چینی کۆنی خانەدانەکانی لە شوێنەکانی خۆیان هەڵکەندو بەشداری لە پێکهێنانی نوێگەریدا کرد.. بەڵام ئەو چینە بۆرژوازیە بازرگانیەی لای ئێمە لەسەردەمانی (مەئمون) و جێگرەکانیدا گەشەی سەند، پشتیوانی لە فیکری ڕۆشنگەری موعتەزیلەو فەیلەسوفەکان) دەکرد هەرزوو بەلادا هات و لەناوچوو، ئەویش بەهۆی گۆڕانی ڕێگا بازرگانیەکان لە جیهانی عەرەبی ئیسلامییەوە بۆ شوێنەکانی تر. هەرچی ڕێنیسانسەکەی دیکەمان کە لە سەدەی نۆزدەدا دەستی پێکردو تا ناوەڕاستی ئەم سەدەیە بەردەوام بوو، هەمان شت بەهۆی چەند هۆکارێکی ناوخۆیی و دەرەکیەوە لەباربرا.

تا ئێستاش سەرلەنوێ چاوەڕێی ڕابوونێکی دیکەین. جا ئەگەر بۆ هەزار جاریش لە هەستانەوەدا شکستمان هێنا، ئەوا دەبێت جارێکی دیکەش واتە بۆ جاری هەزارو یەکەمین، تەکان بدەینە بەر خۆمان.. هەموو ئەوەی لە ئێستادا دەیبینین زەمینە خۆشکردنێکە بۆ سەردەمی ڕابوونی عەرەبی و ئیسلامی لە داهاتوودا، بەڵام ئەمەش ئەگەر لە ڕێگای فیکرێکی تازەوە نەبێت، ئەنجام نادرێت.

**هاشم سالح:** *ئایا ڕۆشنبیرانی ڕەخنەگری وا لە ئارادا هەن کە میتۆدو ئاقارە نوێیەکان بەسەر باس و لێکۆڵینەوەی ترادسیۆنی ئیسلامیدا پراکتیزە بکەن؟*

**محەمەد ئەرکون:** وا هەستدەکەم تا ئێستا ڕۆشنبیرێکی موسڵمانی وا نییە بوێرێت قەرەی ڕەگوڕیشەی کێشەکان بکەوێت، ئەڵبەتە چەند تەقەللایەک لە ئارادایە، بەڵام دوور ناڕوات. پێویستە ئەوە بزانیت کە فیکری عەرەبی ئیسلامی لە ساتەوەختی (ئیبن ڕوشدو ئیبن خەلدون)ەوە لە بەخشش و ئەفراندن وەستا. بەمجۆرە کێشەو دەرێک، لە بیرلێنەکراوەو ئەو شتانەی ئەستەمە بیری لێبکرێتەوە، بە درێژایی ئەو هەموو ماوە زۆرە لە گۆڕەپانی ئیسلامیدا لەسەریەک کەڵەکە بوون.

ئەمە مانای وایە کەلێنێکی مێژوویی گەورەو بەرفراوان هەیەو پێویستە نەهێڵرێت، یان کەمبکرێتەوە. ئەڵبەت پێویستە ئەوەی لە سەردەمی ڕێنیسانسی سەدەی نۆزدە تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم ڕوویدا لەبەرچاو بگرین. چونکە ڕابوونخوازەکانی وەک (تەها حسێن) و نموونەی وەک ئەو، بە درێژەپێدەری یان هاوڕێبازی (ئیبن ڕوشدو ئیبن خەلدون) دادەنرێن.

بەڵام ئەم ئاقارە ئەقڵانیە ڕەخنەییە لە ساڵانی دواتردا بەردەوام نەبوو، ئەویش لەبەر چەند هۆیەکی ناوخۆیی و دەرەکی. دەکرێت بڵێین بە درێژایی ئەم ماوەیە، لێکۆڵینەوەی مێژوویی ڕەخنەیی بۆ ترادیسیۆنی ئیسلامی دواخرا، ئەم دواخستنەش لەژێر ناوی پێویستی خەبات و تێکۆشان لە دژی ئیستعماردا بوو. ئەمە لەکاتی خۆیدا کارێکی ڕەواو بەجێ بوو، لەبەرئەوەی ئازادکردنی ئیرادەی نیشتمانی، لە پێش هەموو شتێکەوە بوو.

لە وەها هەلومەرجێکیشدا ئەو کەلەپوورە کە دەتوانێت سەنگەرێکی پتەو بە دەوری کەسایەتی

کۆمەڵایەتی و نیشتمانیدا دروستبکات. بەوپێیەش ناکرێت لەناو ئاپۆرەی ململانێ و بەگژاچوونەوەی داگیرکاراندا یان لە حاڵەتی هەبوونی هەڕەشەی دەرەکیدا، ڕەخنەی ئاراستەبکرێت، بەڵام ئێستاکێ بارودۆخ گۆڕاوە، دوای ئەوەی پەرژاینە سەر خۆمان ئەم لێکۆڵینەوە ڕەخنەییە زیاترو زۆرتر خۆی دەسەپێنێ، ئەویش لە پێناو قوتاربوون لەو چوارچێوە دۆگماییە ئەرسۆدەکسیەی کەلەپوور. ئیتر لەپاش ڕزگاری دەرەکی سات و وەختی ڕزگاری ناوخۆیی هاتوە.

تەشەنەکردنی ئەو بزاوتە ئسوڵیانەی ئێستا بە گوڕو تینەوەیە چیە؟ ئەگەر گەورەترین بەڵگەیەك نەبێت لەسەر پێداویستی بەشداریکردن لەم لێکۆڵینەوە ڕەخنەییە قووڵەی کەلەپووردا..

## سەرچاوە


محمد اركون: قضايا في نقد العقل الديني (كيف نفهم الاسلام اليوم؟) -ترجمة و تعليق: هاشم صالح- دار الطليعة، بيروت- الطبعة الاولى، 1998





لە ئینتەرنێتەوە

# هونەر



مارک شێپیس

# مارك شێپس

## گلۆبالیزەیشن و دیالۆگی کولتوورەکان لە هونەری شێوەکاریدا

● و. لە ئەڵمانییەوە: گارا




لەگەڵ کۆتایی سەدەی بیستەم و هاتنی هەزارەی سێیەمدا، چەندین هۆڵ و مۆزەخانەی گەورەی ئەوروپاو ئەمریکا پێشانگای گەورەو گرنگیان بۆ نیشاندانی "پوختەی" هونەری سەدەی رابردوو ئامادەکرد. ئەڵمانیش بەدەر نەبوو لەو پێشانگایانە، لە بەرلین پێشانگای "سەدەی بیست"ەم کرایەوەو لە دۆسلدرۆف پێشانگای"هونەر لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستدا"، لە بایرۆت پێشانگای "هونەر لە سەدەی بیستدا"، لە بۆن پێشانگای "سەردەمی وەرچەرخان" و دواجاریش لە کۆلۆنیا پێشانگای "دیالۆک لە جیهانەکانی هونەردا"، سازکرا. ئەو پێشانگایەی دواییان بابەتی ئەم بەسەرکردنەوەیەمانە.

لە (5)ی نۆڤەمبەری 1999 تا (19)ی ئازاری 2000 لە مۆزەخانەی لۆدڤیك لە کۆلۆنیا پێشانگایەکی گەورە کرایەوە، کە سەرجەم هۆڵەکانی ژێرەوەی مۆزەی لۆدڤیکی گرتبوو، پێشانگاکە لە کارە هونەرییەکانی گۆگانەوە تا کۆمەڵێك هونەرمەندی هاوچەرخی وەك "بل ڤیولا" و "وانش کابور"ی لەخۆگرتبوو.

بەڕێوەبەری پێشووی مۆزەی لۆدڤیك "مارك شێپس" کە پێشانگاکەی ڕێکخستبوو گوتبووی: لە سێ ساڵ لەمەوبەرەوە خولیای کردنەوەی ئەم پێشانگایە لەسەرمدا بوو، بەڵام هەلومەرج بواری نەدەدا، تا دواجار سوودم لە پێشنیارێکی ڕێکخراوی "هونەرو ڕۆشنبیری" لە هەرێمی "نۆرد ڕاین وێستڤالن" وەرگرت کە بانگهێشتی بۆ چەند پسپۆڕێك ناردبوو بۆ کردنەوەی پێشانگایەکی گرنگ و گەورە لە هەرێمەکەدا، تەبا گواستنەوەی پایتەخت لە بۆنەوە بۆ بەرلین، بۆشاییەکی هونەریی لە هەرێمەکەدا دروستبکات.

ناوەڕۆکی پێشانگاکەو ناونیشانەکەی تەواو لەگەڵ یەکدیدا گونجاو بوون. پێشانگاکە بەهەندێ لە کارە هونەرییەکانی پاوڵ گۆگان دەستیپێکردبوو، بەتایبەت کارەکانی دورگەی تاهیتیی گۆگان، چونکە کۆچکردنی گۆگان بۆ تاهیتی و دوورکەوتنەوەو جێهێشتنی بۆ شارستانی خۆرئاوا بە ڕووداوێکی گرنگ لە

مێژووی نوێکردنەوەی هونەردا لەقەڵەمدەدرێت. دیارە پێش گۆگانیش هونەرمەندانی وەك دێلاکرواو و چەندانی دیکەش بەرەو شوێنی دیکە کۆچیانکردبوو، بەڵام مارك شێپس کۆچەکەی گۆگان بە سەرەتای دیالۆگی نێوان خۆرئاواو غەیرە خۆرئاوا دادەنێت لە مێژووی شێوەکاریدا.

گۆگان لەپێناوی گەڕان بەدوای هەندێ شێوەو پرەنسیپی جوانکاری نوێدا، وڵاتەکەی خۆی و شارستانیەتی خۆرئاوای بەجێهێشت و بەرەو ئەو دوورگەیە کۆچیکرد. ویستی جێگایەك بدۆزێتەوە پەنجەی خۆرئاوای بەرنەکەوتبێت و هەستی بەهەشتی بداتێ.. هەستە نوێکانی گۆگان لە وێنەکردنی مرۆڤ و سروشتی تاهیتیدا دەردەکەوێ کە بەچەند جۆشوخرۆشەوە ژیانی مرۆڤەکانی وێنەکردووە کە ڕەنگدانەوەی زیندوێتیو جوانی ژیانن لەو دوورگە بەهەشتییەی گۆگان.

دوای گۆگان هەندێ هونەرمەندی دیکەی ئەڵمان و فەرەنسیش وڵاتەکانی خۆیان جێهێشت و بەمەبەست ڕوویانکردە دەرەوەی شارستانیەتی خۆرئاوایی، لەوانە هونەرمەندانی وەك ماکس پێشتاین و ئەمیل نۆڵدە کە هەریەکەیان بەجیا ڕووی لە جێگایەك کردو نیازی گەورەشیان ئەوەبوو دووربن لە شارستانییەتی خۆرئاوا. ئەمیل نۆڵدە بەرەو کۆلۆنی ئەڵمانی نۆیجینیا سەری هەڵگرتوو ماکس پێشتاینیش بەرەو دورگەی پالاو، هەردووکیان بە کاریگەری ژیانیان لە دەرەوەی خۆرئاوا کارگەلێکی زۆریان دوای خۆیان جێهێشت کە ڕەنگدانەوەی خۆشەویستییان بۆ ئەو ژیانەی لەو ناوچانەدا دوور لە دەستێوەردانی خۆرئاوا درێژەی هەبوو.

بەگشتی پێشانگاکە لەڕووی مێژوویەوە بەجۆرێك ڕێکخرابوو کە گۆڕانکارییەکان و نوێکردنەوەکانی ناوەوەی هونەری خۆرئاوا لەژێر کاریگەریی دیالۆگ و نزیکبوونەوە لەگەڵ کولتوورەکانی تر نیشانبدات. هەر لەسەر ئەم بنچینەیەش مارك شێپس پێشانگاکەی بەسەر چوار بەشی سەرەکیدا دابەشکردبوو، کە وەك گوتمان لە گۆگانەوە دەستیپێدەکردو دوابەدوایشی قۆناغەکانی دیکەی گۆڕان و پێشکەوتنی نیشاندەداو هەر بەشێکیش لەو بەشانەی ناوی تایبەتی خۆیان هەبوو.

ئەو بەشەی کارەکانی پاول گۆگان و ماکس پێشتاین و پابلۆ پیکاسۆ و هەنری ماتیس و جیا کۆمێتیو مۆدلیانی و پاول کلەی و دوای تەعبیریە ئەڵمانییەکانی لەخۆگرتبوو ناوی "دۆزینەوەکانی ئەوروپا لەنێوان 1890 تا 1960" بوو. دیارە کارەکانی پیکاسۆ لەو بەشەدا شوێنێکی گەورەیان داگیرکردبوو، چونکە هیچ هونەرمەندێکی ئەوروپی وەك پیکاسۆ لەژێر کاریگەری پەیکەرو ماسك و شێوە جۆراوجۆرەکانی هونەری ئەفریقی و هونەری میللەتە سادەکاندا نەبوە. دوابەدوای ئەویش کارەکانی جیا کۆمێتی دەهات کە شارەزاییەکی زۆری لە هونەری فیرعەونیدا هەبوو. ئینجا کارەکانی پاول کلەیو ئۆگست مەکە لە تونس و دوابەدوای ئەوانیش کارەکانی ماتیس لە مەغریب کە نیشاندەرەوەی ڕەونەق و درەوشەی زەخرەفەی ئیسلامییە، کە ماتیس بۆ گۆڕانی ڕوبەرە ڕەنگییەکان بەکاریهێناوە، بەجۆرێك دەتوانین بڵێین زەخرەفەی عەرەبیو ئیسلامی بوە بەشێکی دانەبڕاو لە هونەری ماتیس و بەو شێوەیەش بووە هۆکارێکی نوێکردنەوە لە هونەری شێوەکاری خۆرئاوادا.

بەشی دووەمی پێشانگاکە بۆ هونەری شێوەکاری ئەمریکای لاتین تەرخانکرابوو، بە مەبەستی دەرخستنی کاریگەریی هونەری ئەمریکای لاتین بەسەر هونەری نوێی خۆرئاواوە. ناونیشانی بەشەکە "ئەمریکای لاتین لەنێوان دوو دنیادا ساڵی 1920-1965" بوو. لەم بەشەدا کارەکانی "فریدا کالو، داڤید ئەلڤارۆ، ڕۆبرتۆ مەتا، دێیکۆ ڕێڤێرا" بەشێکی گەورەیان داگیرکردبوو، کە بابەتەکانیان هەڵقوڵاوی کولتووری ئەمریکای لاتینەو شێوازو تەکنیکیشیان خۆرئاواییە. لەم بەشەدا تابلۆی ئەو هونەرمەندانەش دەبینرا کە لەژێر کاریگەریی هونەری ئەمریکای لاتیندا کاریانکردووە وەك ماکس ئەرنستی ئەڵمانی و ئەندرێ ماسۆنی فەرەنسی و جاکسۆن پۆڵۆکی ئەمریکی. ئەم هونەرمەندانە جگە لە کاریگەریی کولتووری

هیندیە سوورەکان بەسەریانەوە چاویان بە پاشماوەی شارستانییەتە دێرینەکانی وەك شارستانێتی مایا کەوتبوو. بۆ نموونە سەفەرەکەی پۆلۆك بۆ ناو هیندیە سوورەکان کاری کردە سەر سەرجەمی گۆڕانی ڕەنگ و شێوەی دانانی لەسەر تابلۆ، کاتێك پۆلۆك هیندیە سوورەکانی بینی لە لەناو بەینی پەنجەکانیانەوە دەتکێنە سەر زەوی، ئەمە وای لە پۆلۆك کرد بە شێوازە تەقلیدییەکان ڕەنگ نەخاتە سەر تابلۆ، بەڵکو تابلۆکان لەسەر زەوی دابنێ و ڕەنگەکان بە دڵۆپ بڕژێنێت بەسەریاندا. بەمشێوە کارکردنە پۆلۆك ناوبانگێکی گەورەی پەیداکردوو بووە یەکێك لە ڕابەرانی دەربڕینخوازی "تەعبیرییەتی" ئەمریکی.

بەشی سێهەمی پێشانگاکە بەناوی "یەکگرتنەوەی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لەنێوان ساڵی 1935-1980" بوو. هەروەکو چۆن لە بەشەکانی دیکەی پێشانگاکەدا کاریگەری و کارتێکردن لەنێوان هونەرمەندانی خۆرئاواو هونەری ئەفریقیو ئەمریکای خواروودا نیشاندرابوو، ئەم بەشەیان تایبەت بوو بە پەیوەندی نێوان هونەری خۆرئاواو هونەری ئاسیاویی و بودیی.

ئەم کارتێکردنە تەواو لە کارەکانی هێنری میشۆو سام فرانسیس و ئادراینهاردو ئیف کلاین و هەندێکی تردا دەبینران. شایەنی باسە سوریالییە ئەورووپاییەکان ماوەیەکی درێژە ئەو هەستەیان لەلایە ئەوان بەشێوەیەك لە شێوەکان لەژێر کارتێکەری هێڵە کالیگرافییە یابانییەکان و سەرچاوە فەلسەفییەکانی ئاسیای بودیدا کاریانکردووە. بە پێچەوانەشەوە پێشانگاکە سەرقاڵی هونەرمەندانی ئاسیاشی نیشاندەدا بە هونەری خۆرئاواوەو سوودیان لێ بینیوە بۆ پێشخستنی هونەرەکەی خۆیان، لە سەروو ئەوانەوە هونەرمەندی کۆری "نام جون پەیك" ڕاوەستاوە کە لە تافی لاوییەوە بەرەو ئەڵمانیاو ئەمریکا کۆچیکردووەو دواتر بووە باوکی هونەری ڤیدیۆ. یەکێ لە کارەکانی نام جون پەیك جێگایەکی تایبەتی لەم بەشەدا هەبوو کە تیایدا سێ پەیکەری بودای بەرابەر سێ ئامێری تەلەفزیۆن دانابوو، لەم کارەدا بوداکان "متامل" نەبوون بەڵکو تەماشای تەلەفزیۆنیان دەکرد، وەك نیشاندانێکی دیالۆگ و کارلێك لەنێوان خۆرهەڵاتی تێرامان "متامل" و خۆرئاوای هزرڤاندا. دیارە جگە لە نام جۆن گەلەك هونەرمەندانی تریش لە خۆرهەڵاتەوە بۆ خۆرئاوا کۆچیانکردبوو، لەوانە هونەرمەندی یابانی یۆکۆئۆنۆ کە ڕۆڵێکی زۆر گەورەی لە فلسکوزدا دوای جەنگی دووەمی جیهانی گێڕا، جگە لەویش هونەرمەندی یابانی ئۆن کاڤاراو هونەرمەندی بە ڕەچەڵەك هیندی ئەنەش کاپوور کە ئێستا لە بەریتانیا دەژی.

دوا بەشی پێشانگاکە بۆ بابەتی گلۆبالیزەیشن لە هونەردا تەرخانکرابوو لەژێر ناونیشانی "ئێستای بەگلۆبالکراو لەنێوان (1980) و (1999)" لەم بەشەدا گلۆبالیزەیشن لە هونەری شێوەکاردا دەبینرا، بەڵام بێگومان لەسەر بنەما سیاسی و ئابوورییەکەی نا، بەڵکو لەسەر بنەما هونەری و کولتوورییەکانی، لەم بەشەدا چەندین هونەرمەندانی دونیای ئەمڕۆ بەشداربوون کە ڕەچەڵەکیان لە کولتووری جیاجیاوە هاتبوو، وەك کارەکانی هونەرمەندان "بل ڤیولا"ی ئەمریکی، "ئەنش کاپوور"ی بە ڕەچەڵەك هیندی، "فرانچسکۆ کلیمنتا"ی ئیتاڵی، "منێ حاتووم"ی لوبنانی، "کیخۆ"ی کوبی، "تشن زین"ی چینی و "شیرین نەشات"ی ئێرانی و چەندانی تر. لەم بەشەدا بە پێچەوانەی بەشی یەکەمەوە کە هونەرمەندانی خۆرئاوا لەژێر کاریگەری هونەری دەرەوەی خۆرئاوادا کاریان دەکرد، ئەوە پیشاندەدا کە هونەرمەندانی دەرەوەی خۆرئاوا یان ئەوانەی ڕەچەڵەکیان نییە لەژێر کاریگەری هونەری خۆرئاوادا کاریان کردووەو سەرجەمی هونەری شێوەکارو کۆتایی سەدەی بیستیشیان پێ دەوڵەمەند کردووەو بەشداربوون لە نوێکردنەوەو پێشخستنی هونەردا بەگشتی.

لێرەدا ئەو چاوپێکەوتنە وەردەگێڕین کە "رگینە فیبرول" لەگەڵ "مارك شێپس"ی بەڕێوەبەری پێشووی مۆزەخانەی "لۆدڤیگ" لە کۆلۆنیا- ئەلمانیادا ئەنجامی داوە، شێپس ڕێکخەری ئەو پێشانگایە بوو کە بەناوی "دیالۆگ لە دنیای هونەردا" لە 1999/11/5 تا 2000/3/19 لە کۆلۆن نمایش کرا.

**رگینە فیپرول:** ***شێپسی بەڕێز، چ شتێك تۆی بۆ ڕێکخستنی ئەم پێشانگایە هان دا؟ ئایا دەتەوێ ڕابوردوو نمایش بکەیت، یان باوەڕت وایە پەیوەندیی نێوان هونەرە ئەوروپییەکان و هونەرەکانی ئەفریقیاو باکووری باشووری ئەمریکاو ئاسیا، تا ئێستاش بەباشی توێژینەوەیان لەسەر نەکراوەو نەخراونەتەڕوو؟***

**شێپس:** سێ ساڵ دەبێ سەرقاڵی ئەم بابەتەم، ئەوەبوو دەرفەتێکم بۆ هات لە ڕێکخراوی "هونەرو ڕۆشنبیری" لە ناوچەی نۆردراین وێست فالن کە پشتگیریی ژمارەیەك لە بەڕێوەبەرانی مۆزەخانەکانی کرد لە شاری دۆسلدۆرف و کۆلۆنیاو بۆن‌و دسپۆرك، بۆئەوەی لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا لە یەکێ لە مۆزەخانەکانی ئەم شارانەدا پێشانگایەکی هاوبەش بکرێتەوە، بێگومان ئەمەش پەیوەندیی بەو ترسەوە هەیە کە دەشێ لە ئاکامی گواستنەوەی پایتەخت لە (بۆن)ەوە بۆ (بەرلین) بۆشاییەکی هونەری ڕوویدات. ئەم پشتیوانییەی ڕێکخراوی "هونەرو ڕۆشنبیری" بووە هۆی ئەوەی چەندین پێشنیار بۆ کردنەوەی پێشانگای شێوەکاری لەو شارانە بکرێن، بەشداربوونی منیش یەکێکە لەو چالاکییانە.

**فیرول:** ***کارکردنت لە ڕێکخستنی ئەم پێشانگایە "دیالۆگێك لە دنیای هونەردا" هەنگاوی یەکەمتەو دەتەوێ بەردەوامیش بێت، وا نییە؟***

**شێپس:** بابەتی دیالۆگێك لە دنیای هونەردا چەندین ساڵە بیری لێدەکەمەوە، باوەڕم وایە ئەمە بابەتی ساتەوەختی ئێستایە چونکە ئێمە لە دواساتەکانی چەرخی بیستەمدا دەژین، بەتایبەتی لە دنیای هونەرداو لە هەموو لایەکی سەر ئەم گۆی زەوییەدا تەقینەوەی گەورە دەبینین کە گلۆبالیزمێکی هونەریی پێکهێناوەو سەرەنجام تێڕوانینێکی نوێ بۆ هونەری ئەم چەرخە دروست بوە.

مێژووی هونەری ئەوروپی تا ئێستاش کاریگەریی هەیە، ئەم مێژووە لەماوەی ئەم سەدەیەدا بە ئەندازەیەکی گەورە پێشکەوتووە لە سەرەتادا لەژێر کاریگەریی کولتوورە ئاسیایی و ئەفریقیاییەکاندا بوە، بەتایبەتی هونەری پیکاسۆو پاول گۆگان، پاشان مێژووی هونەری ئەوروپی- ئەمریکی کە تێگەیشتنی ئێمەیان بۆ هونەری خۆرئاوایی گۆڕی و پاشان چەند دەوڵەتێکی تری وەك ژاپۆن و هەندێ دەوڵەتی ئاسیایی دیکە ڕاکێشرانە ناو کولتووری خۆرئاواییەوە، بەڵام لەم چەند ساڵەی کۆتایی سەدەی بیستەم "هونەری هاوچەرخ" بوە بە دیاردەیەکی جیهانی کە لە ئەفریقیاو ئەمریکای لاتینی و نیوزیلاندو ئوسترالیادا بەشێوەیەکی بەرچاو پەرەی سەندووە بەجۆرێ شوێنێك لەم گۆی زەوییەدا نەماوەتەوە خاڵی بێت لە هونەری هاوچەرخ و گەلەریی گەورە.

**فیرول:** ***ئایا زانستی هونەر پەیوەندیی نێوان هونەری خۆرئاوایی و ناخۆرئاوایی لە سەدەی بیستەمدا ڕووندەکاتەوە؟***

**شێپس:** نا.. تا ئێستاش لە زانستی هونەردا هیچ ڕوونییەك بۆ ئەم پەیوەندییە نییە. بێگومان ئێمە دەزانین وڵاتە ئەوروپییە کۆلۆنیالیستەکان چەندین وڵاتی دیکەیان داگیرکردووە بەڵام لە کۆتایی قۆناغی داگیرکاریدا تەماس و پەیوەندی لەنێوان هونەرمەندانی ئەوروپی و هونەرمەندانی وڵاتە کۆلۆنیالکراوەکاندا ڕوویداوەو دواجار کولتوورێکی زیندوو لەدایك بووە.

لە سەردەمی کۆلۆنیالیزمدا بە دیدگایەکی ئەتنۆلۆژی سەیری کولتووری وڵاتە داگیرکراوەکان دەکرا بەڵام لە کۆتاییەکانی قۆناغی داگیرکردندا ئەم

دیدگایە گۆڕانی بەسەردا هات، هونەرمەندانی ئەورووپی لەو سەردەمەداو لە پەیوەندییاندا لەگەڵ هونەرەکانی وڵاتانی داگیرکراودا بەدوای تازەکردنەوەی زمانی هونەردا دەگەڕان کە پاشان کۆمەڵێ فۆرمی نوێیان کەشفکردو سوودیان لێوەرگرت، تەنانەت بایەخیان بە هونەرە میللییەکانیش دەدا، ئەمەش بوە هۆی خولقاندنی گۆشەنیگایەکی نوێ بۆ هونەر کە کاریگەرییەکی شۆڕشگێڕانەی هەبوو.

من وایدەبینم بەدواداچوونی ئەم پرسیارە لەبارەی چۆنێتی مامەڵەکردنی هونەرمەندە ئەورووپییەکان لەتەك ئەم دۆزینەوە نوێیانەدا، شتێکی زۆر گرنگە، لەڕاستیدا هونەرمەندە ئەورووپییەکان ئولفەتێکی جوانیان بینی لەنێوان خۆیان و ئەو فۆرمە سەیرو سەرنجڕاکێشانەی لەو وڵاتانەدا هەبوون.

**فیرول:** ***لەو پێشانگایەی تۆ رێکتخستووە، مێژوویەکی بەدوای یەکداهاتوو هەیە، لە کۆتایی سەدەی نۆزدەوە دەستپێدەکات، لە چوار هۆڵی گەورەدا تابلۆی 120 هونەرمەندی ژن و پیاوت کۆکردۆتەوە، بەمجۆرە: ئەورووپا، ئەمریکای لاتین، ئەمریکای باکوور، پاشان دیالۆگی خۆرهەڵات و خۆرئاوا. ئاخۆ ئەمە مانای ئەوەیە وازت لە هونەری ئێستا هێناوەو تەنها بایەخ بە بەدواییەکداهاتنی مێژوویی دەدەیت؟***

**شێپس:** بەشی پێنجەمی ئەم پێشانگایە تایبەتە بە هونەری ئێستا کە پەنجا هونەرمەند بەشدارییان تیایدا کردووە، بەڵام با بگەڕێینەوە دواوە: لە ساڵی 1984 و لە پێشانگای (هونەرە سەرەتاییەکان و هونەری هاوچەرخ) لە مۆزەخانەی هونەری هاوچەرخ لە نیویۆرکدا، ویلیام رۆبین گەیشتە ئەم ئەنجامە: "چەندین دەیەیە جگە لە هەندێ توێژینەوە لە حەفتاکان و هەشتاکاندا، خەڵکی بایەخیان بەم بابەتە زۆر گرنگە نەداوە"، لەبەرئەوە هەست بە بۆشاییەکی مەعریفی کرا. ئێستا بوارێکم بۆ رەخساوە تا لەو گیروگرفتانە تێبگەم. لە بینالی ڤینیسیای ساڵی 1999دا نزیکەی 16 هونەرمەندی چینی بەشدارییان کرد کە لە چەند ساڵی رابوردوودا ئەمجۆرە کارە هاوبەشەمان نەدەبینی. هەروەها کارەکانی یەکەم هونەرمەندی ئەفریقی لە پێشانگای نۆیەمی "دوکومێنتا"[1] کە جان هوت رێکیخستبوو و پاشان کاردانەوەیەکی ئیجابیی هەبوو، دەرکەوت کە خۆرئاوا تا ساڵی 1990 تەنها سەرقاڵی خۆی بوە.

ئەو هونەرمەندانەی پێشتر هاتوون بۆ خۆرئاواو لەگەڵ کولتووری خۆرئاوادا تێکەڵ بوونە، ئێستا لەبەرچاو دەگیرێن و گرنگییان پێدەدرێ، بۆ نموونە "نام جۆن پیك"[2] یان "ئۆن کاخارا" کە لە ساڵی 1981 لە کۆلۆنیا لە پێشانگای هونەری خۆرئاوادا بەشدارییان کردو بوونە شوێنی سەرسامیی جەماوەر. ئەمڕۆ ئێمە لەبەردەم بارودۆخێکی نوێداین: لە هەموو کیشوەرو وڵاتانی دنیادا تێکەڵبوونێکی سەیر لەنێوان کولتوورەکاندا هەیە، ئەو سنوورانەی سێنتەرو کەنارەکانی لەیەکتر جیادەکردەوە ئەمڕۆ کاڵ بوونەتەوەو بگرە لە هەندێ حاڵەتدا نەماون.

**فیرول:** ***ئایا ئەمە مانای وایە دەبێ خۆرئاوا واز لە سێنتەریزمی خۆی بهێنێ؟***

**شێپس:** زەحمەتە ئێستا ئەم قسەیە بکەین چونکە خۆرئاوا تا ئێستاش لەناو سێنتەری هونەردایە تەنانەت ئەگەر کەنارەکانیش بە ئەندازەیەکی گەورە بەرەو پێشەوە چووبن. دەبێ ئەوەشمان لەبیر نەچێ کە میدیاکان و دەستکەوتە گەورەکانی خۆرئاوا لە سەردەمی گلۆبالیزەیشندا کاریگەرییەکی گەورەو ئاکتیڤیان هەیە. هەروەها ئەو کەسانەی ئارەزوویانە دیالۆگ لەگەڵ خۆرئاوادا بکەن ناچارکراون خۆیان

لەگەڵ مەرجەکانی خۆرئاوادا بگونجێنن چونکە ئەلتەرناتیفێکی تر نییە جگە لە خۆرئاوا. کەچی ئەو کەسانەی دیالۆگ لەگەڵ خۆرئاوا رەتدەکەنەوە ئەوا لەناو تەقلیدییەتی تایبەتی خۆیاندا دەمێننەوەو ئەمانە کۆنزەرڤاتیڤن و ناتوانن لەگەڵ بەها نوێیەکاندا خۆیان بگونجێنن. بەڵام دەبێ لێرەدا ئەوە روون بکەینەوە هەروەکو چۆن ئەوروپییەکان پێویستیان بە کولتوورەکانی تر هەیە بۆئەوەی کۆمەڵێ فیکرو تێڕوانینی دیکە بهێننە ئاراوە، هونەرمەندە نائەوروپییەکانیش پێویستییان بەو فیکرو کولتوورانە هەیە کە لە خۆرئاوا هەن. لەم پێشانگایەدا کاری هونەرمەندانی ئەوروپی و غەیرە ئەوروپیشمان هەڵبژاردووە کە سەرجەمیان گوزارشت لە شوناس و قوڵکردنەوەی شوناس دەکەن بۆئەوەی دەریبخەن کە ئەمانە تا چ رادەیەکی گەورە پێویستییان بە یەکتر هەیە.

***فیرول: لە پێشانگای (دیالۆگێک لە دنیای هونەردا) بەتەوێ ئەوە پیشان بدەیت کە خۆرئاواو ئەوروپییەکان تا چ رادەیەک کولتوورە غەیرە ئەوروپییەکانیان فەرامۆش کردووە؟ ئایا لەو پێشانگایەدا دیالۆگێکی هاوسەنگ و عادیلانە سازکراوە؟ یان بەتەوێ پێمانی بڵێیت کاتی ئەوە هاتووە زمانێکی میتاهونەریی لە گلۆبالیزمدا دابمەزرێت؟***

**شێپس:** ئەم پرسیارە کۆمەڵێ وەڵامی هەیەو من بۆخۆم دڵنیا نیم ئاخۆ ئەوروپییەکان کولتوورەکانی تریان فەرامۆشکردووە یان نا، من دەمەوێ بڵێم "ئەوانیتر" خۆیان دواکەوتن، لەبەرئەوە لە پێشانگاکەدا تابلۆیەکی "شێری زامبا"[3] بە سێ بەش هەیەو بۆ یەکەمجارە پیشان دەدرێ، لە بەشی یەکەمدا زامبا دەبینین کە لە پشتیەوە نەخشەی ئەفریقیا هەیەو لەبەردەمیشیدا کۆمەڵێ پەیکەری میللی ئەفریقی و لە تەنیشتیشیدا پیکاسۆ لەبەردەم باکگراوندێکی خۆرئاوایی بێلایەن وەستاوە، لە بەشی دووەمیشدا زامباو پیکاسۆ پێکەوە دەچنە مۆزەخانەی هونەری هاوچەرخ لە پاریس و هەریەکەیان تابلۆیەکیان هەڵگرتووە کە وێنەی دەمامکی ئەفریقی لەسەر کێشراوە، لە بەشی سێیەمی ئەم تابلۆ سێینەیەدا زامبا خۆی و تابلۆکەی بەتەنیا لەبەردەم سێنتەری جۆرج بۆمبیدۆ راوەستاوەو لەو سێنتەرەدا تەنها تابلۆی پیکاسۆ قبوڵ کراوە، لێرەدا زامبا دەپرسێ، ئایندەی هونەری ئێمە چییە؟

لە بەشێکی تری پێشانگاکەدا دیالۆگێک لەنێوان هەردوو تەرەفدا هەیەو دەریدەخات چۆن ئەم دیالۆگە کاری لە هونەری هەریەکەیان کردووە. مارک توبی و هێنری میشۆو ئاد راینهارد بە هونەری ئاسیەوی کاریگەر بوون بەتایبەتی بە هێڵی کالیگرافیو فەلسەفەی ئاسیایی، ئەمە بەسەر چەند هونەرمەندێکی تری خۆرئاواییدا پراکتیک دەبێ، بۆ نمونە جۆن کیج.

ئەمە مانای وایە خۆرئاوا بەهۆی ئەو تێکەڵبوون و پەیوەندییەوە لە زۆر لایەنەوە دەوڵەمەند بوە، چونکە لێرەدا هەرچەند قوڵبوونەوەیەکی رۆحی هەبێت، ئەوەندە هونەرەکە بەرەو پێشەوە دەچێت، ئەمە ئەگەر هەر تەنها لاساییکردنەوە بوایە ئەوا هیچ کاریگەرییەکی نەدەبوو، بێگومان ئەمە بەسەر هونەری ئاسیەویشدا پراکتیزە دەبێ ئەگەر بەتەنها لاسایی هونەری ئەوروپی بکاتەوە ئەوا بە هیچ جۆرێ پێش ناکەوێ. لە پەنجاکانی سەدەی بیستەمدا کاتێ گرووپی "کوتای"ی هونەری ژاپۆنی لە پەرەسەندنی هونەری خۆرئاوایی نزیکبوونەوەو کارەکانی هونەرمەند (جاکسون پۆلۆک) یان ئاسی و هەروەها کارەکانی ئەبستراکتە فەرەنسییەکانیان بینی، بە هوشیارییەوە سوودیان لەو شێوە هونەرە وەرگرت.

کاتێ لەلای هونەرمەندان ئەوە روون دەبێتەوە کە بەکارهێنانی زمانی هونەری خۆرئاوایی لەگەڵ شوناسی خۆیاندا هیچ ناکۆکی و دژایەتییەك دروست ناکات، ئیتر ئەمە دەبێتە کارکردێکی ئاکتیف و بەهێز بۆ ئێستای هونەر لە هەردوو لایەنی خۆرئاوایی و ئاسیایی.

ئەوە شتێکی سەرنجراکێشە شێوەیەکی گونجاوی (بودا) وەك هێمایەك ببینین لە کارەکانی ژمارەیەك لە هونەرمەندانی ئاسیایی بێئەوەی ئەمە پەیوەندیی بە شوناسی ئاینییەوە هەبێ بەڵکو ئەمە پەیوەندیی بە شوناسی رۆشنبیرییەوە هەیە..

***فیرول: ئایا تۆ لەم پێشانگایەدا باسی رەوتە هونەرییە گەورەکان دەکەیت لە مێژووی هونەری سەدەی بیستەمدا، یان باسی چەند کەسایەتییەکی هونەری دەکەیت کە جێکەوتێکی دیاریان لە پەرەسەندنی هونەریدا هەبووە؟***

**شێپس:** ئەم پێشانگایە لەسەر چەند بابەتێکی پێکەوە بەستراو لەبارەی هونەرەوە رێکخراوە. لە سەدەی بیستەمدا چەند ساتێکی پرشنگدارو جیاواز هەبوون کە بەهای ئەم دیالۆگە تیایاندا زۆر بە چڕی دەرکەوتووە.

جگە لە گرووپی "پرد"، بابەتەکە بریتی نییە لە بزاوتێکی گشتی هونەریی، بەڵکو بریتییە لە چەند کەسایەتیەکی هونەری کە کاریگەرییەکی گەورەیان لە مێژووی هونەری سەدەی بیستەمدا هەبووە، بۆ نموونە کاریگەریی کوبیزم "تەکعیبیەت" نەبووە بەڵکو کاریگەریی پیکاسۆ هەبووە، کاریگەریی فوڤیزم نەبووە بەڵکو کاریگەریی ماتیس هەبووەو.. بەمجۆرە.

ئارەزووی دیالۆگ لەسەر ئاستێکی زۆر شەخسیدا هەبووە و تەنانەت تا ئەمڕۆش هەر بەو شێوەیەیە، لە جیهانێکی کراوەدا لە بەرامبەر هەموو مەیل و ئارەزوویەك، کۆمەڵێ هونەرمەند هەن گرنگییەکی گەورە بە "ئەویتر" دەدەن. من لەم پێشانگایەدا ویستوومە چەند وەچەیەکی جیاواز لەم دیالۆگەدا بەشداربن، دیالۆگ لە جیهانێکی فرەکولتووردا، لە جیهانێکدا گلۆبالیزم کردوویەتی بە گوندێك.

## پەراوێز

1–دوکومینتا: پێشانگایەکی گەورەو گرنگە، هەموو پێنج ساڵ جارێ لە شاری (کاسل)ی ئەڵمانیدا دەکرێتەوە، تا ئێستا دە پێشانگایان کردۆتەوە.

2–نام جۆن پیك: هونەرمەندێکی بە رەچەڵەك کۆرییە، لە دوای شەڕی دووەمی جیهانی بۆ ئەڵمانیاو لەوێشەوە بۆ ئەمریکا کۆچی کردووە، رۆڵێکی گرنگی لە بزووتنەوەی فلۆکسۆسدا هەبووە، بە باوکی هونەری ڤیدیۆ دادەنرێ.

3–شێری زامبا: نیگارکێشێکی ئەفریقیە لە کۆنگۆ.

### سەرنج

وەرگێڕی کوردی پێشەکی بۆ نووسیوە.

# ئینسایکلۆپیدیای زاراوەی رەخنەی ئەدەبی

- پۆزیتیڤیزم
- کاریگەریی مەوداگیری
- کۆمەڵە لێکدەرەوەکان
- سۆزخوازی
- ئەدەبی فانتازیا

# ئینسایکلۆپیدیای زاراوەی ڕەخنەی ئەدەبی


■ د. بەهرام میقدادی

● و. لە فارسییەوە: ئازاد بەرزنجی


-7-

## پۆزیتیڤیزم

ف: اثبات گرایی (فلسفەی تحققی) *Positivism*

ع: الوضعیة

پۆزیتیڤیزم لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم و دەیەکانی سەرەتای سەدەی بیستەمدا، فەلسەفەی باوی تەواوی وڵاتە خۆرئاواییەکان بوو. ئەدگاری جیاکەرەوەی پۆزیتیڤیزم، زانستێتی و بابەتخوازێتی (مەوزوعیەت)یەتی، کە رایدەگەیاند پێویستە لە لێکۆڵینەوەی ئەدەبدا میتۆدی زانستی بەکاربهێنرێ. زانست تاقە شێوەی گرنگی زانینە. میتۆدی فەلسەفەش هەمان میتۆدی زانستیەو ئەرکی فەلسەفەش دۆزینەوەی یاسا هاوبەشەکانی تەواوی زانستەکان و بەکاربردنی ئەم یاسایانەیە بۆ رێنومایی رەفتاری مرۆیی و ناسینی بونیادی کۆمەڵایەتی. پۆزیتیڤیزم نکوولی لە هەر هێزێکی تری دەرەوەی "ڕاستی -بە مانای شتی واقیعی" دەکات و باوەڕی بە میتافیزیك نیە. تەنها دەتوانین پەی بەوە بەرین کە دەبینرێ، یان بە شێوەیەکی مەنتیقی لە رێی بینینەوە ئەنجامگیری دەکرێ. هەر مەسەلەیەك کە مەسەلەیەکی شێوەیی نەبێت (واتە مەسەلەکانی مەنتیق و ماتماتیك) و قابیلی تاقیکردنەوە نەبێت، مەسەلەیەکی ئەفەرۆزکراوە. ئەفەرۆزکراو لە زمانی فەیلەسووفە پۆزیتیڤیستەکاندا بەهەر شتێك دەوترێ کە نەتوانرێ بخرێتە بەر لێکۆڵینەوەو لە رێی زانستیەوە رەتبکرێتەوە یان قبووڵبکرێ. بە واتایەکی دی کۆڵەکەی ئەم فەلسەفەیە زانستە سروشتیەکانە. ئەم فەلسەفەیە باوەڕی بە "باوەڕ" نیەو لەو بڕوایەدا کە مرۆڤی بێبەری لە ڕووداوە واقیعیەکان بەردەوام لە میتافیزیکدا بەدوای بەهرەمەندیدا دەگەڕێت.

پۆزیتیڤیزم بڕوای وایە کە نەك هەر بە تەنها سیاسەت و ئاکار، بەڵکو ئایینیش پێویستە خاوەنی سروشتێکی زانستی بێت. ئەو خاڵەی کە شایانی باسە ئەوەیە کە دەشێ هۆی دژایەتیکردنی

نائاگایانەی ئێرانیەکان بۆ پۆزیتیڤیزم، پەرەئەسەندنی زانستە سروشتیەکان بێت لە ئێراندا.

پۆزیتیڤیزم باوەڕی بە پووچەڵکردنەوە هەیە لە زانستدا– پرنسیپێك پووچەڵدەبێتەوە یەکێکی تر جێی دەگرێتەوە– بەڵام بۆ نموونە لە ئەدەبدا پووچەڵکردنەوەی لەمجۆرەو جێگرتنەوەی وەها لە گۆڕێدا نیە: "هەرکەسێ هات ساختومانێکی نوێی بیناکرد" بەڵام ئەوەی پێشووی وێران نەکرد، هەربۆیە پۆزیتیڤیزم لایەنێکی نیمچە زانستیی هەیە.

پۆزیتیڤیزم دوو جۆری سەرەکیی هەیە: پۆزیتیڤیزمی کۆمەڵایەتی و پۆزیتیڤیزمی پەرەئەستێن. هەردووکیشیان یەك بیرۆکەی هاوبەشیان هەیە: پێشکەوتن. پۆزیتیڤیزمی کۆمەڵایەتی لە ڕوانگەی کۆمەڵگەو مێژووەوە دەڕوانێتە پێشکەوتن و پۆزیتیڤیزمی پەرەئەستێنیش لە ڕوانگەی فیزیکی و بایۆلۆژییەوە لێیدەڕوانێت.

بیرمەندانی وەکو ئۆگست کۆنت و جۆن ستیوارت میل، نوێنەرانی شێوەی یەکەمیان و هێربرت سپنسەریش نوێنەری شێوەی دووەمە. بۆ نموونە ئۆگست کۆنت ڕەوتی هزری مرۆیی دەکا بە سێ قۆناغەوە: قۆناغی خودایی کە سەرچاوەی هزری ئەفسانەییە جێی خۆی دەدات بە ئەبستراکتەکانی قۆناغی میتافیزیکی. پاشان قۆناغی پۆزیتیڤ یا قۆناغی زانستی دێت. لە ئەنجامدا، پۆزیتیڤیزمی فەلسەفی، لە ڕاستیدا سیستمێکی سەرچاوە هەڵگرتوە لە قبوولکردنی میتۆدی زانستی وەکو تاقە ڕێی زانینی متمانەپێکراو.

پۆزیتیڤیزم شێوەیەکی هاوچەرخیشی هەیە: پۆزیتیڤیزمی مەنتیقی، ئەو فەلسەفەیەی کە ئەندامانی ئەڵقەی ڤیەننا لە دەیەی *1920*دا دایانهێنا. ماهیەتی شۆڕشگێڕانەی کاری پۆزیتیڤیستە مەنتیقیەکان ئەوەیە کە سەرلەنوێ مەنتیقی نوێ و زانستی نوێیان سەبارەت بە وێناکردنە سوننەتی و شێوە فیکرییە سوننەتیە بەکاربراوەکان، یا شیکردۆتەوە یا گوزارشتیان لێکردوونەتەوە. ئەوان لەو بڕوایەدان کە مەسەلە فەلسەفیە کۆنەکان، یان ئەفەرۆزکراوو بێمانان، یانیش لە ڕێی تەکنیکە مەنتیقیەکانەوە قابیلی هەڵوەشاندنەوەو لەنێوبردنن.

دەشێ ئێستا پۆزیتیڤیزم وەکو ڕێبازێکی کامڵ تەماشا نەکرێ، بەڵام گەلێ لە شێوازەکانی تا ئێستاش لە بواری هزرو کاردا پەیڕەوی دەکرێن. بۆ نموونە، دەتوانین بڵێین کە ڕەخنەی مارکسیستی پۆزیتیڤیستانەیە، لەبەرئەوەی سەبارەت بە ئەدەب حوکم دەدات و دەڵێت: پێویستە ئەدەب لە خزمەتی حیزب و کۆمەڵگاو چینی کرێکاردا بێت. کاردانەوەی سەلبی بەرامبەر بە ئەدەبی ڕیالیستی و بایەخدان بە ڕەمزخوازی (سیمبولیزم) لە دەیەکانی سەرەتای سەدەی بیستەمدا، لە نیشانەکانی یاخیبوونن دژ بە پۆزیتیڤیزم.

### سەرچاوەکان


-Edwards, Paul, ed, The Encyclopedia of Philosophy. Vol. 6, New York: Macmillan Publishing Co., Inc. & The Free Press, 1972.

-Magee, Bryan, Men of Ideas, Some Creators of Contemporary Philosophy, Oxford: University Press, 1989.


-8-

## کاریگەریی مەوداگیری

ف: اثر فاصله گزاری *Alienation Effect*

ع: تأثير التغريب

ئەم زاراوەیە بۆ یەکەمجار لە ڕێی برتۆڵت برێشتی شانۆنامەنووسی ئەڵمانیەوە هاتە نێو دونیای زاراوە

دەدەبیەکانەوە. برێشت دەڵێت نمایشی نموونەیی ئەو نمایشەیە کە بتوانێ ئەو خەیاڵاتانەی خۆی دەیانخولقێنێت؛ نابوونیان بکات. برێشت ئەم بڕوایەیەی لە سپایتزەرەوە وەرگرتبوو، سپایتزەر باسی لە بنەمای هەوداگیری کردبوو، ئەو بڕوای وایە کە لە ڕێی ئەم میتۆدە پێشنیازکراوەوە کاری هونەری بەجۆرێك دەخولقێ کە لە هەمانکاتدا جۆرێك لە نامۆیی لووژی لای وەرگر دروستدەکات.

تیۆرەی تیۆرەسازانی ئەدەبیش پێیان لەسەر بنیاتەی داگرتووە. چەمکی (ئازادبوون لە خود)ی هەلێن کیتس و (بە هەڵواسراوی هۆشیارانە)ی بڕوانەکەرانەی "کۆلریج"یش جەخت لەسەر گرنگیی هەوداگیری و جیابوونەوەی نووسەر و خوێنەر دەکەن. برێشت بڕوای وایە کە پێویستە بینەر مەودایەك لە نێوان خۆی و کاری ئەدەبیدا بهێڵێتەوە؛ تا نەکەوێتە ژێر کاریگەریی هەست و سۆزە بێ بناغەکانەوە؛ لەسەر ئەو بنەڕەتەش حوکمی هەڵە نەدات. بۆ بەدەستهێنانی کاریگەریی هەوداگیریش لە نمایشدا، هەر وەسیلەیەك کە بتوانێ خستنەڕووی واقیعیانە تێکبدات؛ گونجاوە. دەکرێ سوودوەرگرتن لە دەقسازانێ خولقاندنی ئەتموسفێرێکی جۆراوجۆرانەی سەیرو سەمەرە، تێکهەڵکێشانی بەدوایەکدا هاتنی زەمەنی ڕووداوەکان، بە ڕێگایەك بامبدرێن بۆ بەدەستهێنانی کاریگەریی هەوداگیری.

لە ڕوویەکەوە دەتوانین کاریگەریی هەوداگیری بە چەمکی (نامۆکردن)ی شکلۆفسکی بشوبهێنین. ئەو دەڵێت گەورەیی هونەر لەوەدایە بتوانێ ڕووداوێکی ئاشنامان بمنۆ نامۆ بکات. چەمکی (مەودای ئیستاتیکی)یش لە هەندێ ڕووەوە لە چەمکی کاریگەریی هەوداگیری دەچێت، لەو چەمکەشدا ئەو مەودایە لە کاتێکدا دروستدەبێ کە ئەزموون یان هەستی هونەرمەندانە بە شێوازێك بەرجەستە بێ کە بتوانرێ جیا لە خوێنەرەکەی و وەکو ئەزموونێکی سەربەخۆو کامڵ دەرکبکرێ. چەمکی ئەفیکردنی کەسێتی لای ئەلیوتیش هەر دەچێتە ئەم چوارچێوەیەوە. دوای "برێشت"یش، بیرمەندێکی وەکو ڕۆلان بارت لە وتارە بەناوبانگەکەیدا (مەرگی نووسەر) باسی ئەوەی کردووە کە لە دەقی ئەدەبیدا ئەوە خوێنەرە کە ئامادەگیی هەیە، نەك نووسەر؛ ئانامادەبوونی نووسەریش خۆی لە خۆیدا کاریگەریی هەوداگیری بەهێز دەکات.

لە سەرێکی ترەوە هاودژێتی کاریگەریی هەوداگیری لەگەڵ بنەمای ڕاستەقینەیی (یان ڕاستگۆیی)دا شتێکی ڕوونە؛ لەبەرئەوەی لە بنەمای ڕاستەقینەییدا دەبێ کاری هونەری لە ڕاستی (واقعیەت) بچێت. بەم پێیە چەمکی ئەرستۆییش بۆ نمایش دەچێتە ژێر پرسیارەوە، لەبەرئەوەی نووسەری مۆدێرن بە هیچ جۆرێك مەبەستی نیە (پاکژکردنەوە– کاتارسیس) یان خاڵیکردنەوەی هەڵچوونەکان بخولقێنێت. ئەنجامی مەنتیقی پاکژکردنەوە، تێکەوتنی عاتیفیانەی بینەرە تا ئەو ڕادەیەی کە بەبێ سێ و دوو بیروڕاکانی نووسەر قبووڵدەکات.

ڕێگەچارەی پێشنیازکراوی برێشت بریتیە لە بایەخدان و جەختکردنەوە لەسەر تەکنیکە جیاجیاکانی نمایش. دەبێ بەردەوام بینەر لەوە ئاگادار بکرێتەوە کە ئەوەی دەیبینێت ڕاستەقینە نیە. نابێ ئازادیی وەرگر سنوورداربێت. ئەو دەبێ لە بری قبووڵکردنی کوێرانەی پەیام و بەهاکانی نووسەرو هاودەردی و هاوخەمی لەگەڵ کاراکتەری نمایشەکە؛ بەرامبەر ئەو کارە هونەرییەی بینیویەتی ئازادانە ڕا بدات و پەیوەندییەکی جەدەلیانەی لەگەڵدا دروستبکات. دەبێ ئەکتەرانیش هانبدرێن تا مەودایەك لە نێوان خۆیان و ئەو کاراکتەرەدا دروستبکەن کە دەوری دەبینن. ئەمەش لەگەڵ پرنسیپی لاساییکردنەوەی ئەرستۆدا ویکنایەتەوە.

دەبێ ئەکتەری شانۆ جگە لەو دەورەی کە دەیبینێت؛ دەورێکی تریش بهێنێتەوە یادی خوێنەر و تەواوی ئەگەرەکان بە جۆرێك لە هۆشمەندیی بینەردا زیندوو رابگرێت کە بینەر بە ووریاییەوە دەورەکە بە یەکێك لە ئەگەرەکان بزانێت. لە روانگەی برێشتەوە جیاوازیی نێوان راستەقینەو هونەرەکە دەشێ ببێتە مایەی رەخنەی ئایدیال. بەم پێیە خاڵی قورسایی هەڵسەنگاندنی ئەدەبی لە کاریگەریی عاتیفیانەی کارەکەوە دەگۆڕێ بۆ کاریگەریی گشتیی کارەکە. لە دیدگای برێشتەوە پەیامی شانۆ بریتیە لەوەی کە لە ڕێی نمایشەوە بینەر تێگەیشتنێکی سیاسی بەدەست بهێنێت، بەڵام ئەو مانا سیاسیانە بەجۆرێك بخرێنەڕوو کە بە خولقاندنی کاریگەریی مەوداگیری؛ ڕێ لە حوکمی عاتیفیانەی وەرگر بگرن و بەرەو رەخنەیەکی دروست و بێلایەنانە ڕێنمایی بکەن.

## سەرچاوەکان


-Bigsby, G. W. E. A Critical Introduction to Twentieth Century American Drama. 3 Vols. Cambridge University Press, 1985.

-Dupriez, Bernard, A Dictionary of Literary Devices. Trans. Albert W. Halsall. Toronto: Harvester Wheatsheaf, 1991.

-Holman, C. Hugh and William Harmon. Altandok of Literetute. 6 th ed. New York. Macmillan, 1992.

-Maxwell, D. E. S. A Critical History of Modern Crish Drama 1891- 1980. Cambridge: Cambridge University Press, 1988.

-Shipley, T Joseph. Dictionary of World Literary Terms. Boston: Winters Inc, 1989

*سلیمانی، محسن. واژگان ادبیات داستانی. تهران: چاپ سحاب 1372.*


-9-

## کۆمەڵە لێکدەرەوەکان

**ف: اجتماع های تحلیلی**

*Interpretive Communities*

**ع: الجماعات المفسرة (أو المؤوِّلة)**

کۆمەڵە لێکدەرەوەکان زاراوەیەکە کە بۆ یەکەمینجار لەلایەن ستانلی فیشەوە هاتە ناو بواری رەخنەی ئەدەبیەوە. فیش لەو رەخنەگرانەیە کە بروایان وایە رۆڵی خوێنەری دەق لە پەیبردن بە مانای دەقدا زۆر گرنگترە لە رۆڵی دەق خۆی لە روونکردنەوەی ماناکانیدا. بە دەربڕینێکی دیکە خوێنەرانی دەق مانا دروستدەکەن، نەك دەق خۆی. فیش لەم بروایەوە پرسیار لە شتێك دەکات کە سەرنجی بەلای خۆیدا ڕاکێشاوە. ئەو دەپرسێت: هەندێجار دوو خوێنەر یان زیاتر یەك لێکدانەوەیان بۆ دەقێك هەیە: هۆی ئەوە چیە؟ هەروەها فیش دەپرسێت کە چۆن خوێنەرێك بۆ شیکردنەوەی دوو دەقی جیاواز؛ سوود لە شێوە جیاوازەکان وەردەگرێت؟ خۆیشی وەڵامدەداتەوە کە نابێ هۆی ئەوە بۆ جیاوازی و یەکسانیی ئەو خوێنەرانە یان جیاوازی و یەکسانیی ئەو دەقانە بگەڕێنینەوە، بەڵکو دەبێ بیگەڕێنینەوە بۆ ڕێگەکانی شیکردنەوە. هەرخوێنەرێك کە ڕووبەڕووی دەقێك دەبێتەوە، هەر بە سروشت ئامادەگیی پێشینەی تیایە کە لە نێوان ڕێگاکانی شیکردنەوەدا ژمارەیەکیان بەکاربەرێت، ئەمەش دەبێتە مایەی لێکدانەوەیەکی تایبەتی بۆ دەقەکە. فیش تا ئەو رادەیە پێدادەگرێت کە خوێنەر لە ڕێی بەکاربردنیەوە بۆ ئەم ئاقارانەی شیکردنەوە، لە راستیدا دەقێکە نایخوێنێتەوە، بەڵکو دەینووسێتەوە. بەمجۆرە خوێنەرێکی تریش کە هەمان ئەو ئاقارانە بەکاردەبات، هەمان ئەو دەقە دەنووسێتەوە کە خوێنەرەکەی پێشوو نووسیویەتیەوە و دروستیکردووە. بەمجۆرە

لێکچوونی لێکدانەوەی دوو خوێنەری جیاواز بۆ دەقێك بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لەبەرئەوەی ئەو دوو خوێنەرە ئاقاری شیکردنەوەی چوونیەك بەکاردەبەن؛ یەك دەق لە زەینیاندا دەخولقێنن و بێگومان یەك دەرك و یەك شیکردنەوەشیان بۆی دەبێت. لە سەرێکی تریشەوە کە خوێنەرێك بە دوو شێوەی جیاواز مامەڵە لەگەڵ دوو دەقدا دەکات، هۆیەکەی ئەوەیە کە ئەم خوێنەرە ئامادەگیی پێشینەی هەیە کە سەبارەت بەم دوو دەقە ئاقاری شیکردنەوەی جیاواز بەکاربهێنێت، هەمان خوێنەر دەیتوانی ئامادەگیی پێشینەی هەبێت کە سەبارەت بەم دوو دەقە، یەك ئاقاری شیکردنەوە بەکاربهێنێت و لێکدانەوەیەکی چوونیەکی بۆ ئەو دوو دەقە دەستبکەوێت.

بەم ڕوونکردنەوانەدا دەردەکەوێ کە لەم پرۆسەی شیکردنەوانەدا شتێك هەیە کە دەکەوێتە پێش کاری خوێندنەوەوە. شتێك کە دەبێتە هۆی بڕیار وەرگرتنی سەرەتایی چوونیەك و ئاقاری شیکردنەوەی چوونیەك لە چەند خوێنەری جیاوازداو هەروەها بۆتە هۆی ئەوەی کە خوێنەر بە شێوەیەکی ڕێك و پێشبینی کراو؛ هەڵوێستی جیاوازی بەرامبەر دەقە جیاوازەکان هەبێت، بێگومان بۆ ئەمەش دەبێ پەنا بەرێتە بەر ئاقارەکانی شیکردنەوە. لێرەوەیە کە بە بڕوای ستانلی فیش ناچارین ئەوە قبوولبکەین کە "کۆمەڵە لێکدەرەوەکان" هەن. واتە کەسانێك کە یەك ستراتیژی شیکردنەوە (یا لێکدانەوە) بەکاردەهێنن، ئەندامی یەك کۆمەڵی لێکدانەوەن، کەسانێکیش کە ستراتیژی جیاوازی لێکدانەوە بەکاردێنن؛ سەر بە کۆمەڵەی لێکدانەوەی جیاوازن. دەتوانین بڵێین هەموو ئەو کەسانەی کە لەسەر یاسا بنچینەییەکان بۆ لێکۆڵینەوە لە دەقێك کۆکن؛ سەر بە یەك کۆمەڵەی لێکدانەوەن. کەواتە هەر جێگیریی ناو بونیادی ئەو کۆمەڵەی لێکدانەوانەشە کە دەبێتە هۆی جێگیری لە لێکدانەوەی ئەندامانی هەر کۆمەڵەیەکدا، هەروەها دەبێتە هۆی ئەوەی دوو گرووپ کە سەر بە دوو کۆمەڵەی لێکدانەوەی جیاوازن، لە جیاوازیی ڕاو بۆچوونیشیاندا جێگیری هەبێت.

کەواتە دیسانەوە جەخت لەوە دەکەین کە بە بۆچوونی فیش جێگیری لە دەقێکی ئەدەبی تایبەتیدا چ مانایەکی نیە، لەبەرئەوەی دەشێ ستراتیژەکانی لێکدانەوەی کۆمەڵەیەکی لێکدانەوە ببێتە مایەی ئەوەی کە ئەندامەکانی، بەیەك شێوە هەموو دەقەکان لێکبدەنەوەو یەك مانای لێ هەڵبهێنجن و سەرەنجامیش، هەموو دەقەکان وەکو یەك تەماشا بکەن.

هەروەها دەتوانین کۆمەڵەکانی لێکدانەوە بە دەستەیەك خەڵك بشوبهێنین کە یاسای دەستووریی هاوبەشیان هەیەو ئەم یاسایانە ڕێ بۆ گۆڕانکارییە دەستوورییەکان و دەرکی ماناکان خۆشدەکەن و ئاقارەکانی لێکدانەوەش لەم گۆڕانکارییە دەستوورییانە دەچن کە ئەو خەڵکە بەکاریدەبەن تا ماناکان کەشفبکەن یان دروستیانبکەن. پێویستە ئەوەش بڵێین کە بە بڕوای فیش، ئەم ستراتیژانەی لێکدانەوە بە شێوەیەکی سروشتی لە مرۆڤدا نین، بەڵکو فێری ئەم میتۆدو ستراتیژانە دەبێت.

کۆمەڵەکانی لێکدانەوە گەرچی پێدەچێ پاساودەری گەلێ مەسەلەی ڕەخنەی ئەدەبی بن، بەلام خۆیان دەکەونە ژێر هەندێ ڕەخنەوە کە پێویستیان بە پاساو هەیە. یەکێك لەو ڕەخنانە ئەوەیە کە دەشێ دوو کەس سەبارەت بە دەقێك کۆك بن، بەلام سەبارەت بە دەقێکی تر کۆك نەبن. ئایا ئەم دوو کەسە سەر بە یەك کۆمەڵەی لێکدانەوەن، یان سەر بە دوو کۆمەڵەی لێکدانەوەی جیاوازن؟ ئەمە پرسیارێکە تا ئێستا وەلامی نەدراوەتەوە. پرسیارێکی تر ئەوەیە کە بە گوێرەی

بنەما بونیادییەکانی کۆمەڵەکانی لێکدانەوە ؛ کەسانێك کە یەك لێکدانەوەی هاوبەشیان بۆ دەقێك هەیەو کەسانێك کە دەتوانن بیروبۆچوونە جیاوازەکانیان یەکلایی بکەنەوەو بەیەك لێکدانەوە بگەن، هەموو سەر بە کۆمەڵەیەکی لێکدانەوەن، بەڵام کەسانێك کە هیچ زەمینەیەکی هاوبەشیان بۆ گفتوگۆو ڕێکەوتن لەگەڵ یەکتردا نیە، سەر بە دوو کۆمەڵەی لێکدانەوەی جیاوازن. لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشێ کە ئەگەر جیاوازیی بیروبۆچوونی دووکەس سەبارەت بە دەقێك، مەرجی ئەندامبوونی هەردووکیان نەبێ لە کۆمەڵەیەکی لێکدانەوەدا، کەواتە چۆن دەڵێین بە تەنها ئەندامەکانی کۆمەڵەیەکی لێکدانەوە دەتوانن سەبارەت بە جیاوازییەکانیان لەگەڵ یەکدا گفتوگۆ بکەن؟ لە کاتێکدا ئەمانە دەبێ بۆچوونیان جیاواز نەبێت، هەروەها شتێکی تر ئەوەیە کە ستانلی فیش بە داهێنانی چەمکی "کۆمەڵەکانی لێکدانەوە" لە ڕاستیدا بە جۆرێك لە جۆران؛ بە تەواوەتی کۆتایی بەو باسە هێناوە کە ئایا دەق گرنگترە یان کەسی خوێنەرو هەموو پرۆسەکانی بەرهەمهێنانی مانا دەگەڕێنێتەوە بۆ ئاقارەکانی لێکدانەوەی کۆمەڵەکانی لێکدانەوە، بەڵام چارەسەرکردنی کێشەکە بەمجۆرە نرخی گرانی خۆی هەیە، لەبەرئەوەی بە قبوولکردنی کۆمەڵەکانی لێکدانەوە کەسەکان لە چوارچێوەی لێکدانەوەی ئەو کۆمەڵەیەدا بەنددەکرێن، کە پێیەوە وابەستەن و ئازادییان زەوتدەکرێو وا دێتە بەرچاو کە بەرەنگاریی تاکەکەس لە ئاست ڕێکەوتنامە باڵادەستەکانی سەر بەو کۆمەڵانەدا جێی ڕەتکردنەوەیە.

هەروەها ئاماژە بۆ ئەو خاڵە نادیارەش کراوە لە گوتاری فیشدا کە ئەم ڕەخنەنووسە ئەوە دیاری ناکات ئایا کۆمەڵەکانی لێکدانەوە چۆن پەیدا دەبن، بۆچی دەگۆڕێن و چۆن ئەندامەکانیان لەگەڵ یەکدا پەیوەندییان هەیەو کار لە یەکدی دەکەن.

لە کۆتاییدا دەشێ بڵێین کە کۆمەڵەکانی لێکدانەوە بە مانا وەسفیەکەیان و بێ دەمارگیری سەبارەت بە گشتگیریی هەمەکیانەیان، دەکرێ وەڵامدەرەوەی بەشێك لە پرسیارەکانی ڕەخنەی ئەدەب بن.

## سەرچاوەکان


-Freund, Elizabeth, The Return of the Reader- Response Criticism. London: Methuen, 1987.

-Hawthorn, Jeremy, A Concise Glossary of Contemporary Literary Theory. London: Edward Arnolds. 1992

-Lodge, David (ed). Modern Criticism and Theory, Longman, 1998.

-Scholes, Robert, Textual Power: Theory and the Teaching of English. New Haven. Yale University Press, 1985.

-Selden, Raman, A Reader's Guide to Contemporary Literary Theory. London: Longman, 1990.


## 10
## سۆزخوازی

ف: احساسات گرایی *Sentimentality*

ع: العاطفية

بە شێوەیەکی گشتی زاراوەی سۆزخوازی (=عاتیفەگەرایی) مانایەکی نەگەتیڤ بە زەیندا دەهێنێت. لە فەرهەنگە جۆراوجۆرەکانی زاراوەی ئەدەبیدا، مانای تری وێکچوو بۆ ئەم زاراوەیە دانراوە. لە فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبیی ئەبرامزدا

ئەم زاراوەیە بەمشێوەیە لێکدراوەتەوە: "دەربڕینی سۆزێکی زۆر لە ئاست هەڵوێستە جۆراوجۆرەکاندا، یان بە واتایەکی دی، نوقمبوون لە سۆزی *ناسکی* کارتێکراو و هاوخەمی".

ئەبرامز بڕوای وایە کە ناولێنانی ئەم زاراوەیە ڕێژەییە، لەبەرئەوەی کەسە جیاوازەکان لە کاتە جیاوازەکاندا بەرامبەر ئەوەی کام سۆزانە زیاتر پێویستن، بۆچوونی جیاوازیان هەیە. بۆ نموونە شاعیرانی ڕێبازی ڕۆمانتیك، وەکو پیرسی شیللی، هەڵچوون و عاتیفەی وا لە کارەکانیاندا دەخەنەڕوو کە بەلای ئەبرامز پێوەری دیاریکردن، رادەی سۆزو توندی و لاوازیی ئەو سۆزە نیە، بەڵکو چۆنێتیی دەربڕین و خستنەڕوویەتی. ئەو کارانە لەم خانەیەدا پۆلێن ناکات کە لە بری ئەوەی لە ڕێی سوودوەرگرتن لە هونەرەکانی زمان و تەکنیکە ئەدەبیەکانەوە بە شێوەیەکی نوێ و جوان هەست و سۆز بخەنەڕوو؛ دەچن بە شێوەیەکی کلێشەیی و دووبارە بۆوە؛ دەیخەنە ڕوو.

(ئێکس. جی. کەنەدی) بڕوای وایە کە هەر نووسەرێك دەبێ بە جۆرێك سۆز بخاتەڕوو کە خوێنەریش بتوانێ بە مەعقول و مەنتیقیی بزانێت. بە دەربڕینێکی دی، پێشزەمینەو چۆنێتی کارە عاتیفیەکان، لە کارە بەرزە ئەدەبیەکانی تریان جیادەکاتەوە.

ئای. ئەی. ریچاردز زیاتر دەچێتە ناو قووڵایی ئەم مەسەلەیەوەو لایەنە جۆراوجۆرەکانی سۆزخوازی بەشێوەی ڕێکوپێك پۆلێن دەکات و لێیاندەکۆڵێتەوە. بە بۆچوونی ئەو لایەنی چۆنێتیی سۆزخوازی بە تەنها یەکێکە لە حاڵەتەکانی و لایەنی تریش هەن کە جێی سەرنجن:

*1*-لە لایەنی چەندێتیەوە، سۆزخوازی کاتێ هەیە کە وەڵامی تاکەکەس بۆ ئەو هەڵوێستەی هاتۆتەگۆڕێ، زیاد لە ڕادە پێویست بێت.

*2*-لە لایەنی چۆنێتیەوە، سۆزخوازی هاوتای "کاڵی"ی سۆزەکانە.

*3*-لەلایەنی دەروونناسیەوە، سۆزخوازی کاتێ هەیە کە وێڕای فاکتەری گۆڕانکارو لەژێر کاریگەریی ئەزموونەکانی پێشووماندا، سۆزمان بۆی وەکو خۆی مابێت (وەکو خۆشەویستی و هۆگر بوون بە شتێکی تایبەتیەوە، یان ژیان لە خانوویەکدا کە ئیدی پەرپووت بوەو بە کەڵك نەماوە). یان بە پێچەوانەوە، کاتێ سۆزمان لە ئاست هەڵوێستێکی نەگۆڕدا؛ بگۆڕێت (وەکو کەسانێك کە ساڵانێك پاش ئەو جەنگەی نەفرەتیان لێدەکرد؛ ڕۆژگاری جەنگ بە یەکێك لە ڕۆژگارە خۆشەکانی ژیانی خۆیان بزانن).

ریچاردز هەوڵدەدات لە ڕەگوریشەو هۆیەکانیش بکۆڵێتەوەو سەرکوتکردنی سۆز بە یەکێك لە گرنگترین هۆیەکانی عاتیفیبوون دەزانێت. لە ڕاستیدا، بەپێی بۆچوونی ئەو، پەنابردنە بەر سۆزی زێدەڕۆو نامەعقول کاردانەوەیەکە بەرامبەر ئەو کۆسپ و لەمپەرانەی ڕێ لە دەربڕینی ئازادانەی سۆزە دەروونیەکان دەگرن.

ئەو پاشان لە چۆنێتیی جلەوکردنی سۆزە نامەعقولەکان دەتوژێتەوەو لە میانی ئەو تیۆرەیەی پێشووی خۆیەوە سەبارەت بە سەرکوتکردنی سۆز، ئەوە پێشنیازدەکات کە تاقە ڕێگەچارە ئەوەیە کە لەبری ڕێگرتن لە سۆزە جیاوازەکان، هەوڵبدەین بەشێوەیەکی ڕاشکاو و ئاشکرا لە هەڵوێستە دیاریکراوەکاندا بیانخەینەڕوو، تا لە شێوەیەکی نامەعقول و زێدەڕۆدا دەرنەکەون.

لە کۆتاییشدا دەڵێت کێشەی کەسی عاتیفی ئەوە نیە کە سۆزەکانی خۆی لە هەڵوێستە بێ سنوورو فراوانەکاندا "خەرج" دەکات، بەڵکو کێشەکە ئەوەیە کە ئەو هەڵوێستانە زیاد لە پێویست قالبی و سنووردارن.

## سەرچاوەکان

- I. A. Richards, Practical Criticism, A Study of Literary Judgement, 10th ed. London: Routledge and Kegan Paul, Ltd 1964.

-M. H. Abrams. Glossary of Literary Terms, 3rd ed. New York: Holt, Rinehart and Winston, Inc, 1970.

-X. J. Kennedy, Literature, An Introduction of Fiction, Poetry and Drama, 5th ed. Harper Collins Publishers, 1991.


## 11
## ئەدەبی فانتازیا

*Fantastic Literature* ف: ادبيات شگرف

ع. أدب الفنتازيا

بێگومان کاتێ دەڵێین ئەدەبی فانتازیا یەکسەر ناوی رەخنەنووسی بولگاری "تزفیتان تۆدۆرۆڤ"مان بە بیردا دێ. لێکۆڵینەوەکانی ئەو لە بواری رۆمان و بونیادی رۆماندا، بوە مایەی پەیدابوونی ئەم پێناسەیە لە ئەدەبی هاوچەرخدا.

تۆدۆرۆڤ لە کتێبێکدا بەناوی "سەرەتایەك بۆ ئەدەبی فانتازیا" باسی ئەمجۆرە ئەدەبە دەکات و شییدەکاتەوە. ئەدەبی فانتازیا لای تۆدۆرۆڤ بەشێکی سەرنجراکێشی چیرۆکی هاوچەرخەکان دەگرێتەوە. ئەو خاڵەی پێویستە سەرنجی بدەین ئەوەیە کە ئەدەبی فانتازیا سوود لە چەند تایبەتمەندێتیەك دەبینێت کە لە خۆیاندا قابیلی تۆژینەوەن. لەوانە دەکرێ ئاماژە بۆ -راستی نواندن- بکەین (واتە پیشاندانی شتێك بە جۆرێك کە راست بنوێنێ. -و-)؛ بۆ نووسەر ئەوە گرنگە کە بتوانێ لە رێی پیشاندانی وێنەیەك لە راستی- کە رۆڵی خودی راستی دەبینێت- خوێنەرەکەی بخاتە ناو دنیای رۆمانەکەیەوە. ئەمە بەو مانایە دێ کە نووسەر بە سوودوەرگرتن لە شێوازی راستی نواندن، وێنەیەك لە راستی پیشانی خوێنەر دەدات. ئەنجامەکەش ئەوە دەبێت کە خوێنەر خۆی هەستدەکات لەناوجەرگەی چیرۆکەکەدایە.

پێویستە ئەوە بڵێین کە خستنەرووی وێنەیەك لە راستی، تاقە شێوازی بەدەستخستنی راستی نواندن نیە لە چیرۆکدا. تۆدۆرۆڤ باوەری وایە کە گوتەزای *راستی نواندن* لە دوو توخمی پێکهێنەر پێکهاتووە: راستی و رونیا. چیرۆکنووس بە سوودوەرگرتن لەم دوو توخمە لە بەنایەکدا، دەتوانێ ئاوێتەیەك بخولقێنێت کە بە پلەی یەکەم هەستی بە راستەقینەیی لای خوێنەر دروستبکات، پاشان بەرەو رووی گومان و ناروونی (ئاڵۆزی- تەمومژ)ی بکاتەوە.

گوتەزای ناروونی یەکێکە لە گرنگترین ئەو خاڵانەی کە تۆدۆرۆڤ زۆر جەختی لەسەر دەکات. لە راستیدا، پێناسی ئەو بۆ ئەدەبی فانتازیا ئەو ئەدەبە دەگرێتەوە کە گومان و ناروونیی تیایە. بە دەربرینێکی دی، ئەدەبی فانتازیا هاوتای ئەدەبی تەمومژە.

تۆدۆرۆڤ لە فەسڵی دووەمی کتێبی "ئەدەبی فانتازیا"دا زمانی ئەدەبی فانتازیا شیدەکاتەوەو لێیدەکۆڵێتەوە. لەبەرئەوەش کە بە بۆچوونی ئەو شێوە (فۆرم)ی رۆمان لە ناوەرۆکەکەی گرنگترە، دەتوانین بڵێین کە ئەو رەخنەگرێکی شێوەخواز (فۆرمالیست) بوو. پێداگرتنی تۆدۆرۆڤ لەسەر زمان لەوەوە دێ کە زمانی چیرۆك تاقە ئامرازی پەیوەندیی ئەوە بە خوێنەرەوە. هەربۆیە دەبێ زمانی چیرۆك لەخۆگرو تەمومژاوی و نائارامکەر بێت. زمانی تەمومژاوی و هەروەها رۆمانی تەمومژاوی، وەکو کارەکانی کافکا، دەشێ چەندین ماناو لێکدانەوە لەخۆی بگرێت. وەکو ئایزەر، تۆدۆرۆڤیش بروای وایە کە لە بنەرەتدا مانایەکی ئامانجدار یان دوا مانا لە گۆرێ نیە. ئەوەی مانا بە دەق دەبەخشێت، خوێنەرە. هەر خوێنەرە کە لە رێی بایەخی بە دەقی

چیرۆکەکەو تەگبیرەکانی خۆی، لێکدانەوەو ڕاڤەی تایبەتیی خۆی ئەنجامدەدات، ئەمەش واتە فرەیی لێکدانەوەو ماناکان. ئەمەش هەمان ئەو شتەیە کە بۆ نموونە لە "مەسخ"ی کافکادا بەرچاومان دەکەوێ، واتە فرەیی لێکدانەوەکان، بۆ نموونە دەکرێ لێکدانەوەی ئایینی، سۆسیۆلۆژی، سایکۆلۆژی و هتد - بۆ ئەو دەقە بکرێ. خاڵی بەرامبەری ئەمە پۆزیتیڤیزمە. پێوەندیی پۆزیتیڤیزم وەکو ڕێبازێکی فەلسەفی، ڕاستیە بینراوەکان و دیاردەو ئاشکراکانە، بەردەوام بەدوای دوا ماناشدا وێڵە لە کاتێکدا ئەدەبی فانتازیا، بە پێچەوانەوەیە، ئەم ئەدەبەی کە لەم چاخەدا گەشەی سەندووە.

## سەرچاوە

*ساختار و تأویل متن- بابک احمدی*

-Fowler, Roger. Linguistics and the Novel. London; Routeledge, 1980.

-Harrison- Barbet, Anthony. Mastering Philosophy London: Macmillan, 1990.



لە لێنتەرنێتەوە

# فایلی ژمارە

# لێکبوردن

# لێکبوردن

■ جۆرج تەرابیشی

● و. لە عەرەبییەوە: لاوکۆ

لە نوسینی ئەم کتێبەدا

*(Francoise Barret- Duc Roq (ed). L'intolerance. Grasset, Paris. 1998. 297 Pages)*

پەنجا نووسەری جیهانی بەشداریوون - پێنج لەوانە عەرەبن-. تەوەری سەرەکی کتێبەکە قسەکردنە لەسەر چەمکی (لێکبوردن). بێگومان ئەم چەمکە بەرهەمی قۆناغی مۆدێرنەیە. ئەو پەنجا رۆشنبیرەشی لێرەدا تاوتوێی ئەم چەمکەیان کردووە، لەرووی مێژوویی و فەلسەفی و تیۆلۆژیەوە کەوتونەتە باسکردنی، بە گەڕانەوە بۆ سەرجەم کولتوورەکانی دنیای کۆن و ناوەڕاست و بەتایبەت دنیای تازە، تەبان لەسەر ئەوەی کە ئەم چەمکە بەرهەمی سەردەمی مۆدێرنەیە.

ئەقڵی مۆدێرن بە ئاقارە لیبرالیی و پلورالیزمیەکەیەوە بەپێچەوانەی ئەقڵی دۆگمایی و تاک رەهەندی سەدەکانی ناوەڕاستەوە، توانی ئەم چەمکە بگەیەنێتە ئاستی فۆرمەلەکردنێکی تیۆری، ئەویش لەڕێگای (پەیامێك دەربارەی لێکبوردن) کە سالی 1689 "جۆن لۆك"ی فەیلەسوفی ئینگلیزی بلاویکردەوە.

"لۆك" لەو کتێبەیدا داوای یەکسانی مافی بۆ تەواوی ئاینزاو دەستەو تاقمەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی ئینگلیزی دەکرد، هەر لە پرۆتستانتەکانەوە بۆ کاتۆلیکیەکان و، بەبێ ئافەرۆزکردن و وەلاوەخستنی (بت پەرست و موسلمان و یەهود)ی. ئەمەش لەسەر بنەمای لێك جیاکردنەوەی دەسەلاتی دەولەت لە دەسەلاتی کلێسا.

بەلام کاتێك دەلێین چەمکی (لێکبوردن) چەمکێکی مۆدێرنە، ئەمە مانای ئەوە ناگەیەنێ نەفی ئەوە بکەین کە ئەم چەمکە چ وەك هەڵوێست و چ وەك رەفتار پێشینەیەکی دێرینتری نییە. شارستانیەتە کۆنەکان سەرەڕای تاك رەوییان، لە هەڵوێستی کرانەوە بەسەر پلورالیزمدا خالی نین - ئەگەرچی نمونەشیان دەگمەنە-. ئەوەتا لە شارستانیەتی یۆنانیدا ئاقاری سۆفیستەکان دێنە

ئاراوە، بۆ بەو دابەشکردنە ئیشنۆ– سەنتەریزمە دەوەستنەوە کە دنیای کۆنی بەسەر گریک و بەربەریەکاندا دابەشکردبوو. ئەوەتا "ئەنتیفۆن" دەڵێت (تەواوی مرۆڤایەتی بە ئازادی دێنە دنیا. ئیتر ئەگەر یۆنانی بن یاخود بەربەری بن)

لە شارستانیەتی هیلینیەکان و پاشان رۆمانیەکاندا رواقیەکان دێنە ئارا –ئەمانە کەم تا زۆر دەچەلەکیان دەگەڕێتەوە سەر ناوچەکانی بەری رۆژهەڵاتی دەریای سپی ناوەڕاست–. رواقیەکان خۆیان بە هاوڵاتی هەموو گەردون و، برای تەواوی مرۆڤایەتی دەزانی، تەنانەت ئەوانەشی کە کۆیلەو ژێردەستە بوون.

لەناو شارستانیەتی ئیسلامیشدا دیارترین ئەو کەسانەی داوای لێکبوردن و کرانەوەیان بەڕووی ئەوی دیدا دەکرد، فەیلەسوفان و عارفەکان بوون. ئاقاری فەلسەفی ئاوە دیارو مەزنەکانی وەك "کەندی‌و فارابی و ئیبن روشد" نوێنەرایەتیان دەکرد. هاوکات "اخوان الصفاء"یش لە نووسین و پەیامەکانیاندا داوایان لە (دۆست و برایانیان دەکرد کە دژایەتی هیچ زانستێك لە زانستەکان نەکەن و، سوکایەتی بەهیچ کتێبێك نەکەن و، رق و کینەش لە هیچ ئاینزایەك هەڵنەگرن. لەبەرئەوەی حەقیقەت هەرچەندە دەرکەوتنەکانی جیاوازو جۆراوجۆر بێت، بەڵام دواجار هەر هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ یەك پرانسیپ و دەگەڕێتەوە سەر یەك جیهان).

هەرچی ئاقاری سۆفیگەری کراوەشە ئەوا دیارترین کاراکتەری "مەنسووری حەللاج و محێ‌دین ئیبن عەرەبی" بوون. سەبارەت بە "حەلاج" سەربوردەیەکی بەناوبانگ هەیە دەگێڕنەوە دەڵێن: رۆژێك سەردانی یەکێك لە خوێندکارەکانی خۆی دەکات بەناوی "عەبدوڵڵای کوڕی تاهیری ئەزەدی" و، دەبینێت لە بازاڕێکی شاری بەغدادا لەگەڵ پیاوێکی جولەکەدا بەشەڕ هاتووە، جنێوی پێدەدات. "حەللاج" بە تووڕەییەکی زۆرەوە سەیرێکی "عەبدوڵڵا" دەکات و پێی دەڵێت: (جنێوی پێ مەدە چونکە عاقیبەت ئەو جنێوانە بەر خۆت دەکەون. ئاینەکان هەر هەموویان ئاینی خوای پەروەردگارن. کوڕی خۆم چاك بزانە یەهودیەت و مەسیحیەت و ئیسلام‌و ئاینەکانی دیکەش ناو و نازناوی جیاجیان. بەڵام لە جەوهەردا یەك شتن و لێك جیاوازنین). هەر بەهەمان نەفەس "ئیبن عەرەبی" هەندێك لە جوانترین شیعری خۆی دەچڕێت و دەڵێت

**دڵی من بۆتە هەڵگری هەموو وێنەیەك**

**مێرگی ئاسکەکان و کڵێسای رەبەن**

**خانووی بتەکان و کەعبەی تایف**

**لەوحەکانی تەورات و قورئان**

**ئیمان بە ئاینی خۆشەویستی دێنم رووی خۆی لەسەر جێگایەك بکات**

**چونکە خۆشەویستی ئاین و ئیمانی منە.**

لەڕاستیدا لەگەڵ دەرکەوتن و هاتنە ئارای ئاینە یەکتاپەرستیەکاندا (لێکبوردن و دەمارگیری) دەبنە بڕبڕەی پشتی مەسەلەی ئاینی. ئاینە یەکتاپەرستیەکان لە قۆناغی دروستبوون و سەرپێکەوتنیاندا دووچاری چەوساندنەوە هاتن. بەڵام دەوڵەتی سیاسی ئەو ئاینانە کە دادەمەزرێن، دواتر خۆیان دەبنە سەرچاوەیەك بۆ چەوساندنەوە. پێشوترو بەر لەم قۆناغە کەمینە ئاینیەکان بوونیان نەبوو: چونکە لە کۆڕی خواکاندا (پانتیۆن) جێگای هەمووان دەبووەوە. بەڵام لەوکاتەوەی دەزگای دەوڵەت و ئاین لە دەسەڵاتێکدا یەکیانگرت و کۆبوونەوە، هەڵوێستی ئەم دەسەڵاتە لە کەمینە ئاینیەکان بووە پێودانگێکی سەرەکی بۆ لێکبوردن یاخود بۆ دەمارگیری.

ئەڵبەتە مەبەست لە کەمینە ئاینیەکان بەتەنها کەمایەتی ئاینەکانی تر نییە، بەڵکو هاوکات مەبەست لێی ئاینزاکانی ناو یەك ئاینیشە. مێژووی پرۆتستانیەت نمونەیەکمان لەسەر ئەم دیالەکتیکی

(لێکبوردن و دەمارگیریە) بەردەست دەخات، لە چوارچێوەی تەنها ئاینێکدا کە ئایینی مەسیحیە.

ئەوکاتەی پرۆتستانیەت لەسەر دەستی "مارتن لوثەر" و لەنیوەی یەکەمی سەدەی شانزەدا هاتە ئارا، نمونەی ئایینێکی سنگ فراوان و دوور لە دەسەلاتخوازی بوو. ئامانجی سەرەکی پرۆتستانیەت ئەوە بوو کۆتایی بە هەژمونی کڵێسای کاتۆلیکی بەسەر دەقە پیرۆزەکاندا بهێنێو، ئازادی لێکدانەوەی دەقە پیرۆزەکان بە مافی هەموو بڕوادارێك بزانێت و، دەستکراوەیان بکات لەو پرۆسەیەدا.

دەستەی یەکەمی پرۆتستانت مەزهەبەکان بەدەست دەسەلاتی دنیای باباکانەوە دوچاری چەوساندنەوەیەکی زۆر هاتن. بەوپێیەشی ژمارەیەکی زۆریان پەنایان بردە بەر هۆڵەندا، ئەوا (هەرێمە یەکگرتووەکانی) کالڤینیەت- هۆڵەندا لەو سەردەمەدا بەم ناوە ناسرابوو- بووە نمونەی دەوڵەتێکی بچووك و لیبرالی. بەلام هێندەی نەبرد کالڤینە -هۆڵەندیەکان سەربەخۆیی سیاسی خۆیان بەدەستهێناو، کەوتنە مومارەسەکردنی مافی تیۆلۆژی خۆیان بۆ بە ئازادی لێکدانەوەی کتێبە پیرۆزەکان (تەورات و ئینجیل). ئیتر ئەم لێکدانەوەی خۆیانیان بە تاکە لێکدانەوەی راست و دروست دایە قەڵەم. بەمەش ئسولیەتێکیان هێنایە جێگای ئسولیەتێکی دیکەو، لەڕێی تاك رەهەندیەوە دەست بەرداری فرەیی و پلورالیزم بوون. هاوکات دەستیانکرد بە قەدەغەکردنی بڵاوکردنەوەی هەموو بیروبۆچوونێك کە لەگەڵ لێکدانەوەی ئەوان بۆ کتێبی پیرۆز ناکۆك و ناتەبا بوایە. بەمجۆرە رێگەیان لەو خوێندنی ئاقاری گەردونناسی "کۆپەر نیکۆس و گالیلۆ" گرت، لەبەرئەوەی لەگەڵ (تەورات)دا ناکۆك بوو. پاشان دواترو -تا ئێستاش ئەم حاڵەتە هەر بەردەوامە- رێگەیانگرت لەوەی تیۆرەی "داروین" سەبارەت بە دروستبوون و پەرەسەندن بخوێندرێت، لەبەرئەوەی لەگەڵ دیدگا تەوراتی و ئینجیلیەکەدا دەربارەی دروستکردنی مرۆڤ جیاوازو ناکۆك بوو.

هەربۆیە ئەدیبێکی وەك "ئەمبرتۆ ئیکۆ" دوودڵ نیە لەوەی فەندەمێنتالیزم- ئیتر سەر بە هەر ئایینێك بێت- بە سەرچاوەی سەرەکی دەمارگیری بداتە قەڵەم لە سەردەمی نوێدا. لای "ئیکۆ" فەندەمێنتالیزم بریتیە لە ئاقارێك لە تەفسیر، بەلام ئەو تەفسیرەی تەنها خۆی بەڕاست دەزانێت و تەواوی تەفسیرو لێکدانەوەکانی تریش بە هەڵە دەزانێت. زۆریش نابات ئەم تیۆلۆژیا تاك تەفسیریە دەبێتە خاوەنی مست و بازوەیەکی ئاسنین، کاتێك دەسەلاتێکی سیاسی دەیکاتە عەقیدەی رەسمی دەوڵەت و، بە زەبری هێز وەکی نمونەیەکی بالا بۆ یاسا دانان و ژیانی سیاسی لە دەوڵەتێکی دیاریکراودا دەیسەپێنێ.

بەم پێیەش نابێت دیاردەی دەمارگیری و توندڕەوی تەنها وەك دیاردەیەکی ئایینی پەتی سەیربکرێت، چونکە هەر سستەمێکی سیاسی/ تیۆلۆژی بووە خاوەنی هەر عەقیدەو ئایدیۆلۆژیایەك و هەوڵی دا بە زەبری هێز بیسەپێنێو، رێگە نەدات بە هاولاتیانی جگە لەو ئایدیۆلۆژیایە هیچ شتێکی دی هەڵبژێرن، ئەوا ئەو سستەمە سستەمێکی دەمارگیرو توندڕەوە.

ئەمەش خەسڵەتی سستەمی سۆڤیەتی و، بەرلەویش خەسڵەتی سستمی نازیزم بوو لە ئەڵمانیا. لە ئێستاشدا خەسڵەتی تەواوی بزاوتە سیاسیە فێندەمێنتالیستە هاوچەرخەکانە، ئیتر ئەو بزاوتانە ناوی ئایینیان لەخۆیان نابێت وەکی فێندەمێنتالیستی ئیسلامی یاخود هیندۆسی، یان بەناوی ئایدیۆلۆژیەوە کاربکەن وەکی حیزبی نازیە نوێیەکانی ئەڵمانیا یان پارتە راسترەوە توندڕەوەکان لە فەرەنساو ئینگلتەراو ئیتالیادا.

لە بەرامبەر وەها هەلومەرجێکدا ئەوا چەمکی "لێکبووردن" لە دیدگایەکی ئیجرائیەوە بەکەڵك و پێویست نییە. بگرە هەندێك رۆشنبیر رایدەگەیەنن کە ئەوان چەمکی (لێکبووردن) رەتدەکەنەوە، لەبەرئەوەی بە بڕوای ئەوان ئەم چەمکە تەعبیر لە بارودۆخێکی ناهاوسەنگ و نایەکسان دەکات، یان تەنانەت تەعبیر لە دۆخێکی دۆنیەت دەکات. چونکە (لێکبووردن) جۆرێکە لە چاوپۆشی لێکردن. بەمجۆرە تەنها ئەوانە چاوپۆشی دەکەن کە لەسەرەوەن و لەوێوە لەوانە دەڕوانن کە لە خوار خۆیانەوەن، ئەمەش جۆرێکە لە خۆبەزل زانی و منەت بەسەردا کردن.

رەنگە ئەم چەمکە کەم تا زۆر پەسەندکراو و پێویست بێت بۆ لێکگەیشتن و مامەڵە کردن لەگەڵ یەکتردا، بەتایبەت لەو کۆمەڵگایانەدا کە ئاشنا نین بە یەکسانی دیموکراسی و، کاروبارەکانی خۆیان بەپێی وتەزای هاولاتیبوونەوە نابەن بەڕێوە.

ئەم وتەزایەش بریتیە لە ئیلتزامێکی سەرەکی و دەستوری بۆ بە یەکچاو سەیرکردنی سەرجەم هاولاتیان لەبەردەم یاسادا، ئیتر سەر بە هەر ئایین و رەگەزێك بن و، پێستیان هەر رەنگێك بێت.

ئەم یەکسانیەی هاولاتیانیش تەنها رێگایەکە بۆ پێکەوە هەڵکردن لە چوارچێوەی کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا، ئەو کۆمەڵگایانەی لە ئێستادا نە بە تاك رەهەندی ماونەتەوەو نە لەسەر پلەبەندی چینایەتی یاخود خێڵەکیانەش دامەزراون.

گروهێکی تری رۆشنبیران پێیان وایە کە مەرجی یەکسانی لەڕووی یاساییەوە بەتەنها بەس نییە بۆئەوەی کۆمەڵگایەکی (لێکبوردوو) بێتە ئارا، بەڵکو بوونی یەکسانی لەڕووی یاساییەوە، پێویستی بەوە هەیە کە لەهەمان کاتدا پەیوەست بێت بە بێلایەنی دەوڵەتەوە لە بواری عەقیدەدا، دەسەلاتی سیاسی دەست لەوە بکێشێتە دواوە کە هیچ گوشارێك لەسەر ئازادی بیروڕا دروست بکات.

بێلایەنی ئایینی دەولەت مەرجێکی سەرەکی (لێکبووردن)ە. ئەو نمونەیەی "ئارڤن کوتلەر"ی مامۆستای زانکۆی کەنەدی لەم بارەیەوە دەیهێنێتەوە جێی سەرنجە: ئەویش نمونەی وڵاتی نەرویجە. وەك دەزانرێت ئەم دەوڵەتە بچووکە یەکێکە لە کۆنترین سستمە دیموکراسیەکانی ئەوروپا. لەگەڵ ئەوەشدا سیستمی سیاسی لەو وڵاتەدا وەکی پێویست نەبۆتە دەسەلاتێکی عەلمانی. ئەوەتا دەستووری نەرویج پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە دەبێت لە (50٪)، واتە نیوەی ئەندامانی حکومەت سەر بە کڵێسای لۆثەری بن.

سەرەڕای ئەو گرەنتیە گەورانەی دەستوری نەرویجی لە روانگەی مافەکانی مرۆڤەوە پێشکەش بە هاولاتیانی دەکات، بەلام بەم دواییانە پەرلەمانی نەرویجی یاسایەکی دارشت و، بەپێی ئەو یاسایە بواری خوێندنی گشتی دەکرێتە (مەسیحی).

بە بیانووی ئەوەی مەسیحیەتی قوتابخانە لە کۆمەلگایەکدا کە زۆریەی زۆری مەسیحین، تەنها ئامرازێکە بۆ برەودان بە بیرۆکەی (هاوچارەنووسی) و پێکەوە گرێدانی زیاتری هاولاتیانی ئەو وڵاتە، تا هەست بکەن نەرویج نیشتمانی هاوبەشی تەواوی هەموویانە بەبێ جیاوازی.

بەمجۆرە دەستوری نەرویجی چەمکی رۆشنبیریی زۆرینەی تێکەڵ بە چەمکی هاولاتی هاوبەش کردووەو، بەمەش پێشێلی بڕیاری دادگای ئەورووپی بۆ مافەکانی مرۆڤ کرد. ئەو بڕیارەی سالی 1976 دەرچوو، تەئکید لەوە دەکات کە دەوڵەت بۆی نییە لە رووی مەزهەبیەوە دەخالەت بکات بۆئەوەی کاریگەریی لەسەر بیروباوەڕی ئایینی دروست بکات، بەلکو ئەرکی دەولەت ئەوەیە بوار لەبەردەم جیاوازیو ئازادی بیروڕای ئایینی و فەلسەفی لە

کایەی پەروەردەی گشتیدا بکاتەوە، ئەو فەزایە بپارێزێت.

رەنگە دواقسە لێرەدا بۆ فەیلەسوفی فەرەنسی "پۆل ریکۆر" بێت. ئەگەرچی ئەم بیرمەندە (برواداره) بیروبۆچونەکانی لە کۆمەڵێك قەناعاتی مەسیحیەوە سەرچاوە دەگرێت، بەڵام بە ئاشکرا باس لەوە دەکات کە یەکەمین سەرچاوەی هەڕەشەو مەترسی دەمارگیری لە دنیای هاوچەرخدا، لەوەوەیە کە هەندێك دەوڵەت لە بواری بیروباوەڕی ئایینیدا لایەنگیری ئەوە دەکەن تا ئیمان بەسەر هاوڵاتیاندا بسەپێنن، ئەمەش بەتایبەتی لە چوارچێوەی مەشروعیەتی دەوڵەتدا پەیرەودەکرێت.

ئەوەی پێویستە ئەوەیە دەسەڵاتی سیاسی لەم مەسەلەیەدا بێلایەن بێت. ئەم بێلایەنیەشی تەنانەت بۆ بیروباوەڕی ئایینیش کارێکی ئیجابیە. چونکە پێویستە ئەو ئیمان و بڕوایە لە ناخی مرۆڤەوە بێتەدەرێ و لەوێوە هەڵبقوڵێت، نەك بەزۆر بسەپێنرێ و پەیوەست بێت بە دەسەڵاتێکی دەرەکیەوە.

## سەرنج

*لە هەندێ شوێندا بۆ زیاتر گەیاندنی مەبەست دەسکاری وەرگێڕانەکەم کردووەو، بە هەندێك دەسکاریەوە کردوومەتە کوردی.

*بۆ وەرگێڕانی شیعرەکەی "محی الدین بن عربی" پشتم بە وەرگێڕانەکەی برای رۆشنبیر "فاروق رەفیق" بەستووە لە وتاری (خۆرئاوا ئەوەکانی) رەهەندی ژمارە هەشت، ساڵی 1999.

## سەرچاوە

رۆژنامەی (الحیاة)، ژمارە (13224).



لە ئینتەرنێتەوە

# ڤۆڵتێر

## لێبوردن لە بەرامبەر بەپەرگیریدا*

● و. لە فارسییەوە : ئاران



خەباتی ڤۆڵتێر لەپێناوی لێکبورددندا دەگەڕێتەوە بۆ روداوە دادوەریەکانی سالانی 70-1760 (کالاس، سیرۆن، بەتایبەتی رووداوی شوالیە دولابار). ئەگەرچی تەواوی بیری ڤۆڵتێر لە سالی 1762وە سەرقالی لێکبوردن دەبێ، بەلام کتێبی وتارێك لەبارەی لێکبوردنەوە (1763) بەرنامەیەکی درێژخایەنە بۆ وروژاندنی رای گشتی بە قازانجی دژایەتیکردنی پەرگیری. روداوەکەی کالاس کە لە سەرەتای نوسینەکەدا رونکراوەتەوەو لە کۆتایشدا ئاماژەی بۆ کراوەتەوە، هەر تەنها پەیوەندی بە یەکێك یان خێزانێکەوە نییەو، تەنهاش روداوێکی دادوەری نییە، بەلکو پەیوەندی بە سەرجەم مرۆڤایەتییەوە هەیە، چونکە ئاشکراکەری ئەو مەترسییە کە پەرگیری و لێکنەبوردن بۆ هەموو مرۆڤەکانی هەیە. ڤۆڵتێر لەم نوسینەدا بە توندی هێرش دەکاتە سەر کەنیسەی کاسۆلیك و بەخوازیاری دەسەلاتی دنیایی و دروستکەری زانا دینییە بێهودەکانی دەزانێ کە دەرئەنجامەکەی لەم رستە توندو کورتەدا دەربڕیوە: مەسیحیەت، مێژووی "شانزە سەدە بەربەریەتە". رستەیەکی تری ڤۆڵتێریش دەناسین کە لە نامەیەکدا بەکاریهێناوە: خەبات لەپێناوی لێکبوردندا دەبێ ئەم "ئەنگیە

لەناوببات". مەبەست لە نەنگی لەم رستەیەدا هەر شێوەیەکی پەرگیری و بەتایبەتی پەرگیریە لە مەسیحیەتدا.

مەبەست لە پەرگیری بە وردی چیە؟ وتاری "پەرگیری" لە ئەنسکلۆپیدیا (1764)دا وەك گرگرتنی خورافە پێناسی دەکات: "پەیوەندی نێوان پەرگیریو خورافە وەك پەیوەندی هەڵبزرکان و تا، یان توڕەییە" پەرگیری نەخۆشیەکە بۆ چوارچێوەی کۆمەلایەتی، توندڕەویەکە کە هەڕەشەی لەناوبردنی لێدەکات، ئەم پێناسەیە پێچەوانەی ئەو نەریتەیە کە بێ دینی بە نەخۆشی یان بە نەخۆشیەکی ساری دەزانێ: بێ دینی لەم پێناسەیەدا خۆی نەخۆشیەك نییە، بەلکو خودی پەرگیری نەخۆشیە. پەرگیری دەرئەنجامی زانا دینیەکان و ئەو دۆگمایەتە زۆرانەیە کە دەبێتە هۆی خورافات و ئیحساساتی مەزهەبی و سەرکوتکردن. مەزهەبە هەبووەکان (بەدەر لە مەزهەبی "پیاوچاکانی چینی") فاسدکردنی هەقیقەت، کۆمەلێ فێلن بۆ فریودان و دیسپلینکردنی خەلکی، بەلام ئەگەر ڤولتێر لەو دەرئەنجامانەدا کە وەریدەگرێ جیاوازی لەنێوان پەرگیری و بێ دینیدا دەکات، ئەوا بێدینی، بە خاوەن هۆکاری سروشتی دەزانێت: گۆڕانی رەگەزی مرۆڤ و تەسکی دامێنی زانینی، بەناچار مرۆڤەکان پاڵ پێوە دەنێ بۆ وەرگرتنی بیروباوەڕە نایەقینیەکان. لە سەرو ئەو راستیە سنوردارانەوە کە ئێمەی مرۆڤ دەتوانین بەدەستی بهێنین، شتێك جگە لە بیروڕاکان، حیزبەکان، گروپەکان و "کۆمەلێ دوودلی و هەلە" نیە (وتاری "گروپەکان"). بێ دینی سروشتییە چونکە دەرئەنجامی ماهیەتی سنورداری زیهنی ئێمەیەو لێرەوە شایستەی لێبوردنە. بەپێچەوانەوە پەرگیریی نەخۆشیە چونکە بریتیە لەوەی تەنها خۆمان بەڕاست بزانین و لەپێناویشیدا دەست بۆ چەك بەرین. تەنها دەرمانێکی ئەم نەخۆشیە، زیهنی فەلسەفیە کە لە نزیکانەوە دەگوێزرێتەوە بۆ نزیکانو خەلق و خۆی مرۆڤەکان نەرمدەکات و دەبێتە رێگر لەبەردەم توندڕەویە ناشایستەکاندا". لەبەر "سودی گشتییە" کە بەرگری لە لێکبوردن دەکرێ، نەك لەبەر ئازادی بیروڕاو باوەڕ، یان مافەکانی ویژدانی گوناهکار: بەرژەوەندی نەتەوەکان لێکبوردن دەسەپێنێ، چونکە ئەو نەتەوانەی لێکبوردنیان هەیە، ئەوانەن کە ئاشتی و لێکتێگەیشتنیان لەنێواندا هەیەو سامانی زۆر بەدەست دێنن. ئیمپراتۆریەتە گەورەکان فرە رەنگنو لێکدەبوورن. عەقیدە مەزهەبیە جیاوازەکان بە دەرکەوتنی یەکتاپەرستی و رێکخستنی لە یەك کەنیسەدا، نەتواوەتەوە. مەزهەبە یەکتاپەرستەکان هەریەکەیان دابەشبوون بۆ کۆمەلێ گروپ و ئەم گروپانەش هەریەکەیان بەرگری لە هەقیقەتی جیاواز دەکەن، هەر لەبەرئەوە دەبێ هەموویان بانگهێشت بکەین بۆ لێکبوردن.

ڤولتێر وانە لە مێژووەوە وەردەگرێ: "ئەم جیاوازیە ترسناکانە کە چەند سەدەیەکی خایاندووە وانەیەکی گرنگە سەبارەت بەوەی ئێمە دەبێ هەڵەکانی یەکدی ببەخشین. جیاوازبوون بەدبەختی گەورەی رەگەزی مرۆڤەو لێکبوردنیش تەنها رێگەچارەیەتی.

لێکبوردن فەزیلەتێکی مرۆیی و هەروەها کۆمەلایەتیە. وتارێك لەبارەی لێکبوردنەوە بە "خەسلەتی سروشتی" دادەنێ، لەکاتێکدا کە ئەنسکلۆپیدیا بە "خەسلەتی مرۆڤبوونی" دادەنێ. هەروەها لێکبوردن فەزیلەتێکی ئەخلاقیەو لەم روەوە هاوشانی مودارا کردنەو وەك چاوپۆشین و تەحەمولکردن و دلسۆزی پێناس دەکرێ. بەلام ئەگەر لێکبوردن تا ئاستی موراعاتی خەتاکاران بهێنینە خوارێ، ئایا نەمانگەڕاندۆتەوە بۆ مانا

کۆنەکەی؟ ڤۆلتێر ئەم مانایە بۆ لێکبوردن قایل نییە: چونکە نەزانی بەهرەی گشتیە، کەوابوو هەر مرۆڤێك دەبێ لەگەڵ ئەوانی دیدا لێبوردو بێت. وتاری "لێکبوردن" بەم شێوەیە کۆتایی دێت: بەلام ئاشکرایە ئێمە دەبێ هەمووومان لەگەڵ یەکدیدا لێبوردو بین، چونکە هەمووومان بێ توانا و سادەئەندێش و دوچاری گۆڕان و هەڵەین. ئایا ئەو چڵە نایەی کە با لەناو گڵ و قوڕاودا خەواندوێتی دەتوانێ بە نایەکەی تەنیشتی کە بە ئاراستەی پێچەوانەی ئەوەوە خەوتووە بڵێ: "وەك مـن بپشبیکەوە ئەی بێنەوا: ئەگینا دەیانەوێت تۆ لە ڕەوی هەڵکێشن و بتسووتێنن؟". لێکبوردن لەبەرئەوەی دوولایەنەیە هاوکات دەبێ لەگەڵ چاوپۆشیندا و ئاشکراکەری پەیوەندی دەسەڵات نییە لەنێوان ئەو کەسەدا کە لێدەبورێو ئەو کەسەی لێبووراوە. لێکبوردن بە لەڕەگەوە دەرهێنانی پەڕگیری، دەبێ بە فەزیلەتێك کە زنجیرەیەك ئەرکی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی دروستدەکات و لە کۆمەڵێ پەیوەندی کۆمەڵایەتیدا دەردەکەوێت کە پەرژەوەندیەکانی تاکەکان لە ئاڵوگۆڕی ساماندا، واتە لە بازرگانیدا بەیەکەوە گرێدەدات. لەم ڕوانگەیەوە بۆرسەی لەندەن یەکێك لە ناوەندە گرنگەکانی لێکبوردنە: بۆرسە بە ئاسانکردنی ئاڵوگۆڕی ئەموال، ئازادی بیروڕا، واتە هاوتاییبوونیان بڵاودەکاتەوە..

ڤۆلتێر بۆ سەقامگیربوونی لێکبوردن پێشنیاری دوو ڕێگە دەکات: یەکێکیان چالاکی لە بواری بیروڕای گشتیدا، ئەویدیان کارکردنی فەرمانڕەوایان کە بە ڕێگەدان بە بیروڕای جۆراوجۆر لە وڵاتدا، هێواش هێواش (هەوڵبدەن) ئیحساساتە مەزهەبییەکان خامۆشبکەن، ڤۆلتێر ڕۆڵێکی گرنگ بۆ پڕوپاگەندە یان هوشیارکردنەوەی خەڵکی دادەنێ: ڕەوانی و فراوانی ئەو نوسینانەی سەبارەت بە ڕووداوە دادوەرییەکانن دەبێ بیروڕای گشتی ڕێکبکاتەوە، فۆرمەلەیان بکات، ڕوونیان بکاتەوە، دەرگیریان بکاتو ناچاریان بکات بە هەڵسەنگاندن. "تەنها هیوای مـن بە هاواری گشتیە" (نامەیەك بۆ کۆنت دارژانتاڵ، 7 تۆتی 1762): خەڵکی بەرهەمهاتووی ڕۆشنگەرین و دەکرێ بۆ خەباتکردن لەپێناوی لێکبوردندا دژی پەڕگیری، بهێنرێنە مەیدان. دەوری میرەکان بریتیە لە ڕێگرتن لە ئیحساساتی توندی خەڵکی و ئەمەش بە دانانی کۆمەڵێ یاسا بۆ خۆلادان لە ئاژاوە مەزهەبیەکان و کۆتایی هێنان بە خورافات، دەکرێ. مەسەلەکە قەدەغەکردنی دینەکان نییە. ئەو ڕێگەیەی ڤۆلتێر پێشنیاری دەکات لەناوبردنی مەزهەبەکانی لەخۆنەگرتووە. ڤۆلتێر خوانەناس نییە، خوانەناسی "دێوێکی ترسناکە" (وتاری "خوانەناس، خوانەناسی") وەك پەڕگیری کە هەموو پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان لەیەك دەپچڕێنێ و بەهێزترین پایەی ئەخلاق وێراندەکات. میرەکان دەبێ ڕەواج بە خواناسی بدەن کە سەلمێنەری بوونێکی باڵاتر، خالق، فەرمانڕەوا، پاداشدەرو تۆڵەسێنە. لە دیدی مەزهەبە پۆزەتیڤیزمەکانەوە (تحصلی) خواناسی، تاکە مەزهەبێکی پەتی و لێبوردووە. بەمشێوەیە دەبێ میرەکان چاودێری مەزهەبەکان بکەن: "لەهەر شوێنێك میر، فەرمانڕەوای سیستەمی کەنیسە بووە، تەنانەت یەك ئاژاوەو تەفرقەیەك نەبینراوە، لەهەر شوێنێکیش کەنیسەیەکان بەتەواوی لەژێر فەرمانی میردا نەبوون، جگە لە موسیبەت و بێ نەزمی هیچی لێ بەرهەم نەهاتووە". لێکبوردن بەرهەمی بەرنامەی درێژخایەنی میرەکانەو ئامانجیشی ڕێگرتنی هێواش هێواشە لە مەزهەبە پۆزەتیڤیزمەکان و ئەمەش لەگەڵ چەکی نادینی بوونی دەوڵەتدا هاوتا نییە. دەوڵەت نابێ بێلایەن بێت، بەڵکو دەبێ هاوکاری بەدیهاتنی مەزهەبی ڕاستەقینە بکات کە خواناسیە، لێکبوردن دەبێت ڕێگە بە گروپە جیاوازەکان

(بێگومان وەفادارانی دەوڵەت) بدات کە سەرەتا هەموویان بەشێوەیەکی ئاشتیانە پێکەوە بژینو، پاشان بەناچارکردنیان بە پێکەوە ژیان لەژێر چاودێری میردا، هێواش هێواش تەفرقەکە لەناوبەرێ. ڤۆلتێر بە پێچەوانەی بیلەوە ڕۆڵێکی کۆمەلایەتی بۆ ئەو مەزهەبە دادەنێ کە لێکبوردن بڵاودەکاتەوەو بە پێچەوانەی لاکەوە خوازیاری فەرمانبەرداری کەنیسەیە لە دەوڵەت و ئەمەش بەتەنها زامنێکی لێکبوردن دەزانێ.

وتارێك لەبارەی لێکبوردنەوە بە "دوعاکردن بۆ خودا" کۆتایی دێت، دوعایەك کە خودا لە بەرامبەر "سەرجەم بوونەوەرەکان، هەموو جیهانەکان، هەموو سەردەمەکان" و سەرجەم مرۆڤەکاندا دادەنێ کە "مەخلوقاتێکی سست و سەرگەردانن لە فەزای بێکۆتاییدا و نادیار لە دیدی بونەوەرەکانی دیەوە". ئەو دوعایە، گەڕانەوە بۆ خواناسی، واتە یەکەم مەزهەبی مرۆڤەکانە کە عەقڵانیەتی پەتیەو مەزهەبە پۆزەتیڤیزمەکان لەڕێگەی زانستە مەزهەبی و میتافیزیکیەکانەوە لە شانۆ وەدەری نابوو، بەلام هێشتا پاشماوەکانی لە بڕوابوون بە خودای مەزندا لای هەندێك نەتەوەی شارستانی دەبینرێ. لێکبوردن بەرەو ئەم مەزهەبە سروشتیە دەڕوات کە ناوەڕۆکەکەی یەکێتی و برایەتی جیهانیە. لێکبوردن لەگەڵ ڤۆلتێردا ماناکەی پێشووی لەدەستدەدات: چیدی لێکبوردن نیشانەی سستی و بێ هیمەتی گوناهئامێز نییە لەبەرامبەر خراپیدا تا خۆدورخستنەوە لێی کارێکی پێویست بێت، بەلکو فەزیلەتێکی ئەخلاقی و کۆمەلایەتی دەبێ کە دەرئەنجامی ئاشتیخوازانەی دەبێ و بەشێوەیەکی ناکۆك، گومانخوازی و خۆشبینی تێکەڵ بەیەکدی دەکات: تواناکانی مرۆڤ سنوردارە بەلام دەبێ لێکبوردن و خوداناسی، پێشکەوتنی مێژوویی بە ئاراستەی پێشخستنی عەقلانیەت ئاسان بکات.

## (دەق)

### (1)

لێکبوردن چیە؟ خەسڵەتی تایبەتی مرۆڤە. ئێمەی مرۆڤ هەموومان تێکەڵێکین لە هەڵەو سستی، کەوابوو با نەزانی و بێ عەقڵی یەکدی ببورین، ئەمە یەکەم یاسای سروشتە.

لە بۆرسەی ئەمستردام یان لەندەن یان بەسرەدا کە زەردەشتیو، بانیان، یەهودی، موسوڵمان، چینی خواپەرست، بەرهمەن، ئۆرسۆزکس، کاسۆلیك، پرۆتستانت، هەر هەموویان پێکەوە مامەڵە دەکەن، خەنجەر بەڕووی یەکدا هەڵناکێشن بۆئەوەی یەکێکیان ئەویدی بێنێتە سەر دینەکەی خۆی. کەوابوو بۆچی ئێمە (مەسیحیەکان) پاش ئەنجومەنی نیکیە بەردەوام کوشتار لەگەڵ یەکدیدا دەکەین؟

کۆنستانتین لە سەرەتادا فەرمانێکی دەرکرد و هەموو ئاینزاکانی ئازادکرد، بەلام لە کۆتاییدا هەموویانی سەرکوتکرد. پێش ئەو مەسیحیەکان تەنها لەبەرئەوە ئازار دەدران و ڕاوەدوو دەنران، چونکە بە تەدریجی حیزبی دەهاتنە ناو وڵاتەوە. رۆمیەکان سەرجەم ئاینزاکانیان، تەنانەت ئاینزای یەهودو تەنانەت ئاینزای میسریەکانیان ئازاد کردبوو لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆر بەدزێویان دادەنا. بۆچی رۆم لە بەرامبەر ئەو ئاینزانەدا لێبوردوو بوو؟ چونکە میسریەکان و تەنانەت یەهودیەکانیش نەیاندەویست دینی کۆنی ئیمپراتۆری رۆم لەناوبەرن، زەمین و دەریاکانیان نەدەبڕی بۆئەوەی خەلکی ڕاکێشن بۆ دینی خۆیان، تەنها خەیاڵیان لای بەدەستهێنانی پارە بوو. بەلام بێگومان مەسیحیەکان دەیانویست دینی ئەوان فەرمانڕەوا بێت. یەهودیەکان نەیاندەویست کە پەیکەری ژۆپیتەر (خودای خوداکانی رۆم) لە ئۆرشەلیم بێت، بەلام مەسیحیەکانیش نەیاندەویست کە ئەم پەیکەرە لە کاپیتۆل (رۆم)دا ببینن. سن

تۆماس بە نیەتی باشەوە دان بەوەدا دەنێت کە ئەگەر مەسیحیەکان ئیمپراتۆرەکان لانابەن، لەبەرئەوەیە کە توانای ئەوەیان نییە. مەسیحیەکان لەسەر ئەو بڕوایە بوون کە دەبێ هەموو خەڵکی سەر زەوی ببن بە مەسیحی، لەبەرئەوە لەگەڵ سەرجەم خەڵکی زەویدا تا ئەو رۆژەی کە باوەڕ دەهێنن دوژمن بوون.

جیاوازیەکانی مەسیحیەکان هەرچیەك بوویێ، لەنێوان خۆشیاندا لەگەڵ یەکدا دوژمن بوون. یەکەم جیاوازی لەوەدا بوو کە ئایا دەبێ عیسای مەسیح بەخودا بزان یان نە؟ ئەوانەی کە نکوڵیان لێدەکرد بە ناوی ئابیۆنیەوە تەکفیر دەکران و ئەمانیش ئەوانەی مەسیحیان دەپەرست، تەکفیر دەکرد.

هەندێك لە مەسیحیەکان هاوبەشی داراییان دەویست و دەیانگوت کە لە سەردەمی حواریەکاندا ئەم هاوبەشیە لەئارادا بووە. نەیارەکانیان ناویان دەنان نیکۆلایی"4" و ناشرینترین تاوانەکانیان دەدایە پاڵیان.

گروپێکی دی لافی عرفانیبوونیان لێدەدا، ئەمانە بە غنوسی ناو دەبەن و بەتوندی دژایەتیان دەکەن. مارسیۆن قسە لە تەسلیس دەکات و بە بتپەرستی ناودەبەن.

ترتۆلین، پراکساس، ئۆریژن، نوات، سابلیۆس، دونات هەموویان پێش کونستانتین بەدەستی برا دینیەکانی خۆیان سەرکوتکران، سەردەمێکی درێژ بەسەر فەرمانڕەوای مەزهەبی مەسیحیەتدا بەهۆی کونستانتینەوە نەرۆیشتبوو کە ئاتازیەکان و ئۆسبیەکان کەوتنە گیانی یەکدی و لەوساوە تا ئەمڕۆ هەمیشە کەنیسەی مەسیحیەت لە خوێندا غەرق بووە.

ئەوەم قبوڵە کە گەلی یەهود زۆر درندە بوون. بێ بەزەییانە سەرجەم دانیشتوانی سەرزەمینێکی بچوکیان کە هیچ مافێکی زیاتر لە پاریس و لەندەنیان لەناویدا نەبوو؛ سەربڕی، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا کاتێك نوعمان حەوت جار لە روباری ئوردوندا خۆی شت و نەخۆشی گەڕیەکەی چاك بووەو بۆ قەدردانی لە ئەلیەسوع کە ئەم نهێنیەی بۆ ئاشکرا کردبوو، پێیگوت کە خودای یەهودیەکان بۆ سوپاسگوزاری ئەو دەپەرستێت، بەڵام ئازادە کە خودای وڵاتەکەی خۆشی بپەرستێ و داوای لە یەسوع کرد کە رێگەی ئەمەی بدات و پێغەمبەریش بێ هیچ دوودڵیەك رێگەی پێدا. یەهودیەکان خوای خۆیان هەبوو کە دەیانپەرست بەڵام هەرگیز سەریان لەوە نەدەسوڕما کە هەر گەلێکی دیش خودای خۆی هەبێت. بەکارێکی باشیان دەزانی کە شاموس سەرزەمینێکی بە مۆئابیتەکان داوە بەو مەرجەی خودای ئەوانیش هەمان کار بکات. یەعقوب بۆ هێنانی کچانی بتپەرستێك، هەرگیز دوودڵی لەخۆی پیشان نەدەدا. لایان خودای خۆی هەبوو، وەك چۆن یەعقوبیش خودای خۆی. ئەمانە نمونەی لێکبوردنن لەلایەن نالێبوردەترین و توندوتیژترین خەڵکی سەردەمی کۆنەوە، ئێمە لاسایی توندوتیژیە توندەکانیان دەکەینەوە، نەك لاسایی لێبوردن و دڵفراوانیان.

پڕ ئاشکرایە هەر کەسێك، مرۆڤێك واتە براکەی خۆی سەرکوت بکات لەبەرئەوەی کە بیروڕای لەو جیاوازە، دیوێکی ترسناکە. کێشەکە لێرەدا نیە، بەڵام بۆچی حکومەت، داوەران و پاشاکان ئەو کەسانە سەرکوت دەکەن کە لەسەر دینی ئەوان نیە؟ ئەگەر ئەم کەسانە کۆمەڵێ بێگانەی بەهێزبن ئەوا بێگومان میرێك دەبێ بە هاوپەیمانیان. فرانسوای یەکەم (شای فەرەنسا) کە زۆر مەسیحی بوو، دژی شارلی پێنجەم (ئیمپراتۆری ژێرمەن، شای ئیسپانیا و سیسیل و..) کە زۆر کاسۆلیك بوو، لەگەڵ موسڵمانەکاندا یەکیگرت؛ بۆ پشتیوانیکردن لە لۆسریەکانی ئەڵمانیا لە یاخیبونەکەیاندا دژی ئیمپراتۆریەکەیان (شارلی پێنجەم)، پارەی پێدان،

بەلام وەك نەریتی باو، لۆسریەکان ولاتەکەی خۆی لە ئاگردا سوتاند. لە ساکسدا لەبەر هۆی سیاسی پارەی بە پرۆتستانتەکان دەدا، لە پاریسیشدا هەر لەبەر هۆی سیاسی ئاگری تێبەردان. بەلام دواجار چی روویــــدا؟ ســــەرکوتکردنەکان، توندڕەوەکــــانی دروستکرد. زۆری پێنەچوو کە فەرەنسا پڕبوو لە پرۆتستانتی تازە، ئەمانە سەرەتا دۆڕان، بەلام پاشتر بردیانەوە. شەڕە ناوخۆییەکان دەستییێکرد، پاشان سەن بارتلمی هاتە پێشەوەو لە دەرئەنجامدا ئەم گۆشەیەی جیهان بوو بە دۆزەخێکی خراپتر لەوەی کە پێشینان و ئەمرۆیەکان وەسفیانکردووە.

ئەی گەمژەکان کە هەرگیز بۆ پەرستنی ئەو خودایەی دروستی کردوون، دینێکی راستان نەبوە! ئەی بێنەوایان کە لە نوئاشیدەکان و پیاوچاکانی چینی، پارسی و عاقلەکانی دیەوە هیچ پەندێك فێرنەبوون! ئەی دێوەکان کە پێویستتان بە خورافات هەیە،.. پێشتر ئەوەمان بە ئێوە گوتووەو چیدی هیچمان نییە پێتان بلێین کە ئەگەر لە ولاتی خۆتاندا دوو مەزهەبتان هەبێت، یەکتر سەردەبڕن، بەلام ئەگەر سێ مەزهەبتان هەبێت، ئەوا هەموو لە ئاشتیدا دەژیـن. تەماشــای تورکــی گــەورە (سولتانی عوسمانی) بکەن: ئەو حوکمرانی بەسەر زەردەشتیەکان، بانیەکان، مەسیحیەکانی یۆنان، نەستوریەکان و رۆمیەکاندا دەکات، یەکەم کەس کە ئاژاوە بخاتەوە تیر لە کۆمیەوە دەرێو هەموان ئیدی ئارام دەبنەوە.

*(لە زاراوەی فەلسەفییەوە: نوسینی ڤۆلتێر، وتاری "لێکبوردن")

## سەرچاوەی ئەم وەرگێڕانە

ژول سادا- ژاندرون: تساهل در تاریخ اندیشه غرب.
ت: عباس باقری - تهران: نشر نی 1378.



لە ئینتەرنێتەوە

# بەکام مانا دەتوانین قسە لەسەر لێکبوردن بکەین لەنێوەندی ئیسلامیدا

■ محەمەد ئەرگۆن

● و. لە عەرەبییەوە: ئارام جەمال سابیر

ویستم لەمیانەی هەڵبژاردنی ئەم ناونیشانە تارادەیەك دوورو درێژە، بەڵام زۆر ساکارو هەستیارەوە، بەرپەرچی ئاراستەیەکی زۆر باو بدەمەوە کە هەر خەریکی ئەوەیە ئیسلامو رۆژئاوا بەشێوەیەکی میکانیکیانە لە هەموو چەمکە کۆنو نوێکانی وەك مافەکانی مرۆڤ، سەربەستی ئایینی، دیموکراسیەت، کەسی مرۆیی[1] و... هتد، لەبەرامبەر یەکتردا راگرێت.

بانگەشەکردن بۆ لێکبوردن بۆتە کارێکی پێویستو باوی کۆمەڵگەکەمان، چونکە وەك دەزانرێت کۆمەڵگەکانمان ئێستا لەهەموو کات زیاتر گیرۆدەی کێشە ئەتنی - کەلتووری، یاخود تایەفەگەریی و سیاسییەکان بووەو بەدەستییانەوە دەناڵێنن. ئەوەشی ئاگری ئەم کێشەو ململانێیانە خۆشتر دەکات شەپۆلگەلی ئەو کۆچە بەلێشاوەیە کە سەرلەبەری گۆی زەوی تەنیوەتەوە. جا لە کەشوهەوایەکی پڕ لە ململانێی قەیراناوی لەمجۆرەدا، خەڵکی خۆیان بەرەو کەلەپووره فیکرییە بنجبەستووەکان دەکوتن تاکو لەوێدا بنەماگەلێك بۆ رێزگرتن لەم چەمکە(واتە چەمکی لێکبوردن) بدۆزنەوەو بەهاو بەڵگەی بۆ بهێننەوە. لەکاتێکدا ئێمە شتێکی ئەوتۆ لەواتای ئەم چەمکە نازانین؛ ئاخۆ بەواتای چاکەخوازییەکی ئاکاریی یان دابەشکارێکی فیکریی دێت، یان ئاتاجێکی سیاسی بۆ کۆمەڵگە فرە رەگەزو فرە تایەفییەکان مەیسەردەکات؟

بێگومان هزری ئەورووپی بێ یەکودوو سەرچاوەو سەرهەڵدانی چەمکی لێکبوردن دەبەستێتەوە بەهەڵکشانی فەلسەفەی رۆشنگەرییەوە لە سەدەی هەژدەهەمدا. پاشان بەشێوەیەکی گشتی، پەیوەستی دەکات بە ڕابوونی نوێگەریی فیکریی و

ماددیی رۆژئاواوە. بەم پێیەش زۆر بەئاسانی ئەو بیرۆکەیەی دەسدەکەوێت کە پێیوایە نوێگەریی بۆ یەکەمینجار لەئەورووپای رۆژئاواداو لە ڕێگەی کردنی بە نموونەی بالای خۆی، سەریهەڵداوە.

هەریەك لە جەنگی ڤۆلتێر لەمیانەی پەیامەکەیەوە بۆ لێکبوردن (1763) و نووسینەکانی کۆمەڵە مەوسوعییەکان بوونە هۆی گۆڕینی ئەو تێڕوانینە تایبەتییەی کە دەرهەق بە ئایینەکان لەئارادا هەبوو، بەخودی ئایینی مەسیحیشەوە. تەنانەت کار لەلای فەیلەسوفانی سەدەی هەژدەهەم گەیشتە ئەوەی کە ئیسلام وەك نموونەیەك لە دەمارگیریی‌و دژەلێکبوردن وێنابکەن ( بڕوانە کتێبی ڤۆلتێر: دەمارگیریی‌و موحەممەدی پێغەمبەر، "1741"). لەئێستادا چەندین ململانێی ئایدیۆلۆژی دژوار لەنێوان ئیسلام‌و رۆژئاوادا هەن، کەچی دەبینین سەرلەنوێ سەرجەم وێنە نێگەتیڤەکانی سەدەی هەژدەهەم لەدژی ئیسلام خراونەتەوەگەڕو زۆر لەبارن بۆ {وروژاندنی} خەیاڵدانی خەباتگێڕانەی رۆژئاوایی. ئەو خەیاڵدانەی خۆی بەرامبەر بەهەموو شتێکی تایبەت بەئیسلام هەستیارکردووەو خۆی لێدەبوێرێ، لەکاتێکدا ئەوەی زیاتر ئەم خەیاڵدانە تیژ دەکاتەوە هەڵگیرسانی بزووتنەوەگەلی رزگاری نیشتمانی پەنجاکانە لە دژی کۆلۆنیالیزم، لەگەڵ ئەو راپەڕین‌و خۆپیشاندان‌و کردەوە توندوتیژانەی لەسەر زەمینی ئیسلامی روودەدەن.

ئێمە ناتوانین هەموو ئەم دراوانە پشتگوێ بخەین ئەگەر بمانەوێت - وەك چەند مێژوونووسێکی رەخنەگر - خۆمان لەقەرەی توێژینەوەی مەسەلەیەکی وەك لێکبوردن بدەین لە ژینگە، یان لەنێوەندە ئیسلامییەکەدا. خۆ ئەگەر هەر لەو کاتەدا ویستمان هەڵە مێژووییە ئاسانەکان[ب] و زیادپێوەنانە قەبەکان وەلابنێین کە موسڵمانان بۆ پەرچدانەوەی ئەو وێنا تۆمەتبارکەرو قێزەونانەی رۆژئاواییەکان بەکاریدێنن، ئەوا پێویستە بەم ئاڕاستانەی خوارەوە هەنگاو هەڵگرین:

1- پێویستە ئەوە بزانین کە کام زاراوەی لێکبوردن بەکاردێنین کاتێك دەمانەوێت توێژینەوە لەبارەی چۆنێتی سەرهەڵدان‌و میکانیزمەی کارکردنی {ئەو زاراوەیە} بکەین لە چوارچێوەی نێوەندگەلێکی کۆمەڵایەتی - رۆشنبیری‌و سیاسییانەی گۆڕاو لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر (هەر لێرەشەوەیە کە فاکتەری مێژوو دێتە ناوەوە) و هەمەچەشندا (لێرەشەوە فاکتەری ئەنترۆپۆلۆژیای رۆشنبیری دێتە ناوەوە).

2- سەرنج بدرێتە جیاوازی نێوان ئیسلام، نێوەندی ئیسلامی‌و فیکری ئیسلامی. لێرەدا تێبینی ئەوە دەکەین کە تەنانەت ئەو پسپۆڕانەشی بەشێوەیەکی کوێرانە پێیان دەگوترێت زانایانی ئیسلامیات {مەبەست لە زانایانی ئیسلامیات رۆژهەڵاتناسانی رۆژئاواییە، بەم دواییانە زاراوەی "عالم الإسلامیات - islamologue" جێگەی زاراوەی "رۆژهەڵاتناس"ی گرتۆتەوە}، پێویستی هەبوونی ئەم جیاکارییە فەرامۆشدەکەن، ئەویش لەپێناو توێژینەوەیەکی دروستی دراوە تایبەتەکانی ئەو سێ ئاستەدا،( ئەوانە خۆیان بەزانایانی ئیسلامی دەزانن لەکاتێکدا هەتا ئێستاش دوورن لە پێکهێنانی گوتارێکی زانستی لەبارەی ئیسلامەوە[ت].

3- پێویستە شیکردنەوەی هەر حاڵەتێکی تایبەتی یان هەر ماوەیەکی زەمەنی کە توێژینەوەی لەسەر کرابێت، بخرێتە نێو چوارچێوەیەکی فراوانی ئەو مەعریفەیەوە کە چەندین رەهەندی ئەنترۆپۆلۆژیی هەیە. هەر ئەمەشە ئەو تاکە میتۆدیەتەی کە دەرفەتمان دەداتێ بۆئەوەی پەرێزی ئەو حوکمە نێگەتیڤانە نەکەوین کە زادەی عەقڵی هەژموونداری (واتە ئەو عەقڵە رۆژئاواییەی کە نوێگەریی داهێناو کاروبارەکانی بەڕێوەبرد).

مەبەستم لەو حوکمە نێگەتیڤانەیە کەعەقڵی هەژموندار دەرهەق بەکەلتوورو گەلانی بەپەراوێزکراو و بێزراو و فرێدراوی نێو گۆڕەپانی توێژینەوە فۆلکلۆری و ئەتنۆگرافییەکان دەریدەکات، واتە سەدەی نۆزدەهەم. زۆربەی جار ئەم هەڵسوکەوتە لەگەڵ ئەو (ئیسلام)ەدا دەکەن کە لەلایەن عەقڵی هەژموندارەوە پۆلێنکراوەو توێژراوەتەوە.

بۆئەوەی ئەو پرەنسیپە میتۆدیانە بخەینە واری کردارەوەو پراکتیزەیان بکەین، بەپێویستی دەزانین لە خاڵی سێهەمەوە دەستپێبکەین:

ئەو لێکبوردنەی دیسانەوە لەئێستادا بۆی بەپەرۆشین، ڕێکوڕاست زادەی هەمان ئەو دژەلێکبوردنەیە کە بۆ چەندین سەدەیە لەلایەن ئەو سیستمە ئاینییە تەقلیدییەوە بەرهەمهاتووە کە لەسەر بناغەی دەزگاگەلی دەسەڵاتی دەوڵەتی دامەزراوە، ئیدی لە لووتکەی ئەو دەزگایانەدا ئیمپراتۆری لێبێت یان خەلیفەو سوڵتانو پاشایان لەسەر دانیشتبێت. وەک زانراویشە ئەمانە {واتە ئیمپراتۆرو خەلیفەو سوڵتانو پاشا} هەر هەموویان شەرعیەتیان لە ترۆپکە ئاینییەکەوە وەرگرتووە. لەڕاستیدا ئەوەش بگوترێت کە ئیسلامو مەسیحیەت لەم لایەنەوە زۆر لەیەکدی دەچن، چونکە فراوانبوونو پەلهاویشتنی هەردووکیان وەک دوو ئاین پەیوەستە بە دروستبوونی ئەو ئیمپراتۆرو پادشایانەی کە تەواو ملکەچی سەرچاوە لاهوتییە (ئەرسەدۆکسی)یەکەن، ئەو سەرچاوەیەی دەکرێت پێی بڵێین یاسا-حەقیقەت، یاخود حەقیقەت-یاسا (واتە هەق بەپێی زمانە قورئانییەکە خۆی). مەبەست لەو هەقەیە کە خوا فێری مرۆڤی کرد. ڕاستە کە شێوازەکانی دەستتێخستنی یەزدانی لە کاروبارەکانی مرۆڤ لە ئاینێکەوە بۆ ئاینێکی تر جیاوازییان هەیە، بەڵام دواجار دامودەزگاکانی دەسەڵاتی دەوڵەت بەهەمان شێواز، ڕەوابوونی خۆیان لەو ڕێنومایییە پیرۆزو باڵایانەوە وەردەگرن کەپێ لەسەر (ئەرسەدۆکسیزم) دادەگرنو "کارمەندانی تەقدیس"یش، کە زانای سۆسیۆلۆژیی ئەڵمانی ماکس ڤیبەر بە(پیاوانی ئایینی) دەڵێت، پارێزگاری لێدەکەن. بەمجۆرە لەڕێی مێژوو خۆیەوە مۆدێلێك بۆ ڕەوتی مێژوو دروستکراو ئەمەش لە چەندین حاڵەتی وەك هاوکاری دوولایەنەو پتەویی نێوان لوتکەی دەسەڵاتی سیاسی (واتە دەوڵەت بەهەموو شێوەکانیەوە)و لوتکەی ئەو باڵادەستییەدا بەرجەستە بووە کە بە ڕۆحیی ناوزەد کراوە. ئەمە هەمان ئەو نموونەیەیە کەپێشتر بە کۆمەڵگەلی کتێبی پیرۆز/ کتێبی ئاسایی، ناوزەدمکردووە.

نامەوێت لێرەدا جارێکی تر هەمان ئەو چەمکە دووبارە بکەمەوە[1]، بەڵکو تەنها بۆ بیرخستنەوەی ئەوە بەکاریدێنم بڵێم کە لەدوای سەدەی هەژدەهەمی ئەورووپاوە ململانێیەك دەبینین کەتاکو ئێستاش بەبەرچاومانەوە ڕوودەدات لەنێوان دوو مۆدێل لە مۆدێلەکانی کاری مێژووییدا : یەکەمیان کۆمەڵگەی کتێبی پیرۆز/ کتێبە، دووەمیشیان کۆمەڵگەیەکی لائیکیی دابڕاوە لەهەموو جۆرە مەرجەعیەتو هێمایەکی یەزدانی. مەبەستم لەو کۆمەڵگەیەیە کە ڕەوایی خۆی لەسەر مافی دەنگدانی گشتیو دیالۆگی دیموکراتیانەی ئازاد دادەمەزرێنێت.

چەندێکیش پێدابگرین ناتوانین مافێکی ئەوتۆ بدەینە ئەم بابەتە ئەگەر بێتو بڵێین پێشبڕکێیەکی هەمیشە کراوە لە نێوان ئەم دوو مۆدێلەدا هەیە، شتێکیش نییە پێی بڵێین بردنەوە بەبێ سەرکەوتنی مۆدێلە "نوێ"کە بەسەر مۆدێلە "کۆن"ەکەدا. ئەمەش بۆ خۆی ڕاستییەکی مێژوویی و کۆمەڵایەتیو فەلسەفییە (پێویستە لێرەدا ئەوەش تۆماربکەین کە ئەوە عەقڵی "نوێ"یە مۆدێلە ڕەقیبەکەی خۆی بە مۆدێلێکی کلاسیکی وەسفدەکات بۆ خاتری ئەوەی فڕێیداتە نێو سەرەنوێلکەوە یان تووڕیهەڵداتە نێو

ڕووبەرێکی بۆ پێزەوە). ئەم ڕاستکردنەوە ئەنترۆپۆلۆژییە بۆ چەمکەکان لە تێڕوانینی ئێمەدا بۆتە پێداویستییەکی گرنگ بەهۆی هەڵگیرسانی سەرجەم ئەو مشتومڕە گەرمو گوڕو تورەهەڵدانەی یەکترییەوە کە مۆدێلێك لە دژی ئەوی دی پیادەی دەکات. ئەمڕۆ ئەم حاڵەتە بەبەرچاوی خۆمانەوە دەبینین، بەتایبەتی دوای سەردەرهێنانەوەی "ئیسلام" وەك هێزێکی مێژوویی خۆی وەك بەدیلێکی (ڕۆژئاوایی) بەعەلمانیکراوو "زانستی"و "دیموکراتی" نیشاندا. دانانی ئەو چەمکانە لەنێو دوو کەوانەدا بۆ دەرخستنی ئاستی بەئایدیۆلۆژیابوونی ئەو دوو مۆدێلە (واتە زانستیو دیموکراتی) ئاستی پیاچونەوەیەکی ڕەخنەگرانەیە بۆ ئاستی بەئایدیۆلۆژیاکردنەکەو هەردوو مۆدێلەکەش لەمیانەی شیکارییەکی مێژوویی و سۆسیۆلۆژیو ئەنترۆپۆلۆژیو فەلسەفییەوە.

ئەو دەمەی دەروازە لەبەردەم ئەم جۆرە تێڕوانینەدا واڵا دەکەین هاودژیو جیاهەڵکەوتوویی ڕاستەقینە ئەو شتە نییە کە زۆرجار لەنێوان ئایینە جیاوازەکاندا (مەسیحی/ ئیسلام/ یەهودیەت/ بوزیەت...) دەیوروژێنن، بەڵکو ئەو هاوکارییە بەکارو چالاکەی نێوان ئایین/ دەوڵەتە، واتە لەنێوان مۆدێلی کتێبی پیرۆز/ کتێب لەلایەکەوەو، پەخشبوونەوەی ئەو دەمارگیرییە هاریکارەو دەرکەوتنی ئەو مۆدێلە مەزنەی لە هەناوی شۆڕشی فەرەنساو عەقڵی ڕۆشنگەرییەوە لەدایکبوو[پ].

دەبێت لەم چوارچێوەیەی تێگەیشتنو شیکارییەدا مەسەلەی لێکبوردن چی لێبێت؟ وەکی تریش چی بەسەردێت؟

سەرەتا لەڕووی مێژووییەوە – واتە زەمەنییەوە– پێش دابڕان و پاش دابڕان: لێرەدا مەبەستم لەو دابڕانەیە کە لەسەدەی هەژدەهەمدا ڕوویدا. چ شتێك لە قۆناغی پێش دابڕاندا دەبێتە جێگەی سەرنجمان؟

ئەوەی لە قۆناغی پێش دابڕاندا سەرنجمان بەلای خۆیدا ڕادەکێشێ ئەوەیە کە ئازادی ئایینیو پاراستنی یاسایی مافە بنەڕەتییەکانی "مرۆڤ"و "هاوڵاتی" لەڕووی سایکۆلۆژیو فیکرییەوە جێگەی قبوڵ نینو بیرکردنەوە لێیان مەحاڵ بوە[ج]. هۆکاری ئەم مەحاڵبوونەی بیرکردنەوەش دەگەڕێتەوە بۆ هەژمونی سیستمگەلی لاهوتیەت بۆ دورخستنەوەی یەکتری. لێرەدا مەبەستم لەو سیستمە لاهوتییە (تیۆلۆژی)ەیە کە تایەفە ئایینیە جۆربەجۆرەکان بەمەبەستی پاراستنی بەرژەوەندی خۆیان، یاخود ئەوەندەی بۆیان کرابێتو پێویستییان پێبووبێت بۆ پەلهاویشتنی خۆیان دروستیانکردووە. ئاشکرایە کە سیستمە لاهوتییە دۆگماکان باوەڕیان بەپاوانکردنی حەقیقەتی وەحیو ئەو دەسەڵاتە هەیە کە هەموو تایەفەیەك دەیپارێزێت (یەهودی بێت یان مەسیحی یان ئیسلامی). لەڕووی یاساییشەوە دەبینین یاسای ئیسلامی لە سیستمگەلی مەسیحی کەمتر لە هەوڵی دورخستنەوەی ئەوانی تردایە. ئەوەش دەزانین کە مەسیحیو یەهودییەکان پایەو شوێنێکی تایبەتیان لەناو کۆمەڵگەی ئیسلامیدا هەبوە کە ئەویش جێگەو ڕێگەی زەمییە(واتە پارێزراو). بەڵام سەرباری ئەمەش هێشتا ناتوانین نکوڵی لەوە بکەین کە ئەو لێکبوردنە جۆرێك بوە لە لێکبوردنێکی بێباکانە. ئەمە لەپاڵ ڕستێك لەو ئەدگارو ڕەفتارانەدا بوە کە هەوڵی نزمکردنەوەی ڕێزو حورمەتی یەهودیو مەسیحییەکانیداوە، لەپێناو دەرخستنی سەرکەوتوویی حەقیقەتی ناوازەو بێهاوتای بەرزی ئیسلام بەسەر ئایینەکانی تردا. ئاشکراشە کە سەرلەبەری ئەو مشتومڕە گەرمو گوڕانەی پێشتری نێوان یەهودو موسڵمانەکان، یاخود مەسیحیو موسڵمانەکان، ئەمڕۆش لەشێوەی ململانێی نێوان ئیسلامو ڕۆژئاوادا بەردەوامە، زۆریەی جار ئەم پلەوپایەی زەمییان ئیستغلالکردووە بۆ تاوانبارکردنی

ئیسلام بە مۆرکی دەمارگیریانە لە بنەماوەو درێژەدان بەو مۆرکە هەتا ڕۆژی ئەمڕۆمان. بەڵام ئەم تۆمەتبارکردنە هەڵەیەکی مێژووییە چونکە بۆ مەحکومکردنی کۆمەڵگەیەکی خاوەن کتێبێکی دیاریکراو (یان ئایینێکی دیاریکراو)ە لەپێناو پاراستنی کۆمەڵگە کتێبییەکانی تردا[ج]. سەرەڕای ئەمە خودی تۆمەتبارکردنەکەش پشت بە هەموو بەڵگەنەویستەکانی عەقڵی ڕۆشنگەریی- یان مۆدێلی سەردەمی ڕۆشنگەریی- دەبەستێت تەنها بۆ ئەوەی ئیسلامی پێ مەحکوم بکاتو هیچی تر.

ئەگەر بڕوانینە لایەنی ئیسلامی دەبێت چ شتێك سەرنجمان رابکێشێت؟ دەبینین موسوڵمانەکان بەبایەخەوە چەند ئایەتێکی گونجاو لە قورئان هەڵدەبژێرن بۆئەوەی لە یەك کاتدا مەسەلەی لێکبووردن لە ئیسلامدا بسەلمێننو بەرپەرچی ئەو تۆمەتانەی ڕۆژئاواشی پێبدەنەوە کە لەعەقڵی ڕۆشنگەرییەوە سەرچاوەیان گرتوە. ئەم کارەی ئەمانیش وەك هەڵەیەکی مێژووییو گەمەکردن بە حەقیقەت، هیچی کەمتر نییە لەوەی پێشتر. هەربۆیە من سەری ڕازیبوونم بۆ ئەو کارەی هەندێك لە موسڵمانانیش ناڵەقێنم. من ئەوە باش دەزانم کەئەو ڕاڤەکردنە تەقلیدیانە بۆ ئەو ئایەتانەی وێڵن بەدوای لێکبووردندا خۆیان نەگرت لەبەردەم بەڵگەنەویستە لاهوتییە دوورخەرەوەکانو سەدەکانی ناوەڕاستدا. ئەمیش پێبوایە کە حەقیقەتی ڕەها (یاخود حەق) لای ئەوەو، ئەو ڕاستییەش تەنها لەنێو ئایینێکدا یان تایەفەیەکدا کۆبۆتەوە (ئەویش ئیسلامە)[ح].

ئەم بەڵگەنەویستە تیۆلۆژیانەش وادەکەن کە تایەفەی ئیسلامی بچێتە پلەو ئاستێکی ئەنتۆلۆژیو مەعریفیو یاسایی- ڕۆحی وەهاوە کە هیچ شتێك پێی نەگات.

گومان لەوەدا نییە کە دەقە مەزنەکانی فیکری عەرەبی - ئیسلامی هەڵگری تۆوە سەرەتاییەکانی بیرۆکەی لێکبوردن بوونو نیشانەدەری ئەو ڕێگەیانەن کە دەچنەوە سەر لێکبوردن بە واتای نوێی وشەکە. کە ئەمە دەڵێم هاوکات بیر لە شەتەحەکانی سۆفیگەرانو داهێنانە فیکرییەکانو ناڕەزاییەتییە سیاسییەکانی کەسانی وەك ئەلحەسەنولبەسەری (لەساڵی 772دا مردووە) و، جاحز (869ز) و، کندی (870ز) و، ئەلتەوحیدی (1014ز) و، مەعەری (1058ز)، تاد... بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەموو ئەم ڕەخنەگرتنە زاتیو مەزنەکاراو خۆتوانە دەچنە خانەی ئەوەی کتێبگەلی هەڵبژاردە کە لە ئێرانی کۆندا پێی دەگوتن (جاویدان خیراد) واتە حیکمەتی ئەمر. هەموویان دەکەونە نێو ئەو فەزا عەقلییەی تایبەتە بە کۆمەڵگەلی کتێبی پیرۆز/ کتێب، نەك بەتەنها تایبەت بن بە سەدەکانی ناوەڕاستو بە پێی ئەو قۆناغبەندییە زەمەنییەی کە لەمێژووی ئەورووپییەوە وەرگیراوە. بۆچی ئێمە ئەمە دەڵێین؟ چونکە ئەو فەزا عەقلییەی تا ئێستەش لەزۆربەی ئەو کۆمەڵگایانەی هێشتاکە پەنا دەبەنە بەر ئایاتی قورئانیو فەرمودەکانی پێغەمبەرو تێڕوانینە گەردوونییەکانی حیکمەتی ئەمر گوزارشتە لە هاتنەدی پێودانگەکانی دادپەروەریو برایەتیو لێکبووردن. ئەمانەش هەموویان بابەتگەلێکی پێویستو پڕبایەخن، بەڵام هێنانەدییان بەهۆی بونیادە باوو کۆمەڵایەتیو چوارچێوە فیکرییە هەژموونداره‌کانەوە کارێکی مەحاڵە.

هەروەها پێویستە ئەوەشمان لەیاد نەچێت کە ئەو پلەبەندییە هەرەمییەی پلەو پایەی هەریەك لە پیاوێکی ئازادو کۆیلە، یان چینی خانەدانو چینە بێزراوەکان، یان ئەو دەستەیەی کە باوەڕدارو خواپەرستنو بەڵێنی فریادڕەسانەیان لەو دونیا پێدراوەو ئەو دەستەیەشی کە بێباوەڕو کافرنو چارەنوسیان دۆزەخو بڕیارێکی خراپە، یان پلەوپایەی هەریەك لەپیاوو ژن، دەڵێم دەبێت

ئەوەمان لەبیر نەچێت کە ئەمانــە هــەموویان ناسراوو پەســەندکراون لەلایــەن هەموانــەوە بــەو پێیـــەی کــە شتێکی یــەزدانی پــیرۆزن، جــا لــەمجۆرە نێوەنــدو دەوروبــەرەدا رۆنــانی پێودانگــەکانی حیکمــەتی ئــەمر لەشێوەی دووبارەو چەندبارەدا تەنها دەســتەو توێــژو چینــە بالاکــانی کۆمەڵگــە دەگرێتــەوە[د]. هــەر لەبــەر ئەمەشــە کـــە ناونیشـــانی توێژینەوەکـــەم زاراوەی نێوەنــدی ئیســـلامی لـــەخۆگرتوە نـــەك زاراوەی ئیسلام وەك عەقیدە.

ئەمێستاش، ئەی پاش دابڕان چی روویدا[ن]؟

سەرەتا سەرنج دەدەینە ئەوەی کــە ئیســلام وەك ئـــایینێکو هـــەروەها فیکــری ئیســـلامیو کۆمەڵگـــە ئیسلامییەکانیش لە دەرەوەی رووداوەکــەدا مانــەوە. ئەو کاتەی کۆمەڵگــە ئەوروپییــەکان چــەندین گۆڕانــی خێرایان لەسەر دەســتی بــۆرژوازی بازرگــانیو پاشــان ســەرمایەدار بــەخۆوە دی، ســەرنج بدەیــن ئــەو دەمــە جیـــهانی ئیســـلامی لەلایـــەن ئـــەو پرۆســـانەوە رکێخکرابوون کــە بــە ئاراســتەیەکی پێچەوانــە کاریــان دەکردو دەبوونە مایەی لاوازبوونو بەرتەنگبوونــەوەی ئاســـۆی فیکریـــیو چوونەوەیـــەکی چالاکییـــە رۆشــنبیرییەکانو فراوانبوونــی سیســتمی هۆزایــەتیو خێڵایــەتی، بەتایبــەتی لــەو کاتــەی کــە دەســەڵاتگەلی ناوەندی لاواز بوایە. هــەر ئــەم گۆڕانکاریانــەش بوونــە مایـــەی ئـــەوەی رێگاخۆشـــکەر بـــن لەبـــەردەم داگیرکـــارییو هـــەژموونی بیـــانیدا کـــە بوونـــە هـــۆی قـــەیراناویبوونی بـــارودۆخی ئـــابوریو سیاســـیو کلتوریـــیو ســـــەرەنجام تەقینـــــەوەی جەنگـــــە نیشـــتمانییەکانی دوای دووەم جـــەنگی جیـــهانی. بێگومـــان ئـــەم بەرچاوخســتنە مێژووییـــە خێرایـــە زۆر زیاتر هەڵدەگرێت باسی لێوە بکرێت، بــەڵام ئــەوەندە بەســە وەك ئامــاژەدانێك بــەوەی کــە لێکبــوردن لــەو کۆمەڵگایانەدا کــارێکی مەحاڵــە کــە هــەر لــە ســەدەی سیازدەهەمەوە لــە بــارودۆخێکی دژوارو ناسروشــتیدا دەژیــن وەك کۆمەڵگــە ئیســلامییەکان. هـــەر لـــەو ساتەوەختەشــەوە ئــەمجۆرە کۆمەڵگایانــە جۆرێــك لــە ریزبــەندییو جیاســـازییان لــەنێو دەســـتەو تاقمـــە ئــەتنیکی - کلتووریــیەکاندا دروســتکردوەو چــەندین لەمپەرو دیواری لەنێوانیاندا هەڵچنیوە، هەروەها ئــەم ریزبـــەندییو جیاســـازییە نێوانـــی هەریـــەك لـــە دەســتەبژێرە شـــارییەکانو چینــە میللییەکانیشـــی گرتۆتـــەوە. ســـەرباری ئەمانـــەش ئـــەم ریزبـــەندییو جیاسازییە لە گـــەڕەكو گونـدو ناوچەکانیشدا لەسەر بنەمای پێوەرە تایەفیو زمانو کلتوورییەکان بەڕێوە دەچی. لەڕاستیدا سیستمی حوکمڕانـــی عوسمـــانی هـانی ئــەم چەشــنە پەرتەوازەییــەی داوەو کــاری بـــۆ ئـــەوە کـــردوە کۆمـــەڵگا بەســـەر چـــەند گروپێکـــی لێکترازاوو گۆشەگیری داخــراو بەســەر خۆیــاندا پــەرت پەرت بکات. دواتر داگیرکەرانی ئەوروپیش هەمان ئەو سیاسەتەیان پیادەکردوە[ر]. بەمجۆرە ئایین گـــۆڕا بـــە تایەفـەو گۆشـــەیەکی ئـــایینیو دەســـەڵاتیش مـــۆری میراتگری لـــەخۆیداو ئـــابووریش شـــێوەی خۆژێنـــی لەخۆگرتو زمانیش دابەشبوو بەسەر چەند دیالێکتێك ( بڕوانە هەردوو زمانی عەرەبیو بەربەری لە مەغریبی گەورەدا چییان بەسەرهات). کلتوریش هێنــدە لاتو بەرتەسك بۆوە وایلێهات کەسێکی وەك بیــر بۆردیــۆ ئـــەو دەمـــەی ســـەرقاڵی توێژینـــەوەی ناوچـــە گـــەورەکانی[2] جـــەزایر بـــوو، بەکەلتوورەکـــەیان بڵێـــت سەرمایەی رەمزی.

ئـــەو کۆمەڵگەیانـــەی دابەشـــکراون بەســـەر چـــەند کۆمەڵەیـــەکی پەرتـــەوازەی لەیـــەکتری پـــەرتکراوو پابـــەندن بـــە "شـــوناس"و تایبەتمەندییەکانیانـــەوەو زۆربەی کات لە دەسەڵاتی ناوەند یاخین - بەتایبـــەتی دووره دەســـتەکانیان- هـــەتاکو ســـاڵی (1950)ش لەدەرەوەی بازنەی مۆدێرنیزمدا ماونەتەوە. هـــەروەها سیستمە کۆلۆنیالیزمەکانیش هانی پێکەوەنانی چـــەند دوورگەیـــەکی دابـــڕاوی مۆدێرنـــەکراویان داوە لـــەناو

خودی ئەم كۆمەڵگایانەدا. لێرەدا مەبەستم لەو چەند توێژە كۆمەڵایەتی - كلتورییەیە كەهەستیان بە زەرورەتـی نوێكردنـەوەی دامەزراوگـەلی ژیـانی كۆمەڵایەتی‌و كلتوری‌و چەمكەكانیان كردوە، بەڵام دیسانەوە ئەوانیش بەشی خۆیان كاریگەرییان هەبووە[ن].

هەر لەو كاتانەشدا وا پێویستی كردوە چاوەڕێی بەدەسهێنانی سەربەخۆیی سیاسی‌و پێكـەوەنانی دەوڵـەتی نەتـەوەیی لەهـەر شوێنێك لـەو شـوێنانەدا بكەین بۆئەوەی ئەو دەستەو گرووپانە كە گۆشـەگیرو دابـڕاون‌و هەریەكـەیان لـەڕووی ناوچەگـەریی‌و جیاخوازییـەوە هـەوڵ بۆ خۆیـان دەدەن، ناچاریـان بكـەین بـەوەی بەشداری لەپرۆسـەی (بنیاتنـانی نیشتمان)دا بكـەن. ئـەم داینامیكیەتـە كۆمەڵایـەتی‌و سیاسییە نوێیە وای لەهـەموان كرد زۆرتـر هەست بەپێداویستی لێكبوردن بكەن. ئـەم بارودۆخـەش لـەو كاتە دەچێت كە كۆمەڵگـە مەسیحییە ئەوروپییـەكان لەسەدەی هەژدەهەمدا بەخۆیانـەوە دی (بێگومـان ئەوانیش زۆر هەستیان بەپێداویستی لێكبوردن كرد).

دەكرێت بـەمجۆرە لـەواتای دیاردەی لێكبوردن‌و مەدلولەكەی تێبگـەین. چونكـە لێكبـوردن رەنـدو فەزیلـەتێكی برایانـە نییـە كـە هـەركاتێ رێنومایـیـە ئایینی‌و فەلسـەفییە گـەورەكان فـەرمانی جێبەجێكردنیان فـەرموو، گـورج راپـەڕێنری‌و ببێتـە واقیعێكی مەلموسدار. بەڵكو لێكبوردن وەڵامدانـەوەو بەجێـهێنانی پێداویسـتییەكی كۆمەڵایـەتی‌و زەرورەتێكـی سیاسـی ئێجگـار گرنگـە لەسـاتەوەختەكانی ورووژان‌و هەڵایسـانی گـەورەی ئایدیۆلۆژیدا. هـەروەها بریتییـە لەچاوگێڕانـەوە بـەو (پێودانـگ)انـەی كـە تایبـەتن بـە هـەر توێژێكـی كۆمەڵایـەتی بەجیا. چونكـە ئاشكراشـە كـە زمـانی هەركام لەم توێژانەو بیروباوەڕو خوونەریت‌و سەرمایە رەمزییـەكانیان لـەماوەی چـەند سـەدەیەكدا بوونەتـە پێناسی نەگۆڕ بۆ ئەو توێژانە[ش].

دواتـر بۆئـەوەی لێكبـوردن لەهـەر جێیـەكدا بێتەدی‌و بچەسـپێ، پێویستە دوو مـەرجی سـەرەكی لەئارادا بن: یەكەم، بوونی ئیرادەی تاكە لەمەسەلەی لێكبوردنـدا. دووەمیشیان گرێدانـەوەی ئـەم ئیرادە تاكەیە بەئیرادەی سیاسی دەستەجەمعییەوە لەسـەر ئاستی دەوڵەت. لەم رووەوە دەشێت بڵێین كە ئـەم دوو ئیرادەیە لەزۆربەی جارەكانداو ئێستاشی لەگـەڵدا بێـت لەزۆربـەی وڵاتـە ئیسـلامییەكاندا ( بێگومـان بـە وڵاتە عەرەبییەكانیشەوە) لەڕیزی نەبوودا بوە، بـەڵام ئـەم نەبوونییـە بـۆ چـەند هۆكـارێكی مێژوویـی‌و كۆمەڵایەتی‌و ئەنترۆپۆلۆژی دەگەڕێنەوە زیاتر لـەوەی بگەڕێتەوە بۆ بێدەنگیی دەقە ئایینییەكان، یاخود بۆ كەموكورییـەك لـەفیكری ئیسـلامدا. هـەردوو حاڵـەتی توركیـای كـەمالیزم‌و ئەندەنوسـیای ژێـر سـایەی دەسـەڵاتی سـۆهارتۆ بەئاشـكرا ئـەم بۆچوونـەمان دەسەلمێنن. شتێكی زانراویشە كە خولیا عەلمانەرییە تێكۆشەرییەكەی ئەتاتورك هەوادارییـەكی كاڵ‌وكرچ‌و بـەزەبرو دژە لێكبـوردن بـوو. ئـەوە بـوو لـەدوا ئاكامیشدا بـوە مایـەی هەڵگەڕانـەوە لەئامانجـەكانی بـەواتا بـوە هـۆی سـەرهەڵدانی بزاوتـە ئیسـلامییە خـەباتكارەكان یـان كاردانەوەیـەكی ئیسـلامەوییانەی هەڵایساو. هەرچی ئەندەنوسیاشە لـەپاڵ بوونـی ئـەو لێكبوردنـە ئایینییـەی كـە هـەبوو نكۆڵـی لێنـەدەكرا، دژوارییەكی ئایدیۆلۆژیی سیستمە حوكمڕانەكە هـەبوو (واتە ئـەو سیستمەی پێیدەگوتـرا بـەنكازیلا): تـەنێ سـێ پـارتی سیاسـی هـەبوو كـەڕێی كـاركردنی سیاسییان پێدرابوو، بەڵام هەرچی پارتە ئایینییەكان بوون رێی كاركردنیان لێ یاساغكرابوو. لـێرەدا نـە قورئان، نە فەرموودەكانی پێغەمبەر هیچیان رۆڵیـان نییـە لـە بـوون‌و نـەبوونی لێكبوردنـدا. هـەروەها دەتوانـین چـەندین نموونـەی دیكـەش لەسـەر

سەلماندنی ئەو حاڵەتە دوالیزمییە بهێنینەوە کەئەوەندە بەیەکەوە گرێدراون، لێکدی جوێ نابنەوە. لێرەدا مەبەستم لە دوالیزمەی لێکبوردن/ دژە لێکبوردنە. هەروەها دەکرێ ئەوەش بسەلمێنم کە ئەم حاڵەتە لەلایەن رژێمە فەرمانڕەواکانەوە گەمەیان پێدەکرێت، مەبەستم لە رژێمەکانی حوکمڕانیی (دەوڵەت - نیشتمان - حیزب)ە. ئەم رژێمانە یاری بە فیکری لێکبوردن دەکەن و تەنانەت هەندێ جاری واش هەیە بانگەشەو جاڕی بۆ دەدەن لەکاتێکدا هەتا ئێستەش هیچ جۆرە رۆشنبیرییەکی فەلسەفی و مێژوویی و ئەنترۆپۆلۆژیی کە پێویست بێت بۆ هەر مومارەسەیەکی راستەقینەو بێمەرجی لێکبوردنێکی کاراو ئەکتیڤ لەهیچ ژینگەگەلێکی ئیسلامیدا نییە (لێرەدا جیاوازی دەخەمە نێوان لێکبوردنی کاراو ئەکتیڤ و، لێکبوردنی بێباك و لاموبالات، کە ئەمەی دواییان ناچێتە خانەی لێکبوردنەوە)[ص].

ئەو سەرنجەی دوایی بۆمان شتێکی یەکلاکەرەوەیە لەدیاریکردنی جۆرەکانی هەبوونی لێکبوردن / دژە لێکبوردن لەنێوەندی ئیسلامیدا لەپێش دەرکەوتنی ( دەوڵەت- نیشتمان - حیزب)و دوای ئەویش (واتە پێش سەربەخۆیی و دوای ئەویش). لەم بارەیەشەوە جیاوازییەکی مێژوویی گەورە دەبینین لەنێوان پێش/ پاش سەربەخۆیی. ماوەی زەمەنیی نێوانیان بەقەد دوو سەدەی زەمەنییە: واتە لەبەرپابوونی شۆڕشی فەرەنسییەوە. ئەم شۆڕشە دەوڵەتی پاشایەتی خاوەن مافی یەزدانیی (یان ئەوەی پێیاندەگوت مافی یەزدانی) گۆڕی بە سیستمی دەوڵەت - نەتەوە- کۆمار. ئەم جیاوازییە مێژووییەش زیاتر لەو چوارچێوە کۆمەڵایەتییەدا ئاشکراو بەرجەستە دەبێ کە ئەم گۆڕانکارییەی بەرپاکرد لەگەڵ ئەو کەلتورە فەلسەفی و زانستییەی لەناو ئەم چوارچێوەیەدا بڵاوبوونەتەوە.

بۆ نموونە ئەو جەماوەرە فەرەنسییە مەوسوعییەی کە لەچەندین کەس و هاوڵاتی چالاك و هەڵسوڕاو کاریگەر پێکهاتبوو، هەمان ئەو جەماوەرە مەیل و خواستی بەرجەستەکردنی ئەو بیروباوەڕانەیان بۆ واقیعێکی زیندوو هەبوو کە عەقڵی رۆشنگەری بانگەشەی بۆ کردبوون و بڵاویکردبوونەوەو هەوڵیشیان بۆ دەدا، بێگومان ئەو بە واقیعکردنەش لەهەر دوو رووی سیاسی و ئابوورییەوە بوو. خۆ هەمان جەماوەریش لەنێوەندی ئیسلامیدا هەبوون بەلام کارکردنی ئەمانە شێوازێکی خێراو راگوزاری بەخۆوە گرتبوو: واتە لەهەردوو سەدەی نۆیەم و دەیەمی زایینیدا. لەسۆنگەی ئەوەشەوە، هەر لەو کاتەدا چینێکی بۆرژوازی بازرگانی لەسەنتەرە گەورە شارستانەکەدا جێگیر ببوون، ئەم چینە رێخۆشکەری پارمەتیدەری ئەوە بوون کە مرۆگەلێکی عەرەبی وا نەشونما پێبکەن بەجۆرێك باوەش بۆ رێنومایی و پێوەدانگەکانی (حیکمەتی ئەمن) بکەنەوە کەئیسلام بەتەنها رەگەزێك بێت لەرەگەزە پێکهێنەرەکانی دیکەی ئەو حیکمەتە[3]. حاڵەتێکی هاوشێوەی ئەو ئەو حاڵەتەش لەزۆربەی کۆمەڵگە عەرەبی و ئیسلامییەکاندا لەنێوان ساڵانی (1850-1940)دا روویدا، ئەو ماوەیەش ئەوەبوو کە بەچەرخی ڕابوون ناوزەد کراو لەجیهانی عەرەبیدا بەشێوەیەکی تایبەتی بەرجەستەبوو. هەر لەو ماوەیەدا توێژی ئەنتلجنسیا؛ ئەو توێژەی کە باوەشی بۆ رێنوماییەکانی سەردەمی رۆشنگەری کردبۆوە، لەهەوڵی ئەوەدا بوو کە هانی سەرهەڵدان و هێنانەگۆڕی دیموکراسییەکی لیبرالی بدات، بەتایبەتی پاش نەهێشتن و سڕینەوەی سەڵتەنەتی عوسمانی. بەلام لاوازیی ئەو بنکەو هێزە کۆمەڵایەتییەی کە پاڵپشتی ئەمجۆرە بزاوتەو، هەروەها بە هۆی چاودێریکردنە سیاسییە بەهێزە ئیستعمارییە زاڵەکانەوە، کارێکی وایانکرد کە سەرهەڵدان و

بەرەوازیبونی راستەقینەی لەسەر خاکی ئیسلام نەیەتەدی. ئەو دیاردەیەشی کە لەسالانی شەستەکان و حەفتاکانەوە مایەی سەرنجدانە ئەو [illegible]وورنە زۆرەی ژمارەی دانیشتوان و دیاردەی بلاوبوونەوەیەکی بەرفراوانی ئەو ئایدیۆلۆژیا پۆلیسنییەی کە پابەندە بەکۆچی گشتی خەلکی گوندنشینەوە بەرەو شارەکان لەگەڵ ئەو سانسۆرو چاودێرییە توندەی کە سیستمی تاك حیزبی بەسەر هەموو شتێکدا پیادەی دەکات. ئەمانەش وای لەکۆمەلگە ئیسلامیی و عەرەبییەکان کردوە بکەونە ویزەی چەندین پێکدادانی دژوارو بزاوتگەلی ناڕازی و بێزاری روو لەریادو هەرەسهێنانی کۆمەلایەتی دەستەجەمعییەوە. ئەمەش زەمینەی رەخساند بۆ سەرهەلدان و بلاوبوونەوەی چەندین ئایدیۆلۆژیای عەقایدی توندڕەوو پەڕگیر.

بەلام وێڕای ئەمانەش دەشێت و بگرە پێویستیشە لەسەرمان کە مۆرکی تایبەتی ئەمجۆرە وەرچەرخانەی رەونی رووداوەکان بخەینە ژێر پرسیارەوە. بەم دواییە سەرۆکی فەڕەنسا فرانسۆ میتەران ئەوەی لا گەلالە بوو کە ململانێ ئایدیۆلۆژییەکان لەفەڕەنسادا زۆر ساردبوونەتەوە، هەربۆیە بانگەشەی فەڕەنسییەکانی کرد بەوەی بایەخێکی زێدەتر بدەنە بزاوت و ئەو چالاکییانەی کە پەیوەندییان بە مشتومڕە گەرمە سیاسییەکانەوە هەیە و کۆڕ گەرم بکەن، یەکێك لەوەزیرەکانیشی هەمان بۆچوونی هەبوو بانگەشەی بۆ ئەوە کرد کە کارێك بکرێت شەڕی سیاسی مۆرکێکی زیاتری تووڕەبوون و خۆڕاپسکان لەخۆبگرێت. ئەمە بەواتای چی؟ بلێی واتای ئەوە بگەیەنێت کە دیموکراسی بەبێ حیزبایەتی تەسك و بێ دەمارگیریی بۆ ئەم رێباز یان ئەو ئایدیۆلۆژیا لەتوانایدا نییە بژی، هەروەك خەباتگێڕە ئایدیۆلۆژیستەکان پیادەی دەکەن؟ ئایا هیچ چەشنە ناکۆکی و ململانێیەك لەنێوان ئەو کەسانەدا هەیە کە لەپێناو خولیایەکی هیومانیستییانەی کراوەو پڕ لەگیانی لێکبوردندا کاردەکەن، ئەو کەسانەی کە خاوەن بڕیارن و جلەوی دەسەلاتیان بەدەستەوەیە، ئەوانەی کە بەبێ بەرپاکردنی قسەوباس و گفتوگۆیەکی (هەراو هوریا نامێن) لەکۆمەلگەدا ناتوانن بگەنە ئەو دەسەلاتە و بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ حوکمڕانی بکەن لەگەڵ هەموو ئەو ئەنجامانەی لەو دیالۆگانەوە دەکەونەوە دەربارەی لێکبوردن / دژە لێکبوردن.

ویستم بەهۆی ئەم سیڕامان و بەراوردکردنانەوە ئەوە بسەلمێنم کە مەسەلەی لێکبوردن/ یان دژە لێکبوردن لەکۆمەلگە هاوچەرخەکاندا کۆمەلێ رەهەندو مەدلولی گەورە لەخۆدەگرن. هەروەها کارێکی بێ کەلك دەبێت ئەگەر توێژینەوە تەنها بۆ ئەم حالەتە دابڕاوەیان بکەین و ئەوی تریان وازلێبێنین، یان تەنها دەست بۆ ئەم کەلەپوورە فیکرییەمان بەرین بەبێ ئەوانی تر، یاخود توێژینەوە لەسەر ئەم ئایینە بکەین بەلام ئەوانی تریش هیچ. ئەوەشی زادەی هەلەو ناحالیبوونێکی لەڕادەبەدەرە لەبارەی (ئیسلام)ەوە، ناکرێت لەو سیاقە گشتییەی سەنتەرەکانی هێزە جیهانییەکان دەریهێنرێت، ئەو سیاقەی زالە بەسەر چارەنووسی گەلانداو ئاڕاستەیان دەکات.

## *پەراوێزەکانی نووسەر*

1) بڕوانە: محمد ارکون،(مفهوم مجتمعات ام الكتاب/ الكتاب) من كتاب (تحية جماعية) للأب كلود جيفري، منشورات سيرف، باريس *1991*.

*M Arkoun " Le Concept Du Liver/ Liver " In Melonges Ct Geffre Cerf 1991*

2) بڕوانە کتێبەکەی بیێر بۆردیۆ: (الحس العملي)، منشورات مينوى، *1980*.

Pierre Bordieu: Le Sens Pratigue, Minuit, 1980.

3) بڕوانە کتێبەکەی محمد ئەرکۆن: الأنسية العربية في القرن الرابع الهجري/ العاشر الميلادي/ الطبعة الثانية، منشورات فران باريس، 1982.

M. Arkoun: L, Humanisme Arabe Auiv, x, Siecle, Vrin. 1982

## پەراوێزو

## شرۆڤەکانی وەرگێڕی عەرەبی

أ- خوێنەر ناتوانێت لەفیکی ئەرکۆن تێبگات ئەگەر پێگەو دیدگای ئەو نەناسێت. پێگەی ئەرکۆن لەکۆڕەپانی فەرەنسادا چ وەك ئوستادێك لەسۆربۆن‌و چ وەك کەسایەتییەکی داکۆکیکەر لەمافەکانی ئەو جالیە ئیسلامیانەی لەوێ‌و لەزۆربەی وڵاتانی دیکەی ئەورووپادا دەژین، هەروەها وەك نوێنەرێکی ئاستە باڵاکانی کەلەپوری ئیسلام. سەرجەمی هەموو ئەمانە وایان لێکردووە کە هەردەم لەحاڵەتی بەرەوڕووبەڕوونەودا بێت لەگەڵ فیکری ئەورووپی‌و بیریارانی ئەورووپاییدا. ئەم بیریارانەش - یاخود زۆربەیان - وەختێك گوێیان لە وشەی ئیسلام یان عەرەب دەبێت دەمودەست تارماییەك لەدەمارگیریی‌و دژە لێکبوردن‌و بێزکردنەوە لەئافرەت‌و داننەنان بە پێودانگەکانی جیهانی تازەو بەتایبەتیش مافەکانی مرۆڤ‌و...تاد، بەر زەین‌و خەیاڵیان دەگرێت. ئەرکۆن جاڕزو بێزار بوە لەوەی کە هەر جارێك دیالۆگ‌و مونازەرە لەگەڵ بیریارێکی ئەورووپاییدا سازدەدات یان لەلایەن رادیۆو تەلەفزیۆن‌و رۆژنامەیەکەوە رایدەکێشنە نێو پرسیارو وەڵامەوە، ئەم جۆرە قسەوباس‌و کلێشانە دووبارەو چەندبارە بەردڵی دەگرنەوە.

بێگومان ئەرکۆن نکوڵی لەوە ناکات کە قەیرانێك لەنێوان کەلەپوری ئیسلام‌و سەردەمدا هەیە، بەڵام ئەوەندەی هەبێ ئەرکۆن لەڕوانگەیەکی مێژووییەوە دەڕوانێتە ئەو قەیرانە، نەك لەڕوانگەیەکی ئەبستراکتیانەی پووچ لەهەر چەشنە شیکارییەکی سۆسیۆلۆژی‌و رەهەندێکی مێژوویی. لەم کاتەدا جێنەخستنی شتەکان لەڕوانگەی مێژووی خۆیانەوە بەواتەی مەحکومکردنی پێشوەختی (ئیسلام) دێت تەنانەت بەرلەوەی هەر بەراوردو دیالۆگێك ئەنجام بدەین. ئاشکرایە کە کۆمەڵگە ئیسلامی‌و عەرەبییەکانی ئێستا بەدەست دواکەوتنێکی ئابوری‌و کۆمەڵایەتی‌و سیاسی‌و زانستی‌و تەکنیکیانەی وەهاوە دەناڵێنن؛ کە هەل بۆ نەڕەخساندوون کە رێز لە مافەکانی مرۆڤ بگرن، وەك ئەوەی پێشووتر لە لایەن شۆڕشی فەڕەنسییەوە لە ساڵی 1789داو دواتریش لەلایەن نەتەوەیەکگرتووەکانەوە لەساڵی 1948دا، راگەیەنراون. بەڵام ئەم حاڵەتە هۆکارەکەی ناگەڕێتەوە بۆ دەمارگیرییەکی ئەزەلی‌و ئەبەدیی کە بەئیسلام‌و عەرەبەوە لکابێت! بەڵکو زۆر بەئاسانی دەتوانین هۆکارەکەی دیاریبکەین‌و بیگەڕێنینەوە بۆ ئەو جیاوازییە مێژووییەی لەنێوان کۆمەڵگە ئیسلامییەکان‌و ئەورووپییەکاندا هەیە. جا لەبەرچاونەگرتنی ئەم حەقیقەتە بەڵگەیە بۆ نیازخراپی‌و دواتریش رێسازدەرە بۆ کەوتنە نێو قوڕەڕەشی ئەو داوەری‌و بڕیارە جەوهەرانی‌و رەگەزپەرستیانەی کە پێشوەخت دراون (دیارە زۆربەی ئەورووپاییەکان‌و تەنانەت زۆرێك لەرۆشنبیرانی عەرەب نائاگایانە هەمان ئەم پرۆسەیە دووبارە دەکەنەوە). لەبەرئەوە، وەختێك ئەرکۆن دەست بۆ توێژینەوەی لێکبوردن لەنێوەندی ئیسلامیدا دەبات، واتە ئاگای لەمەترسی ئەو کارەی خۆی هەیەو لێی بەوریایە، مەبەست لە مەترسی پشتگوێخستنی ئەم راستی‌و پێدراوە مەبدەئیانەیە، هەروەها لەمەترسی تێنەگەیشتنی هەر شتێك دەربارەی ئیسلام یان عەرەب یان تەنانەت لەبارەی خودی چەمکی لێکبوردن خۆشییەوە. لێکبوردن خەسڵەتێکی ئەزەلی نییە لەبۆشاییدا هەڵواسرابێ! بەڵکو ئەو خەسڵەتەیە کە پابەندی جەبرەکانی کۆمەڵگەو ئاستی پەرەسەندنی ماتەری‌و ئاستی گەشەکردن‌و گەشەنەکردنی ئابورییە، هەروەها رادەی بەخۆداچوونەوەی رەخنەگرانەو

ڕۆشنگەرانەی ریشەیی ئەو کۆمەڵگەیە بەکەلەپووری خۆیدا یاخود پشتگوێخستنی ئەو جۆرە رەخنەگرییە...تاد، بەواتایەکی دی، تەنها لەمیانەی کۆمەڵگەو پلەی پەرەسەندنە مێژوویی و هۆشمەندییە فیکرییەکەیەوە دەتوانرێت قسە لەسەر لێکبووردن بکرێت. بەڵام سەیر لەوەدایە زۆربەی عەرەبەکان خۆیان ئەو وێنا رۆژهەڵاتناسییە جەوهەرانییە رەگەزپەرستییە لەبارەی ئیسلام و عەرەبەوە دەخولقێنن، ئەویش بەهۆی بزربوونی هەستی مێژوویی‌یانەوەیە؛ لەم بارەشدا کەسی لاواز هەمیشە ئایدیۆلۆژیای کەسێکی بەهێز بەشێوەیەکی بەدحاڵیانە وەردەگرێ. ئەمە لەکاتێکدا ئەگەر باسی چەندین هۆکاری تر نەکەین (لاواز رقی لەخۆی دەبێتەوە کاتێك خۆی وەك کەسە بەهێزەکەی بەرامبەری نابینێتەوە، هەروەها هەژاریش لەبەردەم دەوڵەمەندێکدا شەرم لەخۆی دەکات).

ب – مەبەست لەو هەڵە مێژووییانە ئەوەیە کە تێگەیشتن و چەمکەکانی ئێستا بەسەر رابردوودا بسەپێنین، یاخود سەرکۆنەو لۆمەی رابردوو بکەین لەبەرئەوەی نەیتوانیوە وەك ئێستا بکات، وەك ئەوەی ئەو رابردووە لەدەمی خۆیدا توانیبێتی لەو چەمکانە تێبگات و وەریانبگرێ، یان وەك ئەوەی هەر چەرخ و سەردەمێك مەحکوم نەبێ بەبارودۆخ و تواناکانی رۆژگاری خۆیەوە! ئەمەیە تێڕوانینێکی نامێژووییانە بۆ گرفت و کێشەکان. رۆژئاواییەکانیش، کاتێ ئەم هەڵە مێژووییانە دژ بە ئیسلام بەکاردێنن، خۆیان بەکارێکی ئاسانەوە خەریك دەکەن و تەسلیمی سەرجەم ئەو داوەرییانە دەبن کە پێشوەخت دراون و بۆ ئەمانیش بەمیرات ماونەتەوە. بەڵام هەرچی بەرپەرچدانەوەی ئیسلامییەکانیشە بۆ ئەوان موبالەغەو پێوەنانێکی قەبەکراوی پێوەدیارە وەك ئەوەی کە ئیسلام تاکە ئایینی لێکبووردنە، ئەم وەڵامەش سوودێکی ئەوتۆی نییە. چونکە ئەمجۆرە قسەوباسانە بۆ بازدانە بەسەر مێژوودا، یاخود لەبەرچاونەگرتنی رووداوەکانیەتی. خۆ ئاشکرایە کە ئیسلام لەسەردەمەکانی ناوەڕاستدا گیانی لێبووردنی لەوانی تر زیاتر بووە، ئەمەشی زیاتر لەجارێك سەلماندوە (بڕوانە ئیسلام پلەو پایەیەکی بۆ ئەهلی کیتاب تەرخانکردوەو ئەوانیش – واتە ئەهلی کیتاب – ج پلەو پایەیەکیان بەخشیوەتە ئیسلام)، بەڵام (دەبێت ئەوەش بگوترێت) کەلێکبووردنەکەی ئیسلام بەکۆمەڵێ بارودۆخ و پێویستیی ئەو سەردەمە سنووردارو مەرجدار بوە، بەجۆرێك کە لەتوانایدا نەبوە بیانبەزێنێ، چونکە لێکبووردن بۆ خۆی شتێکی سنووردارەو، ئەو لێکبووردنەی لەسەدەکانی ناوەڕاتدا هەبووە هەمان لێکبووردنی سەدە نوێکان نییە، واتە دوای ئەوەی جاڕدانی مافی مرۆڤ راگەیەنرا.

ت – جارێکی تر ئەرکۆن دەچێتەوە نێو شەڕێکی فیکرییەوە لەگەڵ ئەو رۆژهەڵاتناسانەی کە لەئێستەدا بەخۆیان دەڵێن زانای ئیسلامیات. ئەمانە هیچ جۆرە جیاوازییەك لەنێوان ئیسلام وەك ئایینێك و، کۆمەڵگە ئیسلامییەکان وەك کۆمەڵگەلێکی مرۆیی لەچەشنی کۆمەڵگەکانی تردا ناکەن. هەر ئەمەشە هەلی ئەوەیان بۆ دەڕەخسێنێت کە هەر جارێك دیاردەیەکی لەو جۆرە لەکۆمەڵگە عەرەبی و ئیسلامییەکاندا بەدیبکەن ئیدی یەکسەر ئیسلام بەدەمارگیرو دژە لێکبووردن باسبکەن. بەڵام ئاستی ئایین و رێنومایییە ئایدیالییەکانی لەلایەك، ئاستە مرۆیی و ململانێ و خۆپەرستی و دەمارگیرییەکانیان لەکۆمەڵگەدا بەلایەکی تر. لەم بارەدا ئایینیش بەپێی بارودۆخی کۆمەڵایەتی و ئابووری و کلتووری نێو کۆمەڵگە رووبەڕووی دەمارگیریی و لێکبووردن دەگرێتەبەر.

پ – بەو واتایەی کە سەرجەم ئەو ئایینانەی بەدرێژایی سەردەمانی پێشوو ململانێی توندوتیژیان لەنێواندا هەبووە، لەئەنجامدا ناچار دەبن کە ریزبەندییەك پێکبێنن و هەموویان بچنە یەك بەرەوە بۆ دژایەتیکردنی بەرەی عەلمانیەت کە لەدونیای تازەدا هەموو شتێکی راماڵیوە. واتە ناکۆکی نێوان ئەم ئایینانە خۆیان دەبێتە ناکۆکییەکی لاوەکی بەبەراورد لەگەڵ ئەو ناکۆکییە سەرەکییەی لەگەڵ ئایینی نوێی مۆدێرنیزمدا هەیانە.

ج – بەو مانایەی، لەکۆمەڵگەیەکدا کە مەسیحیەت یان یەهودیەت تیایدا باڵادەست بوویێت، شتێکی ئەستەمو مەحاڵ بوە بیر لەموسڵمان کرابێتەوە وەك مرۆڤێکی کامڵو تەواو. پێچەوانەکەشی هەر راستە. مرۆڤی کامڵو تەولو و بەهرەمەند بەهەموو مافەکانی خۆی لەکۆمەڵگەی مەسیحیدا ئەو مرۆڤەیە کە باوەڕدارێکی مەسیحی بێت؛ لەکۆمەڵگەی ئیسلامیشدا بەهەمان شێوە باوەڕدارێکی ئیسلامییەو؛ لەکۆمەڵگەی جولەکەشدا ئەو کەسەیە کە چۆتە سەر ئایینی یەهودی. تەنانەت لەناو خودی کۆمەڵگەیەکیشدا کە مەزهەبی کاسۆلیکی تیایدا باڵادەست دەبێت، وەك فەڕەنسا، ئەوا مرۆڤی تەولو و کامڵ لەو کۆمەڵگەیەدا کەسێکی کاسۆلیکە (بڕوانە ئەو بارو گوزەرانە تاڵو ناخۆشەی کە پرۆتستانە فەڕەنسییەکان لەپێش شۆڕشدا هەیانبووە). هەروەها لەکۆمەڵگەیەکدا کە سوننە تیایدا باڵادەست بوە خەڵکی سوننیو، لەکۆمەڵگەیەکی شیعەگەردا خەڵکی شیعی (بۆ نموونە ئێران). بەڵام چەمکی مافەکانی مرۆڤ بەواتای تازەی وشەکە، سەرتاپای ئەم دابەشبوونە ئایینیو مەزهەبیانە تێدەپەڕێنێو دانیان پێدا نانێت. چونکە مرۆڤ هەر مرۆڤە بەدەر لەهەر مەرجگەراییەکی ئایینیو مەزهەبیو ئەتنیکی. لەسەردەمی نوێدا، مرۆڤ بۆ خۆی بۆتە بەهایەكو پێویستە وەك مرۆڤ رێزی لێبگیرێت، چونکە ئەو مرۆڤە خۆی شوێنی لەدایکبوونو ئاینو مەزهەبی خۆی هەڵنەبژاردوە. کارێکی مەحاڵە لەنێو بازنەی کۆمەڵگەکانی پێش مۆدێرنەدا بیر لەم چەمكو تێگەیشتنە نوێیە بۆ مرۆڤ بکرێتەوە. ئەمەش ئەو حاڵەتەیە کە ئەرکۆن پێیدەڵێت بیرکردنەوە لێی مەحاڵە.

ح – ئەرکۆن مەبەستی لەم حاڵەتە ئەوەیە کە: ئەو ئەورووپاییانەی ئیسلام بەوە تۆمەتبار دەکەن کە جێگەو پایەی (الذمي) داوە بە مەسیحیو یەهودییەکان (ئەهلی کتێب)، لا لە حەقیقەتێك ناکەنەوە کە ئەو جێگەو پایەیە قۆناغێکی پێشکەوتووی لەسەدەکانی ناوەڕاستدا نواندوە. بەڵگەش ئەوەیە کە هەر لەو قۆناغەداو لەو کۆمەڵگایانەی کە مەسیحییەت تیایاندا زاڵبووە بەهیچ شێوەیەك ئەو پلەو جێگەیەی بەکەسی موسڵمان بەڕەوا نەبینیوە، لەبەر هۆیەکی ئاسان، ئەویش سەیرنەکردنی موسڵمانە لەو کۆمەڵگەیەدا تەنانەت وەك (ئەهلی کتێب)یش! ئەمە جگە لەوەی بەکەسێکی دەرەوەی بازنەی باوەڕی راستەقینەو رزگاربوونی هەتایی لەقەڵەمدراوە. (محەمەد وەك پێغەمبەرێكو قورئانیش وەك کتێبێکی وەحی دانیان پیا نەنراوە). هەروەها ئەمجۆرە تۆمەتبارکردنە کارێکی ئاسانەو گوزارشتە لەهەڵەیەکی مێژوویی یان لە سەپاندنێکی بەزۆری چەمكو واتاکانی مۆدێرنیزم بەسەر سەردەمەکانی رابردوودا. پێویستە بەراوردکاریی لەنێوان ئەو شتانەدا بکەین کە بەراوردکردن هەڵدەگرن، وەك بەراوردی نێوان ئیسلامو مەسیحیەت لەسەدەکانی ناوەڕاستدا، نەك بێین بەراورد بکەین لەنێوان ئیسلامو مۆدێرنیزم لەرۆژئاوای مۆدێرندا. لێرەدا تێفرێدانو سەپاندنێکی دژ بە حەقیقەتی مێژوویی لەئارادایە.

خ – لێرەوە ئەرکۆن جیاوازی دەخاتە نێوان چرکەساتی ئیسلامی قورئانیو ئەو چرکەساتە ئیسلامییەی کە دواتر هاتەئاراوە. چونکە سیستەمە لاهوتییە تاکڕەوەکان دواتر پێکهاتنو زۆر لەئیسلامی قورئانی تەسکترو، زۆر لەویش کەمتر کراوە بوون. هەمان شت لەمەسیحیەتیشدا روویدا.. مەسیحیەتی ئەنجیل هەمان ئەو مەسیحیەتە نییە کە لە سەردەمەکانی ناوەڕاستدا دەسەڵاتی هەبوو چ وەك ئایدیۆلۆژیای رەسمی دەوڵەتو، چ وەك مەزهەبێکی لاهوتی کە غەیرە مەسیحییەکانی لەنیعمەتی خوا بێبەش دەکردو بەلاوەی دەنان (دواتریش فڕێی دەدانە دەرەوەی بازنەی مافە سیاسیو کۆمەڵایەتیەکانەوەو بەهاوڵاتی پلە دوو و سێو تەنانەت بەهیچیشی دەدانە قەڵەم). لەمبارەیەوە بڕوانە ئەو نەهامەتییەی بەسەر جولەکەدا هات لەکۆمەڵگە ئەورووپییە مەسیحییەکاندا تاکاتی بەرپابوونی شۆڕشی فەڕەنسی. ئەو شۆڕشەی کە ئازادیکردنو وەکو هاوڵاتیانی دیکە مافەکانی پێبەخشین.

ذ – بەوتای ئەو هیومانیزمە بەرفراوانەی کە بیریارانی گەورەی وەك (ئەلفەوحیدی و مەعەرپی) هەلگرو بانگەشەدەری بوون، لەدووڕگەیەکی دابڕاوی گۆشەگیر دەچوو لەچەقی دەریایەکدا کە کۆمەلگە بوو. ئەم تەوژمە تەنها تایبەت نەبوو بەچینە بالاو خۆشگوزەرانەکانی کۆمەلگە، بەڵکو هەرە زۆری "میللەت"یش (بەمانا ئاسییەکەی ئەو زەمانە عەوام و رەشۆك) لەژێر سایەو رەحمەتی فەقیەو ئامۆژگاریدەران و تێڕوانینە ئاشکراکانیاندا بوون بۆ مرۆڤ و جیهان.

ر – مەبەست لەدابڕان لێرەدا هەروەك ئاشکرایە دابڕانی مۆدێرنەیە کە هاوکات بوو لەگەل سەردەمی رۆشنگەری و شۆرشی فەرەنسیدا.

ز – ئاشکرایە کە ئەوروپاییەکان یەکبینە هاتیانداون بۆ پیادەکردنی سیاسەتی (پەرتکەو زالبە)، چونکە ئاوەکو خەلك لێکتر دابڕێن و هەریەکەیان بەپێی ئینتمای تایەفی یان ئەتنیکی یان مەزهەبی بەسەر شوێنە جیاجیاکاندا دابەشبن، یەك لەوی دی دەترسێ و گرانی دەبینن لەتێکەلبوونیان بەیەکتری. پاشان پێکهێنانی کۆمەلگەی مەدەنی و بنیاتنانی یەکێتی نیشتمانی پرۆسەیەکی قورس و گران دەبێ، چونکە ئەنجامدانی پرۆسەیەکی لەم چەشنە پێویستی بە رووخاندنی ئەو دیوارانەیە کە رۆلەکانی یەك کۆمەلگەی لەیەکتر دابڕیوە.. بەلام ئەم رووخان و هەلتەکاندنەش کارێکی هەروا ئاسان نییە، چونکە ئەوانە دیواری سایکۆلۆژیی دابڕەرو دەمارگیریی بەبەردبوون و سڕینەوەو رامالینیان لەشەو رۆژێکدا نایەتەدی. ئەوە تەنها فیکری شیتەلکاری – رۆشنگەرییە دەتوانێت ئەم پرۆسەی رامالین و رووخانە ئەنجامبدات. بەلام ئەی ئەو فیکرە لەکوێیەو کوانێ؟

ژ – بەمجۆرە دەبینین کە باسکردنی مەسەلەی لێکبوردن بەپێی میتۆدی مێژوویی و سۆسیۆلۆژیی، تەواو جیاوازە لەباسکردنی ئەو کێشەیە بەپێی دیدوبۆچوونە ئایدیالیزمە کلاسیکییەکە. بەپێی ئەم دیدوبۆچوونەی دواییان لێکبوردن جۆرێکە لەفەزیلەتێکی جەوهەرانی و نەگۆڕو، لەبەر هەندێ هۆ کە قابیلی شیکردنەوە نین، خەسلەتێکی جیاهەلکەوتوانەی تایبەتە بەهەندێ کەس و ئایین و گەلەوەو جگە لەمانیش هیچ کەس و ئایین و گەلێکی دی ئەمجۆرە خەسلەتانەیان نییە ! مەسیحییەکان خاوەنی لێکبوردنن لەبەرئەوەی مەسیحین، یان موسلمانەکان دەمارگیرن چونکە موسلمانن، یاخود بەپێچەوانەوە. ئەگەر سەرنجبدەین دەبینین ئەمە جۆرە ئاخاوتنێکی ئەبستراکیانەو ئایدیالییەو قڕی بەسەر واقیعی تێدا (یاوی مێژوویییەوە نییە. چونکە دەشێت مەسیحییەکان لەقۆناغێکی دیاریکراودا خاوەنی لێکبوردن بن، بەلام لەماوەیەکی تردا لەبەر چەندین هۆکاری مێژوویی و کۆمەلایەتی و ئابوری هەستپێنکراو، دەمارگیر بن. یان رەنگە فەرەنسییەکان لەماوەیەکی زەمەنییدا خەلکانێکی کراوەو سنگ فراوان بن، بەلام لەماوەیەکی دیکەدا خەلکانێکی داخراوو گۆشەگیرو دەمارگیربن؛ هەروەك لەکاتی ئێستادا لەمجۆرەن. ئەوە بارودۆخی ئابوری و کۆمەلایەتی و کلتورییە دەبنە هاندەر بۆ لێکبوردن و دەمارگیریی، بەهۆی بوونی رێژەیەکی بەرزی بێکاری لەفەرەنساداو بوونی ژمارەیەکی زۆر لەکرێکارانی کۆچبەرو خێزانەکانیان لەوێ، دەبینین بەشێکی زۆری فەرەنسییەکان دووچاری دەمارگیریی هاتوون دژ بەعەرەب بەگشتی و مەغریبییەکان بەتایبەتی. تەنانەت هەندێك جار دەمارگیریی کوێرانە دەگاتە ئەو ئاستەی کە هەندێکیان تاوانی کوشتن ئەنجام بدەن. دیارە ئەو کەسە لە رەوشێکی وەهادا چیدی بەبەریەوە نەماوە چوچاوی کەسێکی عەرەبی یان مەغریبییەك لەبالەخانەکەی، یان لەسەرشەقام و قوتابخانەکەی و...تاد، ببینێت.

ئەمە دەلێین لەکاتێکدا گەلی فەرەنسا سەردەمی رۆشنگەریی و شۆڕشی فەرەنسی و مافەکانی مرۆڤ و سەرجەمی فەلسەفە نوێکانی بینیوە. ئەی دەبێت چ بلێین بۆ ئەو گەل و کلتورانەی کە بەم دواییە نەبێت ئیدی هیچ جۆرە بەریەککەوتنێکیان لەگەل مۆدێرنەدا نەبوە؟ قسەکردن لەمەڕ لێکبوردن و ڕیزکردنی وشەی بەباق و بریق

# فەزیلەتی گشتی، فەزیلەتی تایبەتی

## سنووری لێکبوردن

■ ژولی سادا ژاندرۆن

● و. لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی

پێدەچێ کە لێکبووردن دراوێکی بێ چەندوچوونی ئەقڵیی و سیاسیی و مافی ئازادیخوازی بێت. لە ڕاستیدا ئێمە ئەوە بە بەڵگەنەویست دەزانین کە نابێ بیروڕا یان باوەڕێک بەسەر هیچ کەسێکدا بسەپێنرێ یان ڕێگەی ئەوەی لێبگیرێ، هەموو کەسێک لەم بوارەدا خاوەنی ئازادیی هەڵبژاردنی ڕەهایە. دەوڵەت یان هیچ دەزگایەکی دی، تەنانەت دینیش، مسافی دەستێوەردانی لەمبارەیەوەی نیە.

لە لایەکەوە بناغەی ئەم ئازادیە لە جیاوازیکردنی مەسەلەی گشتیی و مەسەلەی تایبەتیدایە، واتە لە دەستنیشانکردنی ئەو سنوورەی کە دەوڵەت دەتوانێ تیایدا بە شێوەیەکی ڕەوا یاسا دابنێت؛ بیروباکان وەک هەر شتێک کە بەستراوێ بە ئەخلاقەوە، لە بواری مەسەلەی تایبەتیدایەو ناگرێ بە مەسەلەیەکی گشتی بناسرێ. لە لایەکی دیەوە ئازادی باوەڕو بیروڕاو دەربڕینی، ڕەگەی لە ناو مافێکدایە کە هەمان مافی مرۆڤ و کۆی مافە سروشتیە نەگۆڕەکانە کە زامنی ئازادی بیروڕا یان باوەڕی هەر مرۆڤێک (لایەنیکەم لە پێناسەدا) تەنها لەبەر مرۆڤبوونی دەکات. لێکبووردن لێرەدا زۆرتر پشتی بە چەمکی مافەکان یان ئازادی باوەڕو بیروڕا بەستوە، تا جیاوازی نێوان مەسەلەی گشتیی و مەسەلەی تایبەتی. تەنانەت کاتێک دەوڵەت یان دەزگایەکی زەمینی یان مەزهەبی، پێبنێتە جێگایەکەوە کە جێگەی ئەو نیەو باوەڕو بیروڕا بەسەر خەڵکیدا بسەپێنێ، سەرئەنجام ئەوان خاوەن ئەو ئازادیە هەمیشەییەن کە بەو شێوەیەی خۆیان بە ڕاستی دەزانن بڕیار بدەن و بە حوکمی ویژدانی خۆیان داوەری بکەن، جا ئیدی ئەو دەوڵەتەی حوکمیان دەکات هەر شێوەیەکی دەبێ با ببێ، دەوڵەت بەرپرسیاری پاراستنی ئەم ئازادیە بنەڕەتیەیە. لێرەوە لێکبووردن نەک بە ناونیشانی

سیاسی‌و حقوقی، بەلکو بە مانای ئەخلاقی بابەتی مرۆیی، دەردەبڕێ: لێکبوردن دەبێ بە نیشانەی هەلومەرجێك کە ئەویدی دەتوانێ بەشێوەیەکی جیاواز لەوەی ئێمە بیردەکەینەوە، بیربکاتەوەو کاربکات‌و دەبێ بە ئاشکراکەری حورمەتی تاك بە تاکی مرۆڤەکان. بەمشێوەیە لێکبوردن دەبێتە سیمای جۆرێك ئەخلاقی ڕۆژانە، کە یەکەم بنەمای بریتیە لە ئەنجامدانی ئەرکی مرۆڤ لە پاراستنی حورمەتی ئەوی دی لەهەر ڕوویەکەوە بێ. کورتەی ماناو بنەما قبولکراوەکانی لێکبوردن بە هەمان ئەندازەی ڕەوادارێتیە سیاسی‌و حقوقی‌و ئەخلاقیەکانی، هەمەڕەنگو جۆراوجۆرە.

لێکبوردن کە لە یەك کاتدا بە فەزیلەتێکی گشتی‌و تایبەتی زانراوە، هەندێکجار نا سیاسی‌و جۆرێك مەسەلەی تایبەتیە لە پەیوەندیدا بە کەسێکی دیەوە، هەندێکجاریش وەك جۆرێك لە خەباتی سیاسی‌و کۆمەلایەتی ناسراوە. بێگومان ڕووی دوەمی لێکبوردن لە هەموو ڕوەکانی دی بەرچاوترە. لێکبوردن بەر لەهەر شتێك وەك مافێك دەردەکەوێ کە داوا دەکرێ: مافێك لە بەرامبەر توندڕەویە سیاسی یا مەزهەبیەکاندا، هەروەها لە بەرامبەر دەستێوەردانی دەولەت لە مەسەلە مەزهەبیەکان، یا لە بواری مەسەلە تایبەتیەکاندا، کە هەر کاتێك مافی تاکێك دەستدرێژی بکرێتە سەر، بۆی دەگەڕێننەوە، بەمشێوەیە لێکبوردن دەچێتە خزمەت خواستی جۆراوجۆرەوەو ڕەنگە خۆی هیچ سوودێکی لێنەبینێ‌و لە ڕوودانی ئەو خەباتە بەربلاوانەدا کە تەنها بوە بە ئالای، وێنا یان دروشمێکی لێدەمێنێتەوە.

بە وتەی پۆل ڕیکۆر لێکبوردن بابەتێکی تەلە ئامێزە، هەم زۆر سادەیەو هەم زۆر گرانە، لە ڕاستیدا شکاتکردن لە دەست "لێنەبوردن" یا "تەحەمولنەکردن" بێ سەرنجدانم لەو ئیلتیزاماتە جۆراوجۆرانەی لە ئەستۆی هەر کەسێکە، زۆر ئاسان دێتە پێشچاو، هەروەها دروستکردنی هاوئاهەنگی لەنێوان پێویستیە جۆراوجۆرە ئەخلاقی‌و حقوقی‌و سیاسی یان مەعنەویەکاندا، کە سەلمێنەری ڕەوایەتی لێکبوردنە، کارێکی زۆر زەحمەتە. لێکبوردن بیرۆکەیەکی چەند لایەنەیە، لەبەرئەوەی کە وەلامدەرەوەی پێداویستی جۆراوجۆرە، هەروەها لەبەرئەوەش کە ڕەنگە هەمیشە ڕووی پێچەوانەی لێکبوردن واتە لێکنەبوردن‌و تەحەمولنەکردن، هۆیەکانی لەناوبردنی فەراهەمبکەن، هەرچەند کە دەبێ بۆ جێگای لێکبوردن لە نێوان ئەو دوانەدا بگەڕێین.

ناسینی بیری لێکبوردن بەستراوە بەوەوەی کە سنورەکەی دەستنیشان بکەین‌و ڕێگرەکانی هەلسەنگێنین. بەرگریکردنی بێ قەیدو شەرت لە لێکبوردن خۆی هەنگاونانە بۆ لەناوبردنی لێکبوردن: ڕێگەدان بەو بیروڕایانەی دژی لێکبوردنن‌و بەناوی لێکبوردنیشەوەن، ڕێگەدانە بەو کارانەی کە مەبەستیان سنووردارکردن یان لەناوبردنی ئازادی دەربڕین‌و بیروڕاو باوەڕەو هیچ دەرئەنجامێکی جگە لە لەناوبردنی لێکبوردن نابێ، بەلام ئایا زامنکردنی لێکبوردن بە لاوازکردنی، خۆی لە خۆیدا کارێکی تەحەمولنەکراو نیە؟ هاواری "تەحەمولنەکردن" هەمیشە مەسەلەی لێکبوردن دەهێنێتە پێشێ‌و پێویستی بەوە هەیە کارێك بە تەحەمولنەکراو بزانرێ بۆئەوەی دەرکەوتەکانی لێکنەبوردن باشتر ئاشکرا بێت. کردنی لێکبوردن بە بەهایەکی ڕەهاو بێسنوور، بە مانای ئەوەیە کە هەلومەرجی ڕوودانی لەناویەرین، پێناسی لێکبوردن پێویستی بەوە هەیە کە شێوەی دەستنیشانکردنی لە سیستەمە فکرییەکاندا کە سەر بە هەلومەرجی مێژوویی جۆراوجۆرن تاوتوێ بکرێ: تاوتوێی ئەوەی کە سنووری لێکبوردن تا کوێ بێت‌و چ شتێك بە تەحەمولنەکراو دابنرێت؟ بەلام مرۆڤ

ئارەزووی ئەوەی هەیە کە هیچ سنووڕێك بۆ لێکبوردن قبوڵنەکات بۆئەوەی باشتر بتوانێ بەرگری لە مافێك بکا کە بە پێی ڕێساو بەها ئەخلاقی یان سیاسیەکانی خۆی بە ڕاستی دەزانێت.

ئایا ئەمەش خۆی لە خۆیدا نیشانەی ئازادیو خودموختاری ئێمە نیە؟ بەمە پرسیارێکی دیش دێتە پێشەوە: ئایا لەم حاڵەتەدا ئەگەری ئەوە نیە کە هەڵبژاردنە ئەخلاقیو مەزهەبی یان سیاسیەکان هەموو لەیەك ئاستدا ڕاوەستنو جۆرێك لە هاوئاستی بەهاکان دروستببێ کە لە یەکسانی یان باشتر بلێین لە مافی یەکسانو نەبوونی جیاوازی بۆ هەر جۆرە بیروڕایەکەوە، سەرچاوە دەگرێ؟ ئەگەر لێکبوردن ناچارمان دەکات کە ڕێزی هەموو بیروڕایەك بگرینو خۆمان لە هەڵسەنگاندنو سووك سەیرکردنیان بەدوور بگرین، ئایا ئەو مەترسیەی تێدا نیە کە لە پێشەوە ئەگەری هەر وتوێژێکی ڕەخنەگرانە، لەناو بەرین؟ لەم حاڵەتەدا لێکبوردن هەڵوێستێك دەبێ کە تیایدا هیچ ڕاستیەك سەقامگیر نابێتو بەرگری لە هیچ شتێك جگە لە هەقیقەتی لێکبوردن ناکرێ. لێکبوردن پەیوەستدەبێ بە گومانکارییەوەو فۆرمی ناکۆکی ئامێزی ئەخلاقی نەهلیستیانە یان قوتابخانەی بێهودەیی لە بواری ئەخلاقیدا، بەخۆیەوە دەگرێ. لە ڕاستیدا لێکبوردن دەبێ بە فەزیلەتێکی هیچ. ئەم ڕستەیەی کلۆدێلمان لەبیرە کە دەیگوت: *"لێکبوردن؟ بۆ لێکبوردن، چەند ماڵێکیش هەیە"*.

بیری لێکبوردن وەك فەزیلەتێك، تەنانەت گەر هەموانیش لەسەری ڕێککەوتین، ئەوەندە سادە نیە. پێدەچێ کە دەبێ یەکێك لە مانا سەرەتاییەکانی لێکبوردن وەلاوە نرێ: قسەکردن لە بارەی لێکبوردنەوە وەك فەزیلەتێکی ئەخلاقیو هاوتاکردنی لەگەڵ شێوەیەك یان دەربڕینێکی نەریتی ڕێزگرتن {لەوی دی}، هاوکات دەبێت لەگەڵ گۆڕانی تەنانەت بیری ڕێزگرتنو وازهێنان لەبیری لێکبوردن. ئەم قسەیە مانای چیە؟ واتە ئەو بابەتانەی کە ڕەنگە مسداقی هەردوو چەمکەکە بن، یەکسان نین، ئێمە ڕێز لە یاسا دەگرین، بەڵام لە بارەیەوە لێبوردوو نابین. لە بەرامبەر بیروڕای ئەوانی دیدا لێبوردوو دەبین، بەڵام ڕێز لە خودی خۆیان کە جیاوازن لە بیروڕاکانیان دەگرین. لێرەوە دەشی ڕێزیان لێبگرین بێئەوەی ئامادەی لێبوردن بین بەرامبەر بە بیروڕاکانیان، لە بارەی بابەتێکەوە کە ئازادو سەربەخۆ وەسفدەکرێت، واتە بیرێك لەبەر خودی بیر "لێبوردوو" نابین {ئەگەر بمانەوێت وتەزاکانی کانت لە بارەی ڕێزەوە بهێنینەوە} بەڵکو ڕێز لە کەس یان زیهنی سەربەخۆ دەگرین. لێرەوە تێکەڵکردنی ڕێزگرتنو لێکبوردن دەبێتە هۆی لەناوچونی بیری ڕێزگرتن کە وتەزایەکی ئەخلاقیە. یاسای ئەخلاقی ناچارمان دەکات کە ڕێز لە کەس وەك مرۆڤێکی ئاقڵو سەربەخۆ بگرین، نەك ئەوەی لە بارەیەوە لێبوردوو بین. ڕێزگرتن لەم پێناسەیەدا حوکمێکی براوەیە نەك مەرجدارو دەستورێکی دوربینانە لە زۆرانبازیەکی دوولایەنەدا. لەلایەکی دیەوە ئاشکرا نیە کە بنەمای لێکبوردن خەسڵەتی ئەخلاقی کەسایەتی بێت، واتە بنەماکەی مافێکی نەگۆڕ بێت کە ویژدانێك بۆ دەستنیشانکردنی ڕێگەو شێوازی خۆی هەیەتی. لێرەوە دەکرێ لێکبوردن لەسەر بنەمای تەکبیرە دەزگایی یان حقوقیو سیاسیەکان بونیاد بنرێ: لۆك لێکبوردن بە دەرئەنجامی جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت، دەزانێ، نەك بە دەرئەنجامی ئەو مافانەی کە بە ناچار بەستراون بە سروشتی مرۆڤەکانەوە. هێشتا ماوە، زۆر ماوە بۆ چەمکی مافی مرۆڤ. دواجار بە یەکسانی زانینی لێکبوردنو ڕێزگرتن بێگومان دەوری پەیوەندی دەسەڵاتی لێدەگرێتو دەبێتە هۆی لەناوچوونی ڕەهەندی مێژوویيو سیاسی لێکبوردن: ئایا لەهەر قۆناغێکی مێژوویيدا کە مەسەلەی لێکبوردن هاتۆتە پێشێ بە مەبەستی

چاککردنەوەی پەیوەندییە ناهاوتاکانی دەسەڵات، ناکۆکی نێوان هاوڵاتیانو فەرمانڕەوایان یا لە نێوان هاوڵاتیانو ئەوانی دیدا یا گروپێك لە هاوڵاتیان لەگەڵ دەزگاکانی کەنیسەدا، نەبوە؟

مێژووی وشەی "لێکبوردن" بە تەنیا ئاڵۆزی چەمکەکەیە، نووسەرانی کاسۆلیك لێکبوردن بە سەقامگیری لە ئەزموونداو توانای تەحەمولکردنی خراپە، بە بەدبەختی یان بەڵا سروشتییەکان دەزانن. چاوگی Tollo (بە مانای بردن، تەحەمولکردن، بەرگەگرتن (لە زمانی لاتینیشدا وشەیToleranceلەم ڕێگەوەیە))کارێکە کە مرۆڤ لەسەر خۆی ئەنجامیدەدات. زاراوەی پزیشکی لێکبوردنیش هەر ئەم مانایە دەبەخشێ: تەحەمولی جەستەیی بونەوەرێکی زیندوو، بە مانای توانای تەحەمولکردنی دەرمانێك لە مادەیەکی کیمیایی یان فیزیایی دیاریکراوەوە، بەبێ ئەوەی زیانی پێبگەیەنێت، ئەم بەکارهێنانی وشەی لێکبوردنە، چەمکی کۆمەڵناسی "ئاستی تەحەمولی" دروستکردوە کە ئاشکراکەری توانای تاك یان گروپێکە لە تەحەمولکردنی کاریگەری ئەڵتراژینێکداو نەگۆڕان لەژێر کاریگەریدا.

لێکبوردن سەرەتا پەیوەستە بە پەیوەندی مرۆڤ بە شتەکانەوەو بە گۆڕینی مانای ئاشکراکەری پەیوەندی مرۆڤە بەوانی دیەوە، بەڵام هەر لەم مانایەدایە کە چەمکی تایبەتی خۆی دەدۆزێتەوە.

میراتی مانای یەکەم دوولایەنی جیاواز بە مانای لێکبوردن دەبەخشێ کە لە پێناسی وشەنامەی ڕۆبەردا بەمشێوەیە هاتوە: "لێکبوردن بریتییە لە وازهێنان لە ئەمرو نەهیکردن لە حاڵەتێکدا کە توانای ئەنجامدانی هەبێت، لێکبوردن ئەو ئازادییە کە لەم وازهێنانەوە بەدەست دێت". ئەم پێناسەیە لایەنیکەم مەتەڵئامێزە: نە ڕوونکراوەتەوە کە چ کەسێك وازدەهێنێتو نە چۆن ئەم وازهێنانە دەبێتە هۆی ئازادی. ئایا لێکبوردن ئیمتیازێکە کە لە شێوەی ئازادییەکی تەواو نیگەتیڤدا بەوی دی دەدرێت؟ پێناسی دوەم لە بواری پەیوەندی کەسەوەیە بەوی دیەوە، نەك لە بواری دەزگاکاندا: "هەلومەرجێك کە ئەگەری بیرکردنەوەو کارکردن بەشێوەیەکی جیا لەوەی ئێمە قبوڵمانە، دەدات". لەم پێناسەیەدا کەمتر لە "قبوڵکردنی" ئەو، سەرنج لە دەرکی دیدەکانی ئەوی دی لە ڕووی هاوڕەنگی دەروونییەوە دەدرێت، بنەمایەکی ئاڵۆزە، لەم پێناسەیەدا لێکبوردن ئیمتیازێکە بۆ ئەوی دی لەلایەن کەسێکەوە کە بڕوای وایە هەقیقەت لای ئەوە. جۆرێك بەرگەگرتنی هەقیقەتە لە بەرامبەر هەڵەدا. لێرەدا ئەوی دی وەك "شێوازێکی بیرکردنەوەو کارکردن" وەسف دەکرێت. ئایا پێویست دەکات ئاماژە بۆ پێناسی وشەنامەی فۆرتیێر (بڵاوکردنەوەی ساڵی 1691ی میلادی)یش بکەین": (لێکبوردن (کرداری تێپەڕ)): تەحەمولکردنی شتێك، شکاتنەکردن لێی، سزانەدانێتی: دەبێ لێبوردوو بین لە بەرامبەر هەڵەی ئەو کەسانەی لەگەڵیاندا دەژین، لە شاری ڕۆما لەگەڵ عەرەق خۆرەکاندا لێبوردوون، بەڵام کارەکەیان ناسەلمێنن. کاتێك کە ناتوانین تەعەدا یان دەستدرێژییەك لە ڕەگەوە دەربهێنین، دەبێ لەگەڵیدا لێبوردوو بین. لەگەڵ تاوانێکدا کە ناتوانین سزای بدەین، دەبێ لێبوردوو بین. لێکبوردن جۆرێك بەرگەگرتنە کە مرۆڤ بەهۆیەوە یان شتێك، ڕەفتارێکی خراپ، هەڵەیەك تەحەمولدەکات، یان دەیشارێتەوە. عەرەق خۆرەکان تەحەمولدەکرێن چونکە ناکرێ ئەو خراپکارییانەی کۆنترۆڵیان دەکات، لەناوببرێت، بێ هۆ نیە کە زۆرجار بێ دینیو فەحشایان بەیەك شت دادەنا. ئەگەر تەنها لەگەڵ خراپیدا لێبوردوو بین، چیدی لێکبوردن ناتوانێ خۆی فەزیڵەتێك بێت: ئەوە چ جۆرە ئەخلاقێك دەبێ ئەگەر لێبوردوو بین لەگەڵ ئەو شتەدا کە نەهی ئەخلاقە؟ لە

بیرمان بێت کە ئەزموون و تەحەمول بۆ کەسێکە کە لێدەبوورێ و هەق بەدەست ئەوە. دیارە قبوڵنەکردن بە مانای دەرکردن و ئەشکەنجەدان و ئازاردان نیە. بەڵام لێکبووردن، بێ لایەنی نیە: ئەو شتەی لێبووردوو دەبێ لەگەڵی، بە هیچ شێوەیەك: هەق دروستناكات. ڕێگەدان، سەلماندن نیە. ئەو شتەی لێی دەبوورێ دەچێتە ژێر باڵی هەقەوەو یاسا لە بەرامبەریدا بێدەنگ دەبێت. کاتێك لە شتێك دەبوورێت کە توانا یان جەسارەتی ڕێگەگرتنی نیەو لەم حاڵەتەدا وەك "لێکبووردنگەری" مەحکوم دەگرێ، لێبووردن لەم حاڵەتەدا بە سستبەکی گوناهکارانە یان بێ هیمەتی ناودەنرێ.

پێناسی وشەنامەی ڕۆبێر ئاشکراکەری دابڕانێکە: لەم پێناسەیەدا بە پەڕینەوە لە وازهێنانەوە بەرەو قبولکردن و هەروەها لە سڕینەوەی ماوەکانەوە بەرەو قبولکردنی هەمەڕەنگی دەپەڕێن، چیدی لێکبووردن ئەو مانایەی نابێت بەڵکو دەبێ بە بنەمایەکی عەمەلی کە مرۆڤ بە پێی ئەوە لە چەند ڕوویەکەوە تەسلیمی ئەوی دی یان وردتر بڵێین، تەسلیمی ئەوی دی وەك کەسێك دەبێ کە بیروڕاکانی لەگەڵ بیروڕاکانی ئەودا جیاوازو ناکۆکە. ئەو کەسەی لێدەبوورێ، سوود لەم لێبووردنە وەردەگرێ. لەم حاڵەتەدا لێکبووردن وەك ئیمبرتۆ جیانینی دەڵێ وەك "دروشمی ژیانی هاوبەش "دەناسرێ کە نمونەکەی وتوێژو زمانی هاوبەشە کە مرۆڤ ناچار دەکا "قەبوڵی غەیر" بکات.

سەیر ئەوەیە ئەگەر ئەم پێناسەیە لەگەڵ پێناسی "لێکنەبووردن"دا بەراورد بکەین، وەك پۆل ڕیکۆر دەڵێ، ڕووبەڕووی هەلومەرجێکی پێچەوانە دەبینەوە. لەم حاڵەتەدا ڕەفتاری تاك پێش ڕێسای هاوبەش و گشتی دەکەوێت و لێکنەبووردن بریتیدەبێ لە "حاڵەتی پێچەوانەی لێکبووردن (مەزهەبی یان دینیای)" و "مەیل بۆ تەحەمولنەکردن، مەحکومکردنی ئەوەی لە ڕەفتارو بیروڕای ئەوانی دیدا بەدڵی ئێمە نیە". ئەم پێناسەیەی لێکنەبووردن هەمان ئاڵۆزی پێناسی لێکبووردنی هەیە. ئایا دەبێ لێکبووردن وەك دەستورێکی ئەخلاقی و سەر بە ئەخلاقیات بزانین کە بناغەکەی لە بەهای کەس یان ویژدانیدایە؟ یان لێکبووردن دەرئەنجامی کۆمەڵی تەکبیری دەزگاییە کە دەتوانێ زامنی ئازادی و مافێك بێت کە مەرجەعە جیاوازەکانی دەسەڵات بە تاکەکانی دەبەخشن؟ ئایا لێکبووردن بنەمای یاسا عەلمانیەکانە بەو هۆیەی کە پشتی بەستوە بە مافە ئەخلاقیە دێرینەکان یان دەبێ بە بەرهەمی ئەو یاسایەی دابنێین؟

## *تاوان دژی دەروونی مرۆڤ*
## *یان تاوانی زەمینی*

لێکبووردن هەمیشە بەشێکە لە کۆمەڵێك شتی دی کە ناتوانین لێی جیابکەینەوە. کاتێك زانا دینیەکانی سەدەی سیانزەو دادگا شەرعیەکانی ئەو سەردەمە ئەو پرسیارەیان هێنایە پێشێ، کە ئایا دەبێ مرۆڤ لەگەڵ بێ دیندا لێبووردوو بێ، کاتێك کە ئازادی دەربڕین وەك مافی مرۆڤ داوا دەکرا، کاتێك سەرنج لە تەکبیرە دەزگایەکان دەدرا لە پەیوەندی لێکبووردن بە بازرگانی و ئاڵوگۆڕی ئابوورییەوە، هەمیشە وشەی لێکبووردن یەك مانای نەدەبەخشی، بێگومان دەکرێ لێکبووردن بگەڕێنینەوە بۆ سەردەمە دێرینەکان: ئایا لە هەمانکاتەوە کە کۆمەڵگا دامەزرا، پێویست نەبوو کە بیروڕاو باوەڕ تیۆرەکان بەیەکەوە بگونجێن بۆئەوەی پەیوەندی کۆمەلایەتی لێك هەڵنەوەشێتەوە، بێئەوەی لە هەمانکاتدا پێویست بە دانانی ڕێسایەك بۆ لێکبووردن و سنورەکەی هەبێت؟ لەوێشەوە کە چوونیەکی و یەکباوەڕی بوونی نەبوو، بەڵکو بیروڕا هەمەجۆر بوو، ئایا لێکبووردن کێشەیەك

نەبوو کە دەبوو چارەسەر بکرێ؟ ئەگەرچی ڤۆلتێر ئەوەی دەسەلماند کە یۆنانییەکان و ڕۆمییەکان لێبوردوو بوون، بەلام دەبێ سەرنج لەوە بدەین کە ئەوان وێنایەکی دروستیان بۆ لێکبووردن نەبوو: لێکبوردن بیرێکی نوێیە کە لە حاڵ و هەوای مەزهەبی ئەورووپای سەردەمی ڕێنسانسدا، سەریهەڵدا.

بە کورتی دەڵێین کە مەسیحیەتی سەدەکانی ناوەڕاست، پاش قوستنەتین و بەهۆی باوەڕهێنانی ئیمپراتۆرەکانەوە، بوو بە دینی دەوڵەت، کەنیسە و دەوڵەت دوانەیەکیان پێکدەهێنا کە لەناو دەروونی کۆمەڵگایەکی تاکدا، جێگەیان هەبوو، ئەم کۆمەڵگایەش لە سەدەی نۆزدەی میلادییەوە بە کۆمەڵگای مەسیحی ناودەبراو ئەم دوو دەزگایەش (واتە کەنیسە و دەوڵەت) بەڕێوەبەرایەتی یەک سەرزەمینیان لە ئەستۆ بوو. هەرچەندە لە سەرەتای سەدەی سیانزەدا هێواش هێواش نەتەوەکان بە خەبەر دێن و حکومەتی سەربەخۆ لە سنووری دەسەلاتدارێتی پاپا، بونیاد دەنێن، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا یەکێتی مەزهەب بناغەی دەوڵەت و وڵات پێکدەهێنێ، بەلام لەگەڵ ڕیفۆرمەکانی لوسەری و کالڤیند، سەرجەم مەسیحیەتی ڕۆمی تووشی سەرلێشێوانێکی بێوێنە دەبێ: بۆ یەکەمجار بێدینی (یان ئێرتیداد) دروستدەبێ کە بەردەوام و سەقامگیر دەبێ و کۆی سەرزەمینەکان دەگرێتەوە (ئاماژەیە بۆ ئەو وڵاتانەی کە یەکپارچە بوون بە لایەنگری ڕیفۆرم و بوون بە پرۆتستانتی. و). ئاشکراشە کە بەر لەوەش ئێرتداد دروست ببوو {گروپەکان یان جیابوونەوەکانی وەک ئاریانیزم، دوناتیزم، ئالبیژوایی} کە بە توندی سەرکوت دەکرا {و پاشتر بەهۆی تەفتیشی بیروڕاکانەوە "ئەنگیزسیۆن" سەرکوت کرا) و جیابوونەوەی کەنیسەی ئۆرسەزکس، مەسیحیەتی بە شێوەیەکی بڕاوە کرد بە دوو بەشەوە، لە سەدەی شانزەدا زۆرێک لە کەنیسە، لوسەری، زوینگلینی، کالڤینی و ئینگلیکی، دەکەونە دژایەتی ئاشکرای کەنیسەی ڕۆم (کاسۆلیکی) و هەروەها ژمارەیەکی زۆر لە گرووپ و بزوتنەوە مەزهەبیەکان بە شەوق و هەوڵێکی زۆرەوە، بەشی خۆیان، هەڕەشە لە ڕیفۆرمی دینی دەکەن جیهانێک لە کەنیسەکان، گرووپەکان و بزوتنەوە دینی و عیرفانیەکان، هەوڵ بۆ بەدەستهێنانی مافی ژیان دەدەن. مەسەلەی تەفرەقەی مەزهەبی لە سەرتاسەری ئەورووپادا دێتە پێشەوە و بەدوای ئەمەشدا مەسەلەی لێکبووردن دێتە پێشەوە.

هەمەجۆری مەزهەبی چیدی لە دەرەوەی جیهانی مەسیحیەت نیەو تەنها پەیوەندی بە نامەسیحیەکانەوە نیە، بەلکو لەناو کۆمەڵگای مەسیحی ڕۆژئاوادا ڕوودەدات. ئەمە پیشاندەری دوو هەلومەرجی جیاوازە: لە کاتێکدا کە بێباوەڕی {بە مەسیحیەت}، کە بە بڕوای کاسۆلیکەکان مەسەلەیەکە لە دەرەوەی باوەڕی ئەوان هاوسەنگی مەسیحیەت تێکنادات، ئێرتداد لە چاوی ئەواندا فەسادە لە مەسیحیەتدا و بناغەکانی دەلەرزێنێ. لە کۆمەڵگایەکدا کە بناغەی فەرەنسا دەلالەت لەمە دەکات: "یەک باوەڕ یەک یاسا، یەک شا" و بە باشی ئەوە دەردەخات کە یەکێتی باوەڕ بناغەی یاسا و یەکێتی دەسەلاتی سەڵتەنەتە، هەر جیابوونەوەیەکی مەزهەبی، وەک تەفرەقەیەکی زەمینی دەناسرێ و بە یاخیبوون دادەنرێ: بێدینەکان تاوانبارن و بە مەترسیەک دادەنرێن هەم بۆ کەنیسەکان و هەم بۆ کۆمەڵگای مەدەنی.

مەسەلەی جیاوازی مەزهەبی، دوولایەنی هەیە: لەلایەکەوە ئێرتداد کە تۆمەتی دوولایەنەی کاسۆلیک و پرۆتستانتەکانە دژی یەکدی، پرۆتستانتەکان کاسۆلیکەکان بە شێواندنی کەنیسەی سەرەتای مەسیحیەت و ناوەرۆکی کتێبی پیرۆز تاوانباردەکەن، تاوانێکە دژی کەنیسەکان و هەروەها دژی

سیاسەتمەداران. تەوەرەی سەرەکی پاساگانی تاوانی زەمینیی و مەزهەبی، بناغەیەکی حقوقیی -سیاسی تەواو دروستدەکات. لەلاکەی دییەوە بەپێی ئیستدلالیکی مەزهەبی، یەکێتی باوەڕ مەرجی ئازادی دەروونیی مرۆڤەکانە، تەنها ئازادبوونی تاك لە ئارادا نییە، بەلکو ئازادی سەرجەم کۆمەلگا لە ئارادایە. کەوابوو لە پێناوی بەرژەوەندی ئازادی هەموانە کە دەبێ تەماشای مەترسی شێمانەیی ئیرتداد بکرێ. بڕوا وایە کە دەبێ مورتەدەکان سزای دنیایی بدرێن، بۆئەوەی لەوکاتەدا کە دەروونیان ئازاد دەبێت، ئەرکی چاکەکاریش بووبێ بە عەمەلی، (چاکەکارییەك) کە پارمەتیدانی ئازادی ئەوانی دی بە ئامانجی زامنکردنی ئازادی خود، دەیسەپێنێ. هەروەها بەمشێوەیە ئەرکی کۆمەلایەتی پەیوەست بە بەرژەوەندی دنیایی تاکەکانی کۆمەلگاشەوە، ئەنجامدەدرێ. لەم حالەتەدا بەکارهێنانی مافە زەمینییەکان بۆ سزادانی تاوانە مەعنەوییەکان و سوودوەرگرتن لە دەسەلاتی میرەکان لەم پێناوەدا، پێویست و ڕەوا دێتە پێشچاو.

ئەوە بەبیر دەهێنینەوە کە پرۆتستانتەکانیش بەمشێوەیە بیریاندەکردەوە: لوسەر سەرەتا لایەنگری ئازادی مەزهەب و دژی بەرپابوونی کەنیسەی دەولەتی بوو، بەلام دوایی ئەلمانیا دابەشبوو بۆ کۆمەلێ شازادەنشینی کاسۆلیکی و پرۆتستانتی بەپێی ڕێسای "Cujus regio ejus religia" (لە هەر دەولەت یان شازادەنشینێکدا تەنها یەك مەزهەب دەتوانێ بوونی هەبێ، مەزهەبی میر). سیاسەتی وتوێژ کە زۆرتر لەلایەن بزوتنەوەی هیومانیزمەوە دەبرێتەوە پێشێ، ناتوانێ کەنیسە جیاوازەکان ئاشتبکاتەوە. لە فەرەنسادا حالەتی ئاشتبوونەوە کە بەهۆی فەرمانی نانتەوە (1598) بەرپادەبێت، کاریگەرییەکی پوو لە کەمبوونەوەی هەیە و ناتوانێ ڕێگە لە سیاسەتە تازەکانی ئازارو ئەشکەنجەدانی مورتەدەکان، بە بەکارهێنانی زۆرو ناچارکردن بە باوەڕهێنان، دوورخستنەوەو ناچارکردن بە پێشوازی لەشکرەکان، بگرێ، بەمشێوەیە پاش ریفۆرمی دینی، بۆ یەکەمجار دوابەدوای جیاوازییە چارەسەرنەکراوەکانی نێوان کاسۆلیك و پرۆتستانتەکان، مەسەلەی لێکبووردن لە مانای ڕاستەقینەی خۆیدا بەشێوەیەکی توندوتیژ ڕادەگەیەنرێ: نە سیاسەتی وتوێژ (کە لە بنەڕەتدا لە سالەکانی 1530و 1555 پەرەیسەند) بە مەبەستی لایەنیکەمی گونجانی تیوری، ڕێکەوتنێکی شەرعی نێوان لایەنەکان مسۆگەر دەکات، نە ئازارو ئەشکەنجەو بەکارهێنانی کرداری توند (بە شوێنێك دەگات).

لە بەرامبەر لێکنەبوردنی مەزهەبیدا کە دەلێ هەرکەس هەندێك لە حوکمە شەرعیەکان قبولنەکات، بە زەروری مەلعون و دەرکراوە ("لە دەرەوەی کەنیسە ئازادی نیە")، لێکنەبوردنی زەمینیە کە ئەگەری پێکەوەژیانی لایەنگرانی مەزهەبە جۆراوجۆرەکان لەیەك ولاتدا قبولناکات، بەلام هەروەها لێکنەبوردن وەك کارێکی خێرخوازانە دەردەکەوێت، تا ماوەیەکی زۆر لە یادی شەوی سن بارتلمیدا، مەراسمێك بەرپادەکرێت. بە هەلە وەرنەگیرێت، لە سەدەی شەشدا لایەنگرانی لێکبووردن نە لایەنگری دەولەتی زەمینین و نە نەیاری کەنیسە. هێشتا زۆرمان ماوە بۆئەوەی بە ڕۆشنگەری بگەین. وتوێژەکان لە نێوان مەسیحیەکاندایە، ئەگەرچی چیدی یەکگرتوو نین. لێکبووردن سەرەتا مەسەلەیەکی مەزهەبییە، کە موفەسیرەکانی کتێبی پیرۆز ڕۆلی سەرەکی تیا دەبینن. ماوەیەکی زۆر تێدەپەڕێ تا ئەم مەسەلەیە لە سنووری مەزهەب تێپەردەکات و هاوهەنگاو دەبێ لەگەل بزوتنەوەی زەمینیکردنی (عەلمانیکردنی) دەولەتدا.

راستیدا جۆرێك بەرگەگرتنە لە بەرامبەر هەڵەی گوناهكارانەداو تەنهاش تا ئەوكاتە بەردەوامدەبێت كە ئەو هەڵەیە لەناو نەچووبێ، لێكبوردن ملدانە بۆ كەمترین خراپە. ئەم مانا سەرەتاییەی لێكبوردن ناتوانین لەبەرچاو نەگرین. رابوسن ئەتین چەند سەدە پاشتر لە بەرامبەر ئەنجومەنی نەتەوەیی (فەرەنسادا) وشەی پڕ ئاڵۆزی لێكبوردنی مەحكوم كردو داوای سڕینەوەی لە راگەیاندنی مافەكانی مرۆڤدا كرد: وشەیەك كە "هاوڵاتیان وەك گوناهكاران، كە دەبەخشرێن، بە شایستەی بەزەیی دەزانێ" (وتار لە ئەنجومەنی نەتەوەییدا، 22ی ئوتی 1789) مۆری ئەم خەسڵەتە بە لێكبوردنەوە مایەوە كە بەخشینی ئیمتیازێكە بە هەڵەكەرانو نەك هەر بەرگری نیە لە مافی یەكسانی هاوڵاتیان، بەڵكو موداراكردنی ئەوی دیبەو لێرەوە هەر ساتێك دەتوانی فەرامۆشبكرێ، بەڵام چەمكی راستی بەناچار ئەوە ناهێنێتە پێشێ كە هەر دورکەوتنەوە یان گۆڕینێكی پێویستی بە سزادانی دنیایی بێت، دەكرێ چاو لە سزادان بپۆشرێو بەرگری لە مافی فرەیی مەزهەبەكان بكرێ، لە هەمانكاتدا پابەند بین بە یەك بنەمای بابەتیو گشتگیرەوە لە بواری هەقیقەتدا. هیومانیستەكانی سەردەمی رێنسانس بەمشێوەیە هەوڵدەدەن تا یەكێتی بنەمای باوەڕ، سەرلەنوێ دروستبكەنەوەو لە هەمانكاتدا بیگونجێنن لەگەڵ ئاشتیو لێكتێگەیشتنی زەمینی لە كۆمەڵگادا. ئەوان لەسەر بنەمای پەیمانی گرووپە مەسیحیەكان لە چارەسەری لێكتێگەیشتنی جیاوازیەكاندا، زۆرتر پشت بە پەروەردەكردنی مورتەدەكان دەبەستن تا سەركوتكردنیانو جەخت لە كۆكردنەوەی حوكمە مەزهەبیەكان لە بنەما عەمەلیەكانەوەو باوەڕی سادەو زیندوو و دوور لە وردبینیەكانی زانایانی مەزهەبی، دەكەن. مارسیل فیسینو پیك دولامیراندول دەچنە پاڵ قوتابخانەی هیومانیستەكان كە ئامانجیان سەقامگیركردنی ئاشتیو گونجانی مەزهەبیو مرۆییو وتووێژی ئازادە. تەنانەت دەكرێ وەك نیكولا دۆكز رێكەوتنی ژمارەیەكی كەمی حەكیمەكانی دینە جیاوازەكان بۆ رێكخستنی كۆمەڵێ بنەمای گشتیو هاویەش لەبەرچاو بگرین كە لەم حاڵەتەدا رێكەوتنی بیرورای گشتی، دەبێتە هۆی ئاشتیو رێكەوتن لە نێوان پەیڕەوانی یەك دینی قبوڵكراوی خودادا.

كەوابوو جیاوازی مەزهەبەكان خۆی لە خۆیدا خراپ نیە: ئەم جیاوازیە لە كتێبی یۆتۆپیاشدا هەم سروشتیو هەم خواستی خودایە. بەڵام بەڵگاندنی (ئیستدلال) توماس مۆر بە قازانجی ئازادی مەزهەبی، سەرەتا بەڵگاندنێكی سیاسیە، ئۆتۆپۆس (حاكمی یۆتۆپیا) لەبەرئەوە ئازادی مەزهەبی بۆ رەعیتەكان بەڕەوا دادەنێ، چونكە دەزانێ تەفرەقەی مەزهەبی وڵات بێتوانا دەكات. لێكبوردن لە خزمەتی هاوئاهەنگی نەتەوەییدایە، ئەگەر لە یۆتۆپیادا هەم باوەڕداری تازەو هەم مولحدی بێ خودا، هەردووكیان مەحكومن، لەبەرئەوەیە كە بە پێی حەماسەتی مەزهەبی یەكەمیان قابیلی لێبوردن نیەو بێباوەڕی دووەمیشیان دەیكات بە مرۆڤێكی نائەخلاقیو لە ئەنجامدا دەیكا بە بوونەوەرێكی ناكۆمەڵایەتی. لە كتێبی یۆتۆپیادا بەرگری لە دەوڵەتی زەمینی یان نادینی ناكرێ، بەڵام ئەم كتێبە هۆگەلێك دەهێنێتەوە بە قازانجی ئەو "سیاسەتانەی" خوازیاری گرنگتربوونی بەرژەوندیەكانی كۆمەڵە، لە یەكێتی مەزهەبیو جۆرێك ئازادی بیرو‌راو مەزهەب (گەرچی بە شێوەیەكی كاتی) پێشنیاردەكات كە كاسۆلیكەكانو ریفۆرمیستە دینیەكانو بە گشتی هەموو ئازادیخوازێك دەگرێتەوە. مێشێل دۆلۆپیتاڵ بەرژەوەندیە نەتەوەییەكان كە دەبێ تەنها سەرقاڵیی دەوڵەت بێت، لە مەسەلەی هەقیقەتی مەزهەب جیا دەكاتەوە، ژان بۆدۆنو بزوتنەوەی فكری ئەراستینی

جیاکاری لە نێوان مەزهەبو دەوڵەتدا، بە قازانجی دوەمیان دەکاتو دەسەلاتی حوکمڕانی سیاسی بە شێوەیەکی جێی سەرنج، پەرەپێدەدا.

پێشتریش مارسێل دۆپادۆ لە کتێبی *لایەنگری ئاشتی* (1324ی میلادی)دا، میری بە پێشەوای مەزهەبی وڵات دەناسیو بڕوای وابوو کە ئەو دەبێ هەموو حوکمە یاساییەکان دابنێ. بەکورتی لێبوردن لەبارەی مورتەدەکانەوە بە تەواوی بەستراوە بە هەڵبژاردنی میرەکانو بەرژەوەندییە تایبەتیەکانی دەوڵەتەوە.

قوتابخانەی هیومانیست هەمیشە جیاوازی گروپە دینیەکان بە شتێکی خراپ دەزانێ، خراپیەك کە دەبێ لێبوردوو بین بەرامبەری، تا ئەوکاتەی کە ڕێکەوتنی مەزهەبی، کۆتایی پێدێنێ. لێکبوردن مەسەلەیەکی کاتییە، تەنانەت ئەگەر لەگەڵ ئەو ڕەخنەی هەقیقەتەدا بێتەوە کە زانایانی مەزهەبی کاسۆلیك دەیگرن. یەکەم بابەت کە دێتە پێشەوە یەکێتی گروپە جیاوازەکانی مەزهەبی کاسۆلیکیەو پاش ڕێکەوتنی سەرجەم کاسۆلیکەکان، یەکێتی لەگەڵ مەزهەبەکانی تردا دێتە پێشێ، کە دەبێتە هۆی کۆبوونەوەی مەزهەبە جیاوازەکان لە دینێکی پێکهاتەیی (تەرکیبی)دا، دیارە لەژێر پەرچەمی باوەڕی مەسیحیدا، لە یۆتۆپیادا جیاوازی مەزهەبەکان زیان لە یەکپارچەیی مەسیحیەت نادات، چونکە یۆتۆپیا دەوڵەتێکی نادینیەو تۆماس مۆر بە سەرنجدان لە ئیرادەی خوداوەند کە مەزهەبە جیاوازەکان بەرەو یەکێتی بیروڕا دەبات، دەچێتە پاڵ بیری هیومانیستەکان کە خوازیاری ئاشتی مەزهەبین لەگەڵ سەرکەوتنی مەسیحیەتدا، ئەم ڕێکەوتنە، جیاوازییەکان لەناو دەباتو هەڵەی مورتەدەکان چاکدەکاتەوە، بەمشێوەیە زۆرتر بەرگری لە لێتێگەیشتن دەکرێ تا لێکبوردن.

## *نەریت، ئاشکراکەری هەقیقەت یان بەرهەمی دەسەڵات*

بەلام دەکرێ تەعبیری هەقیقەت، وەك پێگەی هێزو دەسەلاتی سیاسی بە وەلامدانەوەی شێوەیەکی تری بیرکردنەوە وەك تاوانێك بزانێ. بۆسۆئەش وەك باسکال بڕوای وایە هەقیقەت نەگۆڕە: بەردەوامیو ئەمری کەنیسە، پێوەری هەقیقەتو زامنی گشتگیری حوکمەکانی کەنیسەی ڕۆم (کاسۆلیك)ە. ئەم دەزگایە پارێزەری هەقیقەتە لە بەرامبەر هەر گۆڕانکاریەکداو بە زنجیرە پلەیی هەمیشەیی خۆی خوازیاری فەرمانبەرداری پەیڕەوەکانێتی. هەر گۆڕانێك لە حوکمەکاندا، ئاشکراکەری هەڵەیە، کەوابوو ڕیفۆرمیستە مەزهەبیەکان، کە تاوانبارن بە ئیرتداد، دەیانەوێت هەقیقەت وەك جێگەیەك بۆ دەسەلاتو هێز تەفسیرکەن، لە دەزگای فکری ئەواندا لە ڕاستیدا کەنیسە پێگەی دەسەلاتە: ئەوان دەڵێن کەنیسە بەرگری لە هەقیقەتێك دەکا کە هەقیقەتی دینو باوەڕ نیە، بەڵکو هەقیقەتی مەزهەبی حاکمە.

هانری باسناژ دۆبۆڤاڵ بەمشێوەیە دیکتاتۆریەتی قەشەکان مەحکومدەکات، ئەو قەشانەی کە خەڵکی دژی شازادەکان هاندەدەنو ناچاریاندەکەن بە سەرپێچیکردن بە یاساکانی پاشاو خۆیان دەبن بە ئەربابی مەسەلە دنیاییەکان. ئەمانە نەزانی هاندەدەنو خورافات بلاودەکەنەوە، بۆئەوەی تێنوێتی دەسەلاتدارێتی خۆیان باشتر تێرکەن: فەسادی ئەخلاقی قەشەکان لە نێوان ئەو حوکمانەدا کە بەرگری لێدەکەنو واقعیەتی ڕەفتاریان، جیابوونەوەیەکی گوناهکارانە دروستدەکات. لێرەدا لە یەکێتی سیاسی لەسەر بناغەی یەکێتی بیروڕا، دوور دەکەوینەوە: مەزهەب ڕەنگە هۆکارێکی یاخیبوونو داڕمانی دەزگا زەمینیەکان بێت، ئەم ڕەخنەیە تازە نیە. سپینۆزاش بە تامەزۆرییەوە

ئاماژەی بۆ کێشە کۆرچە دەکات کە بڕوای وایە: "هیچ ئامێرێك هێندەی خورافات کاریگەر نیە بۆ حکومەتکردن"، بەڵام ڕەسانەیەتی سپینۆزا زۆرتر لەوەدا نیە کە زانایانی دینی لەبەر دەسەڵاتیان بەسەر خەڵکیدا مەحکومدەکات، بەڵکو لەوەدایە کە بناغەی ئەم دەسەڵاتە دەگەڕێنێتەوە بۆ پێکهاتەی سۆزداری مرۆڤ. پێکهاتەیەك کە بە قازانجی زانایانی دینی، ڕەگی لەناو خودی مرۆڤدایە. مرۆڤەکان بەپێی ماهیەتیان خورافین، خورافە دەرئەنجامی ئەو ئامادەییە سۆزدارییەیە کە لە وەهمی دەسەڵاتداریێتی ئیرادەی کەس بەسەر خۆیەوە دروستدەبێ‌و مرۆڤەکان بەهۆیەوە هەر مەسەلەیەکی نائەقڵانی (بێئاگایی لە هۆکارە سروشتیەکان، "ڕەمزەکانی کتێبی پیرۆز") بە شێوەیەکی سەروو ئەقڵانی (سیستەمی سروشت لەسەر بناغەی ڕێکخستنێکی ئامانجدار، ئیلهامە سەروو ئەقڵانیەکانی کتێبی پیرۆز) تەفسیردەکەن. لەبەرئەوەی بڕوایان وایە قەدەر کاریگەرترە لە هێزی خودی خۆیان، لەبەرئەوە لە نێوان ترس‌و ئومێددا دێن‌و دەچن‌و پەنا بۆ دەسەڵاتێك دەبەن کە بە بڕوایان بەهێزترە. کەوابوو ناسینی هەقیقەت بەر لەهەر شتێك بەستراوەتەوە بە ڕزگاربوون لە پێشداوەریەکانی زانایانی دینی، بەڵام پێویستی بە ڕزگاربوون لە سۆزە خەمناکەکانیش هەیە، تەنها لە وڵاتێکی ئازاددا کە ئەگەری بەرخوردی ئازادانەی بیروڕاکان هەبێ، ڕزگابوونێکی گشتی وا قابیلی وێناکردنە.

لێکبوردن بەرلەوەی دەرئەنجامی فێرکردنی خەڵکی بێت، بەستراوە بە ئامادەیی دەزگاکان بۆ قبولکردن یان نەکردنی ئازادی بیروڕا. بەڵام سپینۆزا تەفسیرە نادروستەکانی زانایانی دینی بۆ کتێبی پیرۆز گێڕانەوەی ڕەمزو دۆگماتیەکان بۆ ئەو کتێبە کە بە تەواوی بێ بەرین لێی دەگێڕێتەوە، ناساندنی بدعەتەکانی خۆیان وەك قسەکانی خوداش مەحکوم دەکات، دانانی دۆگمە فەلسەفیەکان بە بەشێك لە کتێبی پیرۆزو خودا، وەك ئەوە وایە بە پێوەری ڕاستیان بزانین: هەروەها ئەم کارە سەندنەوەی ئازادی فەلسەفاندن‌و سنورداركردنی ئازادیە کۆمەڵایەتیەکانە.

## لێکبوردن‌و هەقیقەتی کتێبی پیرۆز

ئەم هەقیقەتەی کتێبی پیرۆز ئاشکرای دەکات، خۆی دەبێتە بابەتی وتووێژێك لەبارەی لێکبوردنەوە، ئیساك لاپیرەر، ئوربیل داکۆستا، یان هۆبز بەر لە سپینۆزا تاوتوێی ڕەخنەگرانەی ئینجیلیان کرد، میتۆدی مێژووی تەفسیرەکەی سپینۆزا لەبارەی کتێبی پیرۆزەوە پیشانیدەدات کە ئەم کتێبە هیچ حوکمێکی تیۆری براوەی لە خۆیدا هەڵنەگرتوە، بەڵکو تەنها ناوەڕۆکی بریتیە لە تێزە ئەخلاقیە هەمەکیەکان‌و دەستوری کردارکردن بەپێی دادپەروەری‌و چاکەخوازی. (وتاری مەزهەبی-سیاسی، تەماشای دەقی ژمارە 9 بکەن). ڕێسای تەفسیرکردنی کتێب بەهۆی خودی کتێبەوەو گەڕان بەدوای مانا نەك هەقیقەتەکەیدا، ئەگەری ئەوە دەکاتەوە کە پاسای قابیلی وتوێژنەکردنی کتێبی پیرۆز لە ڕێگەی سەلماندنی بونیادە مێژوویەکەی، بسڕینەوە، ئەوکات ئیدی ئەرکی فێرکردنی هەقیقەت، دەبێتە ئەرکی تاك‌و تەنیای ئەقڵ. سپینۆزا بەم شێوەیە بە سڕینەوەی ئەو دۆگمایەتەی کە زانایانی دینی داویانەتە پاڵ کتێبی پیرۆز، نەك تەنها مەزهەب ڕزگاردەکات، بەڵکو فەلسەفەش ئازاد دەکات، چونکە ئەوە دەردەخات کە هیچ شتێك لە کتێبی پیرۆزدا نیە کە ناکۆك بێت لەگەڵ ئازادی بیروڕادا.

"پیرێ بیل"یش دەیەوێت دەست بە "تەفسیرێکی تازە" بکات‌و پشت بە "هەمەکیترینی ئەو بنەمایانە دەبەستێ کە لێکۆڵینەوە زمانیەکان، ڕەخنەکان‌و بیروڕای باو، دەتوانن بیخەنە بەردەستی

مرۆڤ". بەمشێوەیە "هەر مانایەکی زمانی کە هەلگری ناچارکردن بێت بە ئەنجامدانی تاوانێك، هەڵەیە". بیل بە توندی هێرشدەکاتە سەر ئەو تەفسیرەی ئەگوستین کە بە پشتبەستن بە وێنای میواندارێتی مەسیح (ئینجیلی لۆقا، چواردەهەم،23) ڕەوایەتی بە بەکارهێنانی زۆر دەدا لە بەرامبەر مورتەدەکاندا، کۆی ئەو نەریتە مەزهەبیە بە پووچ دادەنێ کە بە پشتبەستن بە وێنای دانەو تاڵکە (ئینجیلی مەتی، سیانزەهەم. 24–23) {و ئەمە خوازەیەکە بۆ جیاکردنەوەی باشەکان لە خراپەکان‌و} فەرمان بە سزادانی مورتەدەکان دەدەن. سن تۆماس، سن ئەگوستین‌و تەنانەت لۆسەریش دەیانەوێت تاڵکە بژار بکەن، واتە مورتەدەکان – ئەگەر بکرێ لەگەڵ باوەڕداراندا جیابکرێنەوە – لە کۆمەڵگای مەدەنی دەربکەن‌و لە چاوەڕوانی هەڵسەنگاندنی ڕۆژی جەزادا، لێیان نەبوون {بەو شێوەیەی کە بۆ نمونە ئەراسم یا گرۆتیس تەفسیری دەکەن}. فەرمانبەرانی باوەڕپێهێنانی خەڵکی، بە پشتبەستن بە مانای ڕووکەشی ئەم وێنایە، تاوانەکانی خۆیان ئاراستەدەکەن. بیل سەرنجیان بۆ مانای کارەکەی خۆیان، بە مانای ڕووکەشی سەرکوتکردنەکان، ڕادەکێشێ. ناچارکردن بە نیشتەجێبوون‌و پێشوازیکردن لە لەشکرەکان، دەستبەسەراگرتنی داراییەکان، تاشینی مووی سەرو سڕینەوەی مەرجەعە یاساییەکان، دوورخستنەوە، ئیعترافەکان‌و باوەڕپێهێنانی بە زۆر، تاوانگەلێکن تەنانەت دژی دین‌و بەر لە فاسدکردنی مورتەدەکان لە ڕێ‌و ڕەسمی کەنیسەدا، زیان بە دین دەگەیەنێت، ئیلهامەکان دەبێ لەگەڵ ڕووناکی سروشتدا بگونجێن چونکە ئەم ڕوناکیە خوداییەو لێرەوە پێوەرێکە کە مانای ڕووکەشی کتێبی پیرۆز دەبێت لە گەڵیدا بگونجێت. بیل نکوڵی لە دۆگمەکان‌و بایەخیان دەکات‌و بەلگاندنی باوەڕداران ڕەد دەکاتەوەو ئەخلاقیبوونی کردار، بە پێوەری ڕەوایەتی دەزانێ، بەلام "جۆری تازەی تەفسیر" بە تەنیا وەلامێکە بۆ دیدی کەنیسەی بالادەست. بیل شێوەیەکی فەلسەفی تایبەت پێشکەشدەکات کە تیایدا شێوەیەکی تری بیرکردنەوە جێگەی سیستماتیکی فکر دەگرێتەوە. ئەو بە ئاماژەکردن بۆ دەزگا کاسۆلیکیەکان لەو ولاتانەدا کەلە کەمایەتیدان، تێڕوانینەکان بۆ گۆڕان بانگدەکات. دەزگای کاسۆلیکی تەنها لە جێگەیەکدا بەناوی هەقیقەتەوە بەرگری لە سەرکوتکردن دەکات، کە خۆی فەرمانڕەوا بێت. لۆك دەگەڕێتەوە بۆ دیدی دەسەلات‌و ئەو هەقیقەتەی بەرگری لێدەکات‌و ئەوە دەسەلمێنێ کە "هەر کەنیسەیەك بە بڕوای خۆی، مەسیحیەتی پەتییەو بە بڕوای ئەوانی دیش هەڵەو ئیرتدادە، هەمووکەسێك بڕوای وایە ئەوەی خۆی بڕوای پێیەتی هەقیقەتەو هەرچیەکیش کە جیاوازە لەو، وەك هەڵە مەحکومدەکات" تۆمەتی ئیرتداد هەمیشە دوولایەنیەو لەو ڕەوشەوە کە ناکرێ بەشێوەیەکی کامڵ‌و تەواو، مەسیحیەتی پەتی دەستنیشانبکرێت، کەوابوو گەر مافی سەرکوتکردن بە کەنیسەیەك بدرێت، ئەوا ناچارین هەمان ماف بە کەنیسەکانی دیش بدەین.

جیاوازی بەلگاندنەکەی لۆك لەگەڵ بیلدا لەوەدایە کە بناغەکەی نەسیبی نەزانی‌و لە هەمانکاتدا ڕەخنەگرتنە لە خۆڕسکی هوشیاری. ئێمە هیچ بیرێکی خۆڕسکمان نیە کە ببێتە هۆی هاودەنگی هەموان لە ناسینی زاتی خوداوەنداو کتێبی پیرۆزیش حوکمگەلێکی تیۆری کەم فێردەکەن‌و لێرەوە سەلماندنی ئەو مەسەلانەی پەیوەندیان بە باوەڕەوە هەیە مومکین نیە. بەلگەکاندنی لۆك بۆ نایەقینبوونی مەزهەبەکان لە شوێنێکی دیدا وێنای سێ موستیلە {بۆ سێ مەزهەبە یەکتاپەرستیەکە} بەبیر دەهێنێتەوە کە لیسنگ ڕوونیکردۆتەوە: تەنانەت گەر قبوڵیبکەین کە یەکێك لە مەزهەبە یەکتاپەرستیەکان

راستە، مومکین نیــە کــە بەدڵنیاییــەوە دەستنیشانی بکەین کە ئەو یەکە کامەیــە. کــەوابوو تەنها پێــوەری هەقیقــەت لێکبووردنــی پــەیڕەوانی ئــەو مەزهەبەیــە. ڤۆڵتــێر هــەر ئــەم بەڵگاندنــە بەشــێوەیەکی دی دەهێنێتــەوەو لــە وتــاری "لێکبــووردن" لــە ئینسکلۆپیدیادا (1764) ئەوە دەسەلمێنێ کە "ئێمــە هــەموومان ســەرتاپا بێتوانــاو هەڵــەین" و داوامــان لێدەکات کە "بێ ئەقڵیــەکانی" یــەکدی بەشێوەیەکی دوولایەنە ببەخشین. لێکبــووردن لــێرەدا بەرلــەوەی لەسەر بنەمای کۆمەڵێ ئەرک بێت کە ویژدانی مــرۆڤ وەك ئــەخلاقی سروشــتی دەیسەپێنێ، پــاڵیداوە بــە بەهرەی نەزانی مرۆڤەوە کە دەبێتــە هــۆی پێویستی ناســینی مــافی بیرکردنــەوە بەشــێوەیەکی دی، لێکبــووردن، بــەهای ئــازادی دەباتــە ســەروو هەقیقــەتو بــەهای ئــەخلاقی عەمــەلیش دەباتــە سەروو دۆگماییاتەوە.

هــەروەها دەکرێ وەك لایبنیــتز هونــەری دیــالۆگ ڕێکبخرێ یان لە دیدی ستاتیکیەوە تەماشابکرێ، بیل هەمــەڕەنگی هەقیقــەت بەشــێوەیەکی ســۆزدارانە دەردەبڕێ: جوانــی هــاودەنگی دەنگــە جیاوازەکــان هیچی لــە جوانــی تــاك خوێنــدن کــەمتر نیــە، بــەڵام ئەگەرچی ئــەو قسە لــەم جیاوازیو هەمەڕەنگیــە لــە وڵاتــدا دەکــات، بــەڵام بــەڵگاندنی پــەیوەندیدار بــە ناهوشیاریشەوە لای ئەو دەدۆزینــەوە. لــەو شوێنەدا کە باسکال ئەم بەڵگاندنەی بۆ ئەرکی فەرمانبــەرداری مــرۆڤ دەبینــی، خــودای نادیــاری باســناژ دۆیڤــاڵ ڕەوایەتی بۆ وتوێژی گشتی دەهێنایەوە: ئاڵۆزیەکانی کتێبی پیرۆز بەخواستی خودایە، بــە قــازانجی فرەیی حوکمــەکانو مەزهەبــەکانو هــەروەها بــە قــازانجی بەرخوردی ئازادانەیانە. لەمڕووەوە دەتوانین بڵێین کــە هــــەر وتوێژێــــك، بەرهەمهێنــــە: ئیرتیدادەکــــان "ئەنگێزەیەکی سوودمەندن" کە هۆکانی هــەوڵدان بــۆ بەڵگاندن، بۆ لێکۆڵینەوەی قووڵــترو تەفسیری کتێبی پــیرۆز، فەراهەمدەکــەن. ڕووبەڕووبونــەوەی دۆگمــە مەزهەبیــە جیاوازەکــان، دەبێتــە هــۆی ململانێــی پــەیڕەوانی مەزهەبــەکان لەگــەڵ یــەکدیدا. بــەکورتی "وتوێژی زانایان کــە قــازانج زۆری بــۆ خــەڵکی هەیــەو زۆر سوودمەندە" دەبێتە هۆی پێشکەوتنی هەقیقــەت لــە بەرامبــەر خورافــاتداو ئــەخلاقی پــەیڕەوانیش بڵنددەکاتەوە. هــەر ئــەم بەڵگاندنــەش لای هلوتیس‌و جان ستیوارت میل، ڕەنگدەداتەوە. بە کورتی چیدی بیرکردنەوە بە شێوەیەکی دی مەحکوم بە لەناوچوون نیەو لــە کارێکی تاوانئــامێزەوە دەبــێ بــە کــارێکی ســــوودمەندو دەبــــێ بــــە مــــەرجی پێویســــت بــــۆ بەدەستهێنانی هەقیقەت.

بەمشــێوەیە زنجیرەیــەك بــەڵگاندن کــە دەوری قبوڵکردنــــی بــــیروڕا جیاوازەکــــانو ســــەلماندنی سوودمەندیانی، تەنانــەت بــۆ خــودی هەقیقــەت لــە ئەستۆ گرتــوە، دەبێتــە جێنشینی بــە تــاوان زانینــی ناهۆشیاریو بە کفر زانینی بیرکردنەوە بە شێوەیکی دی. مەبەســت لــەو بەڵگاندنانــەی بــۆ ســــەلماندنی لێکبــووردن دەهێنرێتــەوە کــە چیــدی بــە مانــای موداراکردنــی هەڵــەی گوناهکارانــە نیــە، بــەڵکو مــافی هەمــەڕەنگی بــیروڕا مەزهەبیەکانــە، ئازادبوونــە لــە وتەزاکانی مەزهــەبی پــەتیو ئــیرتداد. هەنوکــە دەبــێ تۆمــەتی ئــیرتداد بــۆ ئــەو کەسانە بگەڕێنینــەوە کــە ئــەوانی دی ســــەرکوتدەکەن، نــــەك ئەوانــــەی کــــە دۆگمــەکان دەگــۆڕن: چیدی جیــاوازی بــیروڕا تــاوان نیــە، بــەڵکو کردارێکــی جیــاوازە لــەو دەســتورە ئەخلاقیانــەی کــە بــە ڕوونــی لــە کتێبــی پــیرۆزدا دەربــڕاوە یــان ویژدانــی مــرۆڤ ئیلــهامیان لێــوە وەردەگرێ. کەوابوو ئەرسۆزکسی مانایەکی بنــەڕەتی ئەخلاقی پەیدادەکات کە ئەقڵی عەمەلی تیایدا ڕۆڵێکی کرنگتری تیا دەبینێ. پاشــان ئایــا کاســتلیۆنو لــۆكو بیــل ئــەوەیان نەســەلماندوە کــە ســنووری نێــوان ئیرتدادو ئەرسۆزۆکسی بــەپێی دیدی ئــەو کەســەی

دەستنیشانیدەکات، بە تەواوی ڕێژەییە؟ وێنای "مەزهەبی هەقیقی" بەمشێوەیە دەگۆڕێت بۆ قبولکردنی ڕێژەیی دین و باوەڕەکان. ئەزمونی ئازادیە مەزهەبی و بیروڕاکان، دەبێتە جێنشینی مەسەلەی هەقیقەتی دۆگمەکان.

## *لە باوەڕەوە بۆ نیەت باشی*

دەکرێ لێکبوردن لەسەر بناغەی مافی پارێزراوی ئازادی بیروڕاو باوەڕو هەروەها لەسەر بناغەی هەنگاوە بنەڕەتیەکان دابمەزرێنرێ. بیل و لۆك بەشێوەی جیاواز بەرگری لە لێکبوردن دەکەن: بیل لێکبوردنی زەمینی لە مافەکان یان لە ئازادی بیروڕاو باوەڕەوە بەدەست دەهێنێت. لۆك سەرەتا جیاوازی لە نێوان دەزگای دەوڵەتی و دەزگا کەنیسەیەکاندا دەکات، پاشان بواری ئازادی باوەڕو بیروڕای فەردی ڕووندەکاتەوە. لە نێوان ئەم دوو تێڕوانینەدا، چەند ڕێگەیەکی نێوەندی هەیە کە بەهۆیەوە لێکبوردن وەك شتێکی تەواو زەمینی دەناسرێ. سەرەتا دەبێ ویژدانی مرۆڤ بە مەرجەعێکی سەربەخۆ بناسرێ و ئازادی پێبدرێ. بابەتی ئازادی بیروڕاو باوەڕ، تەوەرەی گفتوگۆیە لەبارەی لێکبوردنەوە، کە لە سەردەمی بزوتنەوەی ڕیفۆرمی دینیدا، دەستپێکرد. لە ڕاستیدا مەزهەبی لوسەر بەرگری لە ئازادی مەزهەب دەکات کە پاشان ناوی ئازادی بیروڕاو باوەڕ (یان ئازادی ویژدان)ی وەرگرت: بناغەی تیۆرەکەی ئەو لەسەر ئەوە دامەزراوە کە لە ڕێگەی ویستی ویژدانەوە نەبێت، ناکرێ مل بۆ هیچ یاسایەك بدرێت و ئەگەر مرۆڤ ویژدانی نەیار بێت، مەحکوم نابێ بە فەرمانبەرداری لە دەزگا شەرعی و زەمینیەکان، لوسەر پاشان بوە لایەنگری کەنیسەی دەوڵەتی، کالڤین بڕوای بە سەربەخۆیی ویژدان هەبوو (کە دەبێ لە ئەقڵ بە جیایی بزانرێ کە بەهۆی کەوتنەخوارەوەی مرۆڤەوە، بەرەو فاسدبوون چوە)و لە هەمانکاتدا کتێبە پیرۆزەکانی، بە پێوەری کۆنکرێتی باوەڕ دەزانی، هەموان دەستیان بە کتێبە پیرۆزەکان کە زۆر سادەو مەفهومن دەگات، ئەم کتێبانەش دەبێ بۆ هەر ویژدانێك بە پێوەری هەقیقەت دابنرێ.

پاشان کاستلیۆن و بیل و باسناژ دۆبۆڤال بابەتی ئازادی بیروڕاو باوەڕ درێژە پێدەدەن، بەڵام تا ڕادەیەك دەستکاری دەکەن، ئەمان حوکمی ویژدان لە حوکمی کتێبی پیرۆز بە بەرزتر دادەنێن. کاستلیۆن خوازیاری ئەزمونکردنی بێ قەیدو شەرتی کتێبی پیرۆزە بەهۆی ئەقڵەوە: ئەقڵ بەو شێوەیەی کە کالڤین دەڵێت بەهۆی گوناهی سەرەتاییەوە بەتەواوی فاسد نەبوە، بەڵکو چرایەك ڕێنماکردنی هاوبەشە کە توانای ئەوە بە مرۆڤەکان دەدات کە لە کتێبی پیرۆزدا، تێزی پێویست و ڕوون بۆ ئازادی بدۆزنەوە. بیل، ئەقڵ بە پێوەری هەموان و ڕێسایەکی خۆڕسك دەزانێ بۆ جیاکردنەوەی ڕاست و هەڵەو چاکەو خراپە. ئەو هەروەها پشتیوانی لە مافەکانی ویژدانی تاکەکان لە بەرامبەر دەسەڵاتی کەنیسەی ڕۆم لە بەرامبەر ئەو مەرجەعیەتەی کە بۆ کتێبی پیرۆزیان داناوە، دەکات: حوکمەکانی کتێبی پیرۆز دەبێ بە ئەقڵدا تێپەڕێ بۆئەوەی بە ڕەوا بزانرێ، ئیلهاماتە سروشتیەکانی مرۆڤ کە لە شکڵی بەدیهیاتە ئەخلاقیەکاندا، ڕاستیە بنەڕەتیەکانمان دەخاتە بەردەست لەهەر مەرجەعێکی دی بڵندترە: ڕووناکیە خوداییەکانن کە دەروونی ئێمە ڕووناکدەکەنەوە، تەلقینکەلێکی نەوتراون کە خودا بەهۆیەوە یەکەم بنەماو ئەرکەکان فێری مرۆڤەکان دەکات. گشتیبوونی ئەرکی فەرمانبەرداری لە ویژدان، بناغەی مافە بەرامبەری ویژدانەکانەو ڕێگەدەدات کە هەرکەسێك ئەرکی فەرمانبەرداری لە حوکمی ویژدان لە بەرامبەر ئەوانی دیدا، قبوڵبکات. ناچارکردن لە دیندا چەند ناڕەوایە، هێندەش

ناکاریگەرە، بەڵام مافەکانی ویژدان بێ بناغە نیە، بەڵکو ویژدان ئەرکیشی لە ئەستۆیە: هەرکەس دەبێ پەیڕەوی لە ویژدانی خۆی بکات، چونکە ویژدان شتێکی خودابیە، بیل ئەگەری سەرکوتکردن و ئازارو ئەشکەنجەدان مەحکومدەکات و لێکبووردن لەسەر بناغەی کۆمەڵێ ماف دادەمەزرێنێ کە هەر ویژدانێك خاوەنێتی، لەبەرئەمەیە کە بڕوای وایە ویژدانەکان ئەرکێکیان لە ئەستۆیەو بایەخ و دەسەڵاتیان لە دەسەڵاتی خوداوەندەوە هەڵدەقوڵێ.

تێڕوانی بیل ئەو قازانجەی هەیە کە "مافەکانی ویژدانی گوناهکار"یش دەهێنێتە پێشێ، بەمشێوەیە لە بنەڕەتدا لەگەڵ هەموو بیرێکدا ناکۆکە کەهەڵە بە تاوان دەزانێت یان هۆی نەزانی وەك ئەنگێزەی ئیرتداد قبوڵنەکات. مافەکانی ویژدان کە بیل بەرگری لێدەکات، لە ڕاستیدا دەبێ بۆ هەموو ویژدانێك بێت لەوانەش ویژدانی تاونبار. مرۆڤەکان تەنها یەك پێوەری زیهنیان بۆ دەستنیشانکردنی هەقیقەت هەیە کە ویژدانیانەو ناچارن، ئەوەی کە ویژدانیان بە دروستی دەزانێ، قبوڵیبکەن، ئەو چەمکی ویژدانەی کە بیل و لۆك بە شێوەیەکی دی ڕونیدەکەنەوە، جۆرێك زیهنگەری مەزهەبیە: ئەرسۆزکسی (یان مەسیحیەتی پەتی) زۆرتر باوەڕو ڕاستگۆیی وەفاداریە تا دۆگماییەت. تەنها ئاماژەی هەستپێکراوی، هەستی دەروونی کەسە. مەسەلەی هەقیقەت، بوونی لە پلەی دوەمی گرنگیدا دێت، یان باشتر بڵێین زۆرتر پەیوەندی بەو کەسەوە هەیە کە قبوڵیدەکات. هەڵە لەو ڕوەوە کە پەیوەندی بە بیروڕای دەروونی مرۆڤەوە هەیە، ناتوانرێ بە تاوان بزانرێ، دەروونیبوونی باوەڕ، مافی ڕەها بۆ ویژدان دروستدەکات بۆئەوەی کە هەر بیروڕایەك کە بە ڕاستی دەزانێت، قبوڵیبکات. بێباکی کە تۆمەتی سەرەکی ئیرتداد بوو، چیدی بە بنەمای ئەگۆڕی بیروڕای تاکەکان، دانانرێ: ئەگەر تەنها خودایە کە دەتوانێ دڵی مرۆڤەکان بخوێنێتەوە، کەوابوو کەس ناتوانێ لە ڕاستی بیرکردنەوەی ئەوانی دی دڵنیا بێت، بەڵام دەبێ ئەمە بە گریمانە وەربگرێت، کەوابوو دەکرێ بۆ ویژدانە گوناهکارەکان و بە شێوەیەکی گشتی بۆ هەموو ویژدانەکان، چەند مافێك دابنرێ، چونکە سەلماندنی ڕەهای بوونی هەقیقەتی دیار، بۆ ئێمە مومکین نیە. ئەو ویژدانەی لەوپەڕی نیەت باشیدا هەڵەدەکات، دەبێ خاوەن هەموو ئەو مافانە بێت کە هەر ویژدانێکی دروست هەیەتی. بەمشێوەیە بیل ڕێساسەکی زیهنی واتە ڕاستگۆبوون و ڕاستی، دەکاتە جێنشینی ڕێسای بابەتیبوونی هەقیقەت و لە ئەنجامدا کێشەی نیەت_باشی دەکاتە جێنشینی کێشەی باوەڕ.

بەمشێوەیە گشتیبوونی ئەرکی فەرمانبەرداری لە ویژدان دەبێتە بناغەیەك بۆ ئازادی مەزهەبی، بەڵام ئایا حاڵەتی وا نایەتە پێشێ کە هەر ئەم ویژدانە ببێتە هۆی هەڵەی ئەخلاقی؟ بە دەربڕینێکی دی چۆن دەکرێ بەبێ ویژدان، بیر لە ئازادی ویژدان بکرێتەوە؟ ئەگەرچی بیل بەد_نیەتی بە شتێکی نامومکین نازانێت، بەڵام کانت ئەرکی پەیڕەوی لە ویژدان وەك "زانینێك کە دەبێتیە" ڕووندەکاتەوە. ئیلهامە مەزهەبیەکان یان دەسەڵاتە کەنیسەییەکان ناتوانن ببن بە جێنشینی هەقیقەتی ویژدان: ناکرێ لە هەقیقەتی دۆگم و نەریتە مەزهەبیەکان، دڵنیایی تەواو پەیدا بکەین، ناسینی یاسای ئەخلاق و ئەرکی فەرمانبەرداری بێمەرج لێی، ویژدان دەکات بە داوەری دروستی کرداری مرۆڤ.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا مەسەلەی لێکبووردن تەواو نابێت، دەتوانین جارێکی دی بە تاوتوێکردنی سنووری لێکبووردن کە تەنها لەسەر بناغەی مافەکانی ویژدان دامەزرابێ، باسەکە بەشێوەیەکی دی بهێنینە پێشێ، ئەم مافانە بەر کۆمەڵێ ڕێگر دەکەون کە سیاسی و حقوقیە. ئەگەر بە ڕاستی دەبێ بەر لە هەر

شتێك پەبرەوی حوكمی ویژدان بكەین. ئایا وەك هۆبز سەرنجی داوە- مەترسی بە شەرعی نەزانینی كردار بە پێی ئەركی فەرمانبەرداری زەمینی، نایەتە پێشەوە؟ ئەمجارە ئیدی دەسەلاتێك لەبری دەسەلاتێكی دی دانانە، جێنشینی دەسەلاتی ویژدان یان خودایە، لە بەرامبەر دەسەلاتی فەرمانڕەوادا. ئەم وتوێژە بە تەواوی سیاسیەو ئەو چەمكانەی كە ئازادیخوازی سیاسیو ئابووری دروستیكردوە ئامێرێتی، لەم وتوێژەدا، مافو ئەركی دوولایەنەی فەرمانڕەواو هاولاتیانو هەروەها سنووری ڕەوای دەستێوەردانی فەرمانڕەوایان لە كاروباری تاكەكاندا، دەخرێتە بەر باس، لێرەوە مەسەلەی باوەڕی دەروونیو ویژدانی تاكەكان كەمتر گرنگی پێدەدرێو پتر سەرنج لە جێگەی لەناو كرداری دەزگاكانو لەناو دەستنیشانكردنی سنووری مەسەلەی گشتیو مەسەلەی تایبەتیدا، دەدرێ لەگەڵ ئەمەشدا مەسەلەی بیركردنەوەی بە شێوەیەكی دی لە بواری مەزهەبیدا، جێگەی خۆی دەدا بە هاوبەشی بەرژەوەندی. ئەم ئازادیە لەبەرئەوەی كە سەروكاری لەگەڵ سیاسەتدا نیە، وەك باشترین هۆكار بە قازانجی فرەیی لە بواری بیروڕادا، دەردەكەوێت.

## سیستەمی سیاسەت، ئیرتیدادی بە فەزیلەت

ئایا كاتێك یاساكانی حكومەت ناكۆك بێت لەگەڵ حوكمەكانی ویژدانی مرۆڤدا، دەكرێ بەشێوەیەكی شەرعی سەرپێچی لێبكرێو لەژێر ناونیشانی ئەوەی سەركوتكەرانەو زۆردارانەن، بەبێ بایەخ بزانرێ؟ لۆك مەسەلەكە بە ڕوونی بەمشێوەیە دەخاتە ڕوو: ئازادی بیروڕاو باوەڕ بەر لە هەموو شتێك پەیوەندی بە سۆزو شەوقی مەزهەبی مرۆڤەوە هەیە كە بتوانێ بناغەیەك بێت بۆ لێكبوردن. ئەو زیهنیەتی كە لەژێر كاریگەری خواستی ئازادی بیروڕاو باوەڕدایە، دەتوانێ ببێ بە هۆكارێكی هەڵوەشاندنەوەی پەیوەندی كۆمەڵایەتیەكان. ویژدان ناتوانێ مەرجەعی دەستنیشانكردنی ئەركی خەڵكی بێت.

لۆك زەمینیكردنی (عەلمانیكردنی) ئەو مەسەلانەی پەیوەندیان بە مەسەلەی گشتیەوە هەیەو سپاردنی مەسەلەی دینو بیروڕا بە بواری تایبەتی، دەهێنێتە پێشێو لێكبوردن مانایەكی تازە پەیدا دەكاتو زەمینی دەبێت، بەمشێوەیە مەرجی جیابونەوەی كەنیسە لە دەوڵەت، بەسەرنجدان لەو دەورەی كە هەر یەكێكیان هەیانەو ئەو ئامانجانەی كە بە دوایەوەنو ئەو هۆكارانەی لەبەردەستیاندایە، دەبێ بە شتێكی پێویستی بۆ لێكبوردن. (نامەیەك لە بارەی لێكبوردنەوە، لا 17-11) دەوڵەت وەك ئەنجومەنێكی ڕێكەوتننامەیە كە مرۆڤەكان بە نیازی پاراستنی بەرژەوەندیە دنیاییەكانیان، بۆ ژیان، ئازادیو موڵكایەتی دارایی، كۆدەكاتەوە، سنووری دەسەلاتی فەرمانڕەوایان ئەو ئامانجە دەستنیشان دەكات كە ئەنگێزەی دروستبوونی دەوڵەت بووە: فەرمانڕەوایان كە هەم یاساكانو هەم هێزە گشتیەكانیان لە بەردەستدایە، دەبێ سزای هەر جۆرە دەستدرێژیەك بۆ سەر یاساكانو بەرژەوەندیە دنیاییەكانی نەتەوە، بدەن، بەلام ناتوانن لە بارەی بیروڕا مەزهەبیەكانیانەوە، یاسا دابنێن، نە دەسەلاتی ئەوەیان هەیە (هیچكەس تەنانەت هەڵبژاردنی باوەڕە ویژدانیەكانی خۆشی لە دەستدا نیە)، نە مافی ئەوەیان هەیە. دۆگمە تیۆریەكان لە بواری بەرژەوەندیە زەمینیەكانی نەتەوەدا، هیچ حوكمێك لەخۆ ناگرن. كەوابوو خەڵكی مافی ئازادی تەواوی دینو بیروڕایان هەیە، لۆك كەنیسەكان وەك ئەنجومەنێكی تایبەتی دەناسێ كە تەنها ئامێری كاركردنیان فێركردنو قەناعەت پێهێنان یا دەركردن لە ئەندامێتی ئەو كەنیسەیەیە: تەنها وەسوەسەی

کەنیسەکان ئازادی دەروونی باوەڕدارانە (هـ.س.پ. لا 13-11) کەوابوو ئازادی خەڵکی لە بواری بیروڕای مەزهەبیدا لەگەڵ ئەرکی فەرمانبەرداری لە یاسا زەمینیەکان، دەگونجێو بەرژەوەندیە گشتیەکان بە پێوەری لێکبوردن دەناسرێ. تەنها بە ڕەچاوکردنی ئەم بەرژەوەندیانە دەکرێ لە بارەی چاکەو خراپەکانەوە، ڕێساگەلێک دابنرێ. هەروەها فەرمانڕەوا دەتوانێ کەنیسەیەک کە کرداری ناکۆک بە بەرژەوەندی هاوبەشی هەموان بڵاودەکاتەوە، قەدەغە بکات. ئەم بەلگاندنە بە تەواوی ڕاست دەردەکەوێتو لۆک تەنانەت بەم بەلگاندنە سنووری لێکبوردن دەستنیشان دەکات: فەرمانڕەوا نە دەتوانێ لە بەرامبەر ئەو کاسۆلیکانەدا لێکبوردوو بێت کە لە بری فەرمانڕەوای زەمینی، پەیڕەوی لە پاپا، واتە لە میرێکی بێگانە دەکەن، نە لەگەڵ ئەو مورتەدانەدا کە نکوڵی لە بوونی خودا دەکەنو وەفادار نابن بەرامبەر بەو پەیمانانەی کە بێگومان بناغەو پایەی کۆمەڵگا پێکدەهێنن.

کەوابوو مەسەلەکە ئەوەیە ئەو بیروڕایانەی کە لە دیدی دەوڵەتەوە پێویستنو ئەو بیروڕایانەی کە بۆ دەوڵەت گرنگ نین، دەستنیشان بکەین. لەم مەسەلەیەدا مەسەلەی ئەخلاق جێگەیەکی ناوەندی داگیردەکات. ئایا هەندێک لە بیروڕاکان کارکردن بۆ چاکەیەک کە بۆ بەرژەوەندی کۆمەڵگا ناچاریە، نابەستێتەوە؟ هەموو بیروڕاکان بێلایەن نینو بەشێک نین لە بواری تایبەتی تاک. ڕۆسۆش وەک لۆک ئێرتداد مەحکومدەکات، بەڵام مەزهەبەکان تەنها بە بەشێک لە بواری تایبەتی نازانێ، بە پێچەوانەوە، بە بڕوای ئەو، مەزهەب لەو شوێنەدا کە هاوڵاتیان ناچار بە چاکە دەکات، مەسەلەیەکی گشتیە، مەزهەبی زەمینی بە پێکەوەگرێدانی مرۆڤەکان، وەک نمونەیەکی خەیاڵیو سۆزداری، مۆر لە ڕێکەوتنێکی ئەقڵانیانە دەدات کە دروستکەری پەیمانی کۆمەڵایەتیە. مەزهەب، پیرۆزی پەیمانی کۆمەڵایەتی بەهێزدەکات. دەوری سەرەکی برتییە لە خزمەتکردنی مەدەنیەت لە ڕێگەی پابەندکردنی هاوڵاتیانەوە بە ئەرکە ئەخلاقیەکان.

لە بەرامبەر ئەوەی جان ستیوارت میل بە دەستێوەردانی ناڕەوای دەوڵەتی دەزانێ لە بواری مەسەلە تایبەتیەکاندا، بیل بەر لەو، وێنەی مرۆڤی خوانەناسی پیاوچاکی داناوە. بە بڕوای بیل ئێرتداد ئەگەر لەسەر بناغەی سۆزو بەرژەوەندیەک بێت کە پەیڕەویکردنی ببێتە هۆی چاکەیەکی کۆمەڵایەتی، ئەوا ئەمە ناکۆک نیە لەگەڵ کۆمەڵایەتیبووندا. ئەگەر ئارەزووی مرۆڤەکان زۆرتر لەسەر ئەوە بێت کە پەیڕەوی لە ئارەزوە هەستیەکانیان بکەن تا ڕەچاوی دەستوورە ئەخلاقیەکان بکەن، تەنانەت ئەگەر ئەو دەستورانە لە ویژدانی خۆیانەوە هاتبێت- لەم حاڵەتەدا چیدی دادپەروەری خودایی، بوونی نابێت بۆئەوەی ببێ بە ئەنگێزەیەک بۆ چاکەکردن. چاکە دەرئەنجامی خواستی قەدرزانی ئەوانی دیە لە ئێمەو دەرئەنجامی عیزەتی نەفسو بەرژەوەندی تایبەتی خۆمانە. چاکە، ئاسودەییەکی دەروونی دەهێنێ کە تایبەتە بە "یاساکانی شەرەفو شایستەبوون". مرۆڤی مورتەدیش وەک مەسیحی یان باوەڕدار بە دیانەتە کۆنەکان، ئەخلاقی سروشتیو زاتی خۆی هەیە، ئێرتداد دەتوانی لە پاکبووندا بگونجێ، چونکە ڕێسا ئەخلاقیەکان هەر تایبەت نین بە مەزهەب. ئێرتداد چیدی بەو ناوەی کە دژی کۆمەڵایەتیبوونە، شایستەی مەحکومکردن نیەو لێکبوردن دەتوانرێ تەنانەت لە بەرامبەر مورتەدەکانیشدا بەکاربهێنرێ.

## بازرگانی داراییو بازرگانی بیر

ڕەنگە ئەو کاتەی بیروڕاکان دەبن بە بەشێک لە مەسەلە تایبەتیەکان، لەو کاتەدا کە ئاڵوگۆڕ دەکرێن بین بە بیروڕای گشتی. لەم ڕوانگەیەوە دەکرێت

ئازادی بازرگانی ببەستینەوە بە ئالوگۆڕی بیرەکانو مافی بڵاوکردنەوەی بیروڕاکان، ئەم بەلگاندنە تا دوا پلە لیبڕالانەیە. لێکبوردن لەم مانایەدا سیستەمێکی ئالوگۆڕە: ڤولتێر لە وتاری "ویژدان" لە ئینسیکلۆپیدیادا قازانجی بازرگانی دەکاتە جێنشینی مافی ئازادی بیروڕاو باوەڕو هەروەها دەیکاتە جێنشینی مافی پاشا بۆ یاسادانان لە بارەی بیروڕاکانەوە. قازانجی بازرگانی یارمەتی ئازادی بیروڕا دەدات، چونکە هاوئاهەنگە لەگەڵ بەرژەوەندیەکانی دەوڵەتدا، لە هەمانکاتدا ئازادی بیروڕاو باوەر لە ڕووی بەرژەوەندی گشتیەوە، دەگۆڕێت بە مەسەلەیەکی بێلایەن، هیلۆتیسیش ئازادی دەربڕین لەسەر بناغەی بەرژەوەندی گشتی دادەنێ. بە بڕوای ئەو ئازادی دەربڕین هۆکاری بڵاوبوونەوەی ڕاستیەو یارمەتی ڕووناکبوونەوەی تاکەکان دەداتو ڕێگە بۆ پێشکەوتنی مرۆڤ خۆشدەکات. جان ستیوارت میلیش پشت بە قازانجی ئەبستمۆلۆژیایی لێکبوردن دەبەستێو دەڵێ قەدەغەکردنی هەر بیروڕایەك بە مەحرومکردنی مرۆڤایەتی لە هەقیقەتێك، یان {ئەگەر ئەو بیروڕایە هەڵە بێت} بە مەحرومکردنی مرۆڤ لە "دەرکی هەقیقەت کە بەهۆی بەرکەوتنی بەو هەڵەیە، ڕوودەدات"، لە ڕاستیدا شتێك لە مرۆڤایەتی دەدزێت (لە بارەی ئازادیەوە، لا 136)، بیروڕای گشتی ئەوکاتەی کە فۆرمەلە بوو، جێگەی داوەر داگیردەکات، جا چ ڕووداوێکی وەك ئەوەی کالاس لە ئارادا بێت، یان هەر مەسەلەیەکی دی کە ململانێی لێکبوردنو پەرگیری تیایدا دەورێکی هەبێ.

لێکبوردن لە کێشەیەکی مەزهەبییەوە دەگۆڕێت بە کێشەیەکی ئابوریو لێرەوە مەسەلەی هەقیقەت دەبێ بە لقێك لە مەسەلەی ئابوریو سوودبەخشیداو هەر لەبەر ئەمەش ئازادی بازرگانی تێکەڵ بە ئازادی بیروڕاو دین دەبێت: لەم ڕووەوە شاری ئەمستردام نمونەیەکی بەرجەستەیە، ئەو ستایشەی سپینۆزا لە وتاری مەزهەبی -سیاسیدا لەم شارەی دەکات، چەمکێکی ئازادیخوازی وێنە دەکات کە بە پێی ئەو، ئالوگۆڕی ئازاد، دڵنیاترین بەربەستە لە بەردەم دەستدرێژی نابەجێی دەوڵەتو دەزگاکان {چ زەمینی بێت، یان شەرعی} لە مەسەلە تایبەتیەکانو بیروڕای هاولاتیاندا. ئایا ماکس فیبەر بازرگانی سوودخوازانەی بە هۆکاری لێکبوردن لە بەرامبەر ڕەوتی توندی تەقوای گرووپی کالڤینیو گرووپەکانی باپیتستەکاندا، بە ڕەچاوکردنی بەرژەوەندیەکانی دەوڵەت نەدەزانی؟ ئەوەی کە بازرگانی دارایی بە سوودی بازرگانی بیرەکانە، بابەتێکی کۆنە، بەلام ئەم بابەتانە لە دیدی ڤولتێرەوە مانایەکی تایبەتی هەیە، ئەو چیدی بیروڕاو باوەڕە مەزهەبیەکان بە مەسەلەی تایبەتی نازانێت، بەلکو ئەوانە لە بواری شتە بێهودەکاندا (نە گشتیو نە تایبەتی) دادەنێ.

لەگەڵ ئەمەشدا بەرگریکردن لە ئازادی قسەو بیر تەنها بە پشتبەستن بە بەرژەوەندیە گشتیەکان، بەرگری لێناکرێ، سپینۆزا پیشانیدەدات کە بەرژەوەندی تاك ناکۆك نیە لەگەڵ بەرژەوەندی گشتیدا. تاکەکان بەهۆی پەیمانی کۆمەلایەتیەوە دەست لە مافە سروشتیەکانی خۆیان بە قازانجی فەرمانڕەوایەك کە دەسەلاتی هەموویانی لە ئەستۆدایە، هەڵدەگرن، بەلام دەسەلاتی ڕەهای ئەم فەرمانڕەوایە ناکۆك نیە لەگەڵ ئازادی دەربڕینو بیرکردنەوەدا. لە ڕاستیدا ئەم مافە بەهیچ شێوەیەك قابیلی سپاردن نیە بە کەسێکی دی، چونکە بەشێکە لە سروشتی تاکەکان، واتە لە سۆزەکانی ئەوانەوە دێتو ناکرێ چاوی لێبپۆشرێو هەرواش وەك مرۆڤ بمێنینەوە، کەوابوو هیچ فەرمانڕەوایەك توانای دەسەلاتدارێتی بەسەر دەروونو زمانی دەستو پێوەندەکانی (اتباع) خۆیدا نیە، سپینۆزا لەم ڕووەوە جیاوازی دەکات لە نێوان وتنو کرداردا. ئەو قبولی

ئازادی تەواو بۆ وتن دەکات تا ئەو شوێنەی پەشێوی دروستنەکات، بەڵام چەند سنوورێک بۆ کردار دادەنێت: ڕەخنەگرتنی یاساکان تەنانەت دەتوانێ بۆ خودی یاساکانیش سوودمەند بێت، بەڵام تا ئەوکاتەی فەرمانڕەوا یاسایەکی نەگۆڕیوە، هەموو دەبێ ملکەچی بن، بەمشێوەیە ئازادی بیروڕا هیچ مەترسیەکی بۆ دەوڵەتو وڵات نیە، بەڵکو مەرجی ئەمنو ئاسایشیتی.

تا ئێرە هێشتا لە چەمکی مافەکانی مرۆڤەوە، کە بنەمای ئازادی دەربڕین بە مافێکی قابیلی نەگواستنەوە دەزانێ کە لە مافە سروشتیەکانەوە نێت، دوورین، بەڵام ئەم مافە بە هیچ شێوەیەک لەگەڵ دەسەڵاتی تاکەکاندا یەکسان نیە، بەڵکو مافێکی ئەقڵانیە کە بناغەی کۆمەڵی مافو ئەرکی پەلگەنەویستەو لە حاڵەتێکدا کە فەرمانڕەوا سەرپێچی لێبکات، تاکەکان مافی ئەوەیان هەیە گوێڕایەڵی نەبن. ئەو بەرپەستانەی کە لە ساڵی 1789وە (شۆڕشی فەرەنسی) لە ڕێگەی فۆرمەڵەبوونیدا ڕاوەستاون، بێ پەیوەندی نیە بە مەسەلەی لێکبوردنەوە، لەولتە ڕابۆسن ئەتین لێکبوردن مەحکومدەکات بۆئەوەی بتوانێ باشتر بەرگری لە یەکسانی خەلکی لە بەرامبەر یاسادا بکات: لێکبوردن بەو شێوەیەی کە گوتمان زۆرتر چاوپۆشینە لە هەڵە یان لە هەڵەکانو ناکرێ بە یەکسانی مافەکانی هاوڵاتی بزانرێ. لێکبوردن بەرلەوەی سەلماندنی یەکسانی مافەکانی هەموان بێت، سەلماندنی نەبوونی مافێکە.

## چوونیەکیو فرەیی کلتوری

مەسەلەی لێکبوردن، بواری مەزهەبی سیاسی بەجێدەهێڵێو دەچێتە ناو بواری تازەوەو گەشەدەکات، بەمشێوەیە لیئۆ شتراوس سەرنج لەو لایەنەی ئەم چەمکە دەدات کە لە بنەڕەتدا کێشەئامێزە: ئەگەر لێکبوردن بۆ ئەوەیە ببێ بە شتێکی عەمەلی، دەبێت سنوورێکی دیاریکراوی لەگەڵ ئەو مەسەلانەدا هەبێ کە قابیلی لێبوردن نین، {ئەوا} نەبوونی سنوورێکی سروشتی لە بیری لێکبوردندا دەبێتە هۆی ئاوانبارکردنی بە مێژووگەری کە بۆ هەڵسەنگاندنی مافە پۆزەتیڤیزمەکان، بایەخێکی ڕەهای نابێتو لێرەوە گەڕانەوە بۆ مافی سروشتی لە پێناوی داڕشتنی بەهاکاندا، دەبێ بە شتێکی ناچاری، جێنشینی مافی سروشتیو مێژوویی، بیری لێکبوردن بەو بەهانەیەی کە سەربەخۆ نیە، کەمبایەخ دەکات. ئەگەر لە دیدێکی لیبرالیانەوە تەماشای لێکبوردن بکەین دەتوانێ ئاراستەکەری هەلومەرجێکی دەسەڵاتخوازانە بێت. لەگەڵ ئەوەشدا کە ڤۆلتێر بیروڕاکان لە ڕوانگەی ئازادی بازرگانیەوە بە مەسەلەیەکی بێهودە دەزانێ، بەڵام ئایا دەبێ لەگەل نایەکسانیە کۆمەلایەتی - ئابوریەکاندا وەک خراپیەکی زەروری، یان وەک ڕوویەکی تری ئازادی سنووردار، لێبوردوو بین؟ لەم حاڵەتەدا لێکبوردن مەسەلەیەکی بێهودە دەبێت کە بە وتەی هربرت مارکیوز (لە کتێبی ڕەخنە لە لێکبوردنی پەتیدا) دەچێتە خزمەت توندوتیژیەوەو زەمینەیەکی لەبار بۆ ئەو مەسەلانەی شایستەی لێبوردن نین، خۆشدەکات.

ئەوکات ئیدی سوودخوازی، سیستەمی بازرگانی، جیاکردنەوەی مەسەلەی گشتی لە مەسەلەی تایبەتی، یان سەرنجدان لە هێزی خەلکی بناغەی بیرۆکەی لێکبوردن نابێت، ڕاولز (دیارە لە هەلومەرجو فەزای تەواو جیاوازدا) هەولیدەدا تا لێکبوردن لەسەر بناغەی یەکسانی سەرەتایی تاکەکان بونیاد بنێ کە لە ژێر "پەردەی نەزانین"دا بەیەکەوە پەیماندەبەستن، لێکبوردن ناکۆک نیە لەگەڵ یەکسانیدا، بەڵکو کۆلەکەیەکی تیا دەدۆزرێتەوەو دەبێت بە بەشێک لە تیورەی دادپەروەری، لە دەوری

دەوڵەتدا نوێکردنەوەیەک ڕوودەدات: دەوڵەت دەتوانێ دەستبخاتە کاری تاکەکان و کۆمەڵەکان، بۆئەوەی هاوسەنگی هێزە بەرامبەرەکانیان لە پێناوی بەرگریکردن لە فرەیی کۆمەڵگادا، بەرقەرار بکات، بەڵام ئایا لەم حاڵەتەدا دەوڵەت هەروا بە بێلایەنی دەمێنێتەوە؟ خواستنی دەوڵەتێکی هەمەڕەنگ و فرەو لە هەمانکاتدا بێلایەن کارێکی ئاسان نیە. ئەگەر دەبێ دەوڵەت بە قازانجی هەندێک لە گرووپەکان، یان بە مەبەستی پاراستنی هاوسەنگی پەیوەندی گرووپەکان دەخاڵەت بکات، ئەو مەترسیە هەیە کە بێلایەنی خۆی لە دەستبدات، ئەگەر بە پێچەوانەشەوەیەو دەبێ دەوڵەت بێلایەن بێت، ئەوا جیاوازیو هەمەڕەنگی بیروڕاو باوەڕەکان یان گرووپەکان لە کۆمەڵگای مەدەنیدا دەکەونە مەترسیەوە، هیگل بەمشێوەیە ئەو کێشەیەی لە مەسەلەی لێکبوردن و سنوورەکەیەوە دروستدەبێ، دەهێنێتە پێشێ. لە وتاری ناسیۆنالیستیشدا بە گشتی لیبرالیزم ڕەخنە دەکەن و لێکبوردن لەسەر بناغەی مافی نەتەوەکان و کەمایەتیەکان بونیاددەنێن، نەک لەسەر بناغەی قبولکردنی مافەکانی تاک و گرنگی تاک لە چاو گرووپدا.

فرە کلتوری واقعی، ڕووبەڕووی دژایەتیەک دەبێتەوە کە لە لایەکەوە دەرەنەنجامی سیاسەتەکانی شوناسە بۆ ناسینی جیاوازیە کلتوریەکانی گرووپە کۆمەڵایەتیەکان کە لە ساڵی 1960وە خواستی کەمایەتیەکان (ڕەشەکان، هەمۆسێکشوێڵەکان، ژنان و... بە تایبەتی لە ئەمەریکادا) بووەو لە لایەکی دیەوە (بۆ نمونە لە فەرەنسادا) لەو لۆژیکە لیبراڵانەوە دێت کە مافەکانی تاک لەپێش مافەکانی گرووپەوە دادەنێ (شکڵی سیاسی دەوڵەت- نەتەوە نمونەی بەرجەستەی بیرۆکەی هاوڵاتیە لەسەر بناغەی جیابوونەوەو تەنانەت ڕزگاربوونی تاک لە کۆتوبەندی ئەو کۆمەڵانەی ڕەگیان لەناویاندایە). ئەگەر چەندکلتوری تەنانەت لە نەریتی لیبرالیدا، جۆرێک ڕاوەستان بێت کە ئارەزووی توانەوەی تاکەکانی لە کلتوری باڵادەستدا هەیە، گۆڕانکاریەکانی ئەم دواییانە مەسەلەی لێکبوردنیان بەشێوەیەکی دی هێناوەتە پێشێ. مایکل واڵتزێز لەم ڕووەوە بیر لە لێکبوردنی پۆستمۆدێرن دەکاتەوە کە شوناس و گۆڕانکاری گرووپەکان دەسەلمێنێ، بەڵام هەروەها تاکەکان ناچاردەکات کە لەگەڵ بەشێکی هەرچی گەورەتریدایە چوونیەک بن، پەیوەستبوونی تاک بە بواری جۆراوجۆری شایستەیی کلتووریەوە، لە هەمانکاتدا مەرجی ئازادی و شکڵی تازەی لێکبووردنە.

مەسەلەی جیاوازی کلتوری لە ئاستی نێو دەوڵەتیشدا، لە ئارادایە، لەم ڕووەوە ڕەخنەی سەنتەریزمی نەتەوەیی بەهۆی زانستی ئەنسرۆپۆلۆجیای تازەوە، نکوڵی لەو بیرە دەکات کە بڕوای وایە ڕەنگە زنجیرە پلەیەک لە نێوان کلتورەکاندا هەبێ، چونکە هەر کلتورێک بە شێوەیەکی سەربەخۆ لە نمونەکان یان ئەو پێوەرە بێگانەیانەی کە دەتوانن کاری تێبکەن، پەرە دەسێنێ. ئەم ڕەخنەیە، بەرگریە لە یەکسانی کلتورەکان، بەڵام قبولکردنی مافی یەکسانی کلتورەکانیش لەو ڕوانگە جیهانی و گشتگیرەوە کە لە قوتابخانەی هیومانیزم و ڕۆشنگەریەوە سەرچاوە دەگرێ، کەوتۆتە بەر ڕەخنە کە بە پێچەوانەی ئەو ڕوانگەیەوە، بڵاوکەرەوەی بیرۆکەی مرۆڤایەتیەکی ڕێکخەری کۆبوونەوەی مافەکانی مرۆڤەکانە وەک بڵندبوونەوەیەک لە خەسڵەتە کلتوری و مێژوویی یان کۆمەڵایەتیەکان. بێگومان لەم ڕوانگەیەوە ناکۆکی لێکبوردن لەگەڵ هەندێک لە شێوەکانی قوتابخانەی هیومانیزمدا، سەرسوڕهێنەر دێتە پێشچاو، ئایا سەلماندنی خەسڵەتە کلتوریەکان و بەرگریکردن لە دیدی کلتورخواز ناتوانێ بەو بنەمایانەی کە

دروستیدەکات، بە بەهانەی قبولکردنی ماف بۆ هەر تایبەتمەندیەك، ڕێگە بە توندوتیژترین شێوەکانی لێکنەبوردن بداتو بگۆڕێت بۆ دژی خۆی؟ ڕەنگە لە ڕوانگەی چوونیەکی جیهانیو گشتگیرەوە، بتوانین بە پێچەوانەوە ئەو ڕەخنەیە بگرین کە دەوری مێژوو و کلتوورو جەبریەتەکان لە بەرچاو ناگرێتو دەیانشارێتەوە، لە کاتێکدا هەر ئەم شتانەیە کە مرۆڤەکان وەك بەرهەمی زنجیرەیەك سازو کاری کۆمەلایەتیو مێژوویی بەشێوەیەکی چارەسەر هەلنەگر، جۆراوجۆر دەکات (هەروەها ڕەخنە لە چەمکی چوونیەکی جیهانیو گشتگیر وا گیراوە کە خۆشی لە ڕووی مێژوویو کلتوریەوە، دترمەنیزمە) لەگەڵ ئەمەشدا بە بڕوای لیڤی شتراوس بە پشتیوانی لە کلتوورە جیاوازەکانو دەوری مەرجەعە نێونەتەوەییەکان، دروست ئەوەیە کە کلتوورە جیاوازەکان لەیەك نزیکبکاتەوە، دیارە بێئەوەی شکلی کلتورێکی تایبەت بە بلندتر بزانێ لە ئەوانی دی.

ئەو مانا جیاوازانەی کە بۆ لێکبوردن لێکدراوەتەوە، ئالۆزیەکەی لەناو نەبردوە، ئەگەرچی یەقین نیە کە ئێمە توانیبێتمان دەست لە دوو حالەتی ڕاکێشانی ناچاری تاکەکان (لە کلتوورو کۆمەلێکدا) یان دەرکردنیان هەلگرین، بەلام لێکبوردن لە هەموو حالەتێکدا پێویستیەکی ئەقلانی، مەرجێکی داناییەو چیدی ئیمتیازێك نیە کە بۆ هەلە یان عەیبێکمان هەلگرتبێ، لێکبوردن لە مانا پێشوەکەی هەر ئەوەی پاراستوە کە بەر لە هەموو شتێك هەولێکە لەلایەن مرۆڤەوە بۆ خۆی، مەسەلەکە تەنها ئەوە نیە کە هەلەیەك، عەیبێك، ڕاکردن لە هەقیقەتێکی بەلگەنەویست یان مەرجەعێکی فەرمانڕەوا، تەحەمولبکەین، ئەمەش خۆی گۆڕانێکی کەم نیە، ئەو کەسە لێدەبوریێ، خۆی قازانجی لێدەکات، لێبوردن، شەریکبوون نیە لە خراپەدا، لێکبوردنە بۆئەوەی چیدی مەسەلەیەکی ئەخلاقی یان چاکەیەك بەزەبر نەبێت، دەبێ بەهۆی هەنگاوە سیاسیەکانو بە زمانێکی هاوبەشەوە دەرکەوێتو پەرە بسێنێ.

## *سەرچاوەی ئەم وەرگێڕانە بریتیە لە کتێبی*

*ژولی سادا– ژاندرۆن: تساهل در تاریخ اندیشە غرب. ت: عباس باقری. تهران: نشر نی، 1378*

# جۆن لۆك (1)

## دۆزینەوەی بنەمای عەلمانیەت

■ جان ڤابی ین سپیتز(2)
● و. لە فارسییەوە: ڕەووف بێگەرد

**بیرۆکەی لێکبوردن (تسامح) زادەی قووڵبوونەوەیە، نەك لەبەر ئیمتیازی هەمەڕەنگیەوە، بەڵکو لەبەر سنووری توانست (Competence)ی سیاسیەوە. بەم شێوەیە لۆك لە (نامە لەبارەی لێکبوردن)[3] ەوە، تەواوی خولیای خۆی بۆ ئەو مەبەستە تەرخانکردوە کە عەلمانیەت چەندە بۆ دەستەڵاتی مەدەنی پێویستە.**

لە دنیای هاوچەرخا، لێکبوردن پەیوەندی بە قبوولکردنی دوولایەنەی جیاوازیەکانی ئێمەوە هەیە، لەڕووی ڕەنگی پێست، کولتوور، بیروڕا یان ڕێ باوەڕ (مەزەب)ەوە، ئەم بیروڕایە کە خەڵکە جۆراو جۆرەکانی کۆمەڵگای مرۆڤ بەهۆی زنجیرەیەك شتی هاوبەشەوە بەیەکەوە دەبەستێت و، لە هەمانکاتدا هەر ئەو جۆراوجۆریە دەبێتە هەوێنی سەرکەوتنی هەموو ژیانێکی هاوبەش، دەبێتە بەشێکیش لە بنەما سەرەکیەکانی بیروباوەڕە ئازادی خوازانەکەی مرۆڤی مۆدێرن.

بەڵام مێژووی بیرۆکەی لێکبوردن، دنیایەکی جیاوازمان بۆ دەردەخات کە دەبوو بە سەبرو ئارامەوە تێیپەڕیایە، تا ئەو کاتەی مرۆڤ بەم راستیە بەلگەنەویستە مۆدێرنە دەگەیشت کە جیاوازیەکان ئەنجامی باش بەدەستەوە دەدەن.

بیرۆکەی لێکبوردن لەڕاستیدا زادەی قووڵبونەوەیە نەك لەبەر ئیمتیازی هەمەڕەنگیەوە، بەڵکو لەبەر پەیوەندی توانست و بیروباوەڕەوە، بەشێوەیەکی گشتی تر لەبارەی سنوورەکانی توانای سیاسیەوە. ئەو پرسیارە تەوەرییەی کە لە سەردەمی کلاسیکەوە دەکرێت سادەیە: ئەو میرو والیانەی بەناوی گشتەوە شمشێر دەوەشێنن، ئایا مافی ئەوەیان هەیە بیروباوەڕو مەزەبی رەعیەتەکەی خۆیان وابەستەی کۆمەڵێك مەرج بکەن و فەرمانیان بەسەردا بدەن؟ ئەگەر وەڵامەکە بە ئەرێ بێت ئەوسا دەبێت دوو ڕووی جیاواز لەخۆ بگرێت: یەکەمیان،

مەسەلەی مەزهەبیی راستەقینەی دەخستە پێش‌و بڕوای وابوو مێر ماف‌و ئەرکی خۆیەتی کە لەپێناوی بڵاوکردنەوەی هەقدا دەسەلات بەکاربهێنێت. دووەمیان، خستنەرووی کۆمەڵێك بۆچوون بوو، کە مەسەلەی سووربوون و چاودێری دەهێنایە پێش و بڕوای وابوو کە کۆمەڵگای مەدەنی، بەبێ یەکێتیەکی مەزهەبی پتەو (Rigoureux) تەمەنی کورتە: یەك پاشا، یەك یاسا، یەك بیروباوەڕ.

لە نامەیەك دەربارەی لێکبوردن (1689) لۆك هەردوو وەلامەکە رەت دەکاتەوە. بۆ هەڵوەشاندنەوەی وەلامی دووەم رێك مێژوو و ئەزموونەکان دەکاتە شایەت کە ئەوە دەردەخەن لێکبوردن تاقە هۆی ئاژاوە ناوخۆییەکانە، بەلام رەتکردنەوەی وەلامی یەکەم وردبینی زیاتری دەوێت. چونکە لۆك ئەوە دەزانێت، لەبەرئەوەی لۆك ئەوە دەزانێت کە ناتوانێت بە مەحکووم کردنی بیرۆکەی مەزهەبی راستەقینە دەستبەردار بێت، چونکە لەم حاڵەدا، دەبێت ئەوە دەربخات کە لەبەرئەوەی ئەم بیرۆکەیە، خۆی، مانایەکی وردو تەواو دیاریکراوی نییە، کەواتە دەبێت ئاگاداری ئەوانە بکرێت کە بانگەوازی لێکنەبوردن دەکەن: هەقی (گریمانەیی) و ناهەقی (گریمانەیی) بەشێوەیەکی دوولایەنە زیان بە یەکتری دەگەیەنن. لەراستیدا بەڵگەیەکی لەمجۆرە ناتوانێت کاریگەریی بخاتە سەر ئەو کەسانەی کە لەو بڕوایەدان هەق لای ئەوانە، چونکە ئەمانە، سەرەڕای بەرانبەرە نەیارەکانی خۆیان، هەمیشە زۆرینە پێکدەهێنن.

کەواتە لۆك، بەشێوەیەکی کاتی، رێگایەکی تەواو "سیاسی" لەپێش دەگرێت و بە واژە تایبەتیەکانی خۆی ئەوە دەسەلمێنێت کە دەسەلاتی مەدەنی هەقی ئەوەی نییە حوکم بەسەر باوەڕە مەزهەبیەکانی خەڵکەکەیدا بدات و ببێتە رابەری رزگارکردنیان، بۆ؟ لەبەرئەو دەلیلە سادەیەی کە ئامرازی ئەم کارەی نییە، گریمان ئەو دەسەلاتە بۆ بارگاویکردنی ئەم یان ئەو ئەسڵە دینیە پەنا بەرێتە بەر زۆرداری، ئەو (واتا دەسەلاتی مەدەنی) لەوە بێگومانە کە سەرناکەوێت، چونکە یەکێك لەم دوو حاڵەتە رووەدەدات، یان خەڵکەکەی نیسبەت بە بەهای ئەو ئەسڵە دینییەی کە ئەو دەیەوێت بڵاوی بکاتەوە قەناعەت پەیدا دەکەن، کە لەم حاڵەدا پەنابردنە بەر زۆر کارێکی بێ سوودەیە، یان خەڵکەکە قەناعەت ناکەن، کە لەم حاڵەدا بەکارهێنانی زۆرداری بە هیچ جۆرێك بیروباوەڕیان ناگۆرێت، چونکە ئەگەر خۆیشیان بیانەوێت، لە ویستی ئەواندا نییە ئەوەی بە هەڵەی دەزانن لەپڕێکدا پێی بڵێن راستە. بیری ئێمە لە دەستەلاتی خۆماندا نییەو، مرۆڤ ناتوانێت هەر لەبەرئەوەی کە ئیرادەی بڕیاری گۆڕینی باوەڕی خۆی داوە بیگۆرێت، ئەگەر ئەم بڕیارە لەگەڵ گۆڕانی باوەڕە زەینیەکەیدا جووت نەبێت. دەشێت زۆرو ستەم کاریگەری لەسەر یەکەمیان دابنێت، بەلام بۆ دووەم، نا.

کەواتە هەموو ئەو سزایانەی کە مێر بەهۆیانەوە هەڕەشەمان پێ لێ دەکات ناتوانن دیدی ئێمە بۆ شتەکان بگۆڕن، ئەو ئامێرە داپڵۆسێنەرەی کە ئەو هەیەتی ناتوانێت ئەم هەڵگەڕانەوە رۆحیەی ئێمە کە لەگەڵ بیروباوەڕماندا گونجاوە بەدیبهێنێت. خۆ ئەگەر ئەوانەی فشاریان لەسەرەو قەناعەت ناکەن– کە لەراستیشدا قەناعەت ناکەن– ناچارکردن و فشار لەسەردانان بە ئەندازەی سەرە دەرزییەك لە هەقیقەتیان نزیك ناکاتەوە. دەڵێن ئەوان دەیانەوێت بە ناچارکردنی خەڵکی بە باوەڕکردن بە هەقیقەت و رێگاگرتن لەو گومراییەی کە بەرەو دۆزەخیان دەبات یارمەتی رزگاربوونیان دەدات. بەلام ئەگەر ئەوان بڕوا بەم هەقیقەتە ناهێنن زۆرلێکردن چ سودێکی هەیە؟ چونکە لە پەنای رزگاری و مەزهەبدا، تەنیا بڕوای دەروونیە کە خوا پێی خۆشەو دەتوانێت رزگارمان

بكات. به جۆرێك كه ئەو كەسەی راستگۆیانه بەرەو ناهەقیەك دەچێت، بۆ رزگاربوون لەو كەسە نزیكترە كه به ئاشكرا داكۆكی له هەقیقەت دەكات بێئەوەی له ناخی دڵیەوە بڕوای پێ هەبێت. دەبێت ئەوەیش بڵێین كه ئێمه هەموو لایەنێكی مەزهەبی راستی ناناسین، لەگەڵ ئەوەیشدا، لۆك پێویستی بە بەبەلگاندنی گوماناوی نییه، چونكه ئەگەر بیشتوانین هەق لە ناهەق جیابكەینەوە، ناچاركردنی خەڵكی لەسەر ئەوەی كه ئەو هەقیقەتەی به رواڵەت بڕوایان پێ نییه رایبگەیەنن هێشتا هەر بەكەڵك نایەت، رێك بە پێچەوانەوە، مرۆڤ بەمشێوازە، واتا بە ناچاركردنی كەسانی دی بۆ كردنی ئەو شتانەی كه لای خوا خراپترین گوناهن، بەختەوەری خەڵكی دەخەنە مەترسیەوە: ریا.

بەڵام ئەگەر حوكمڕان نەتوانێت ناچاری خەڵكی بكات لەسەر بڕواهێنان، ئاخۆ مرۆڤی هێند ئازاد هەیە كه لەبەر بڕواكەی خۆی، كه به فەرمانی خوای خۆی دەزانێت بدوێت و ئەنجامی بدات؟ بەڵێ دەتوانێت بدوێت، بەڵام ئەنجامدان نەخێر. چونكه هەرچەندە حوكمڕان بەرپرسیار نییه له سانسۆركردنی دەروونی خەڵكی، لەباتی ئەوە ئاسایش و دڵنیایی و پاراستنی ئەو هەقە دەستەبەر دەكات كه لۆك ناوی سوودی مەدەنی لێ ناوەو، پارێزگاری له گیان و ماڵ و ئازادی خەڵكی دەگرێتەوە، كەواتە ئەو كەسەی كه به ناوی ویژدانی تاكی خۆیەوە، كارێك دەكات كه دژی سوودە مەدەنییەكانی هەموو هاوولاتییەكانی خۆیەتی، بەڕاستی دەبێت ئەو كەسە ئاگادار بكرێتەوە. بۆ ئەو بەس نیه بۆ راكردن لە یاسایەك كه بەبێ هەڵاوێرد كردن هەموو هاوولاتیەكانی كۆت و بەند بكات، فەرمانی خوا بكاته بەهانە. لەڕاستیا ئەگەر ویژدانی تاك بە پێوانە دابنرێت بۆ بەجێهێنانی فەرمانی مەدەنی، پەیوەندییە كۆمەلایەتییەكان تێكڕا لەناودەچن. بەمجۆرە، كه حكومەت هەندێك كاری وەك -ئەشكەنجەدانی مرۆڤ، لێدان له ئازادی خەڵك بە بیانووی فەرمان بەجێهێنانی خوداوە، دەست بەسەراگرتنی سامانی ئەو كەسانەی كه فلانە كڵێسا به گومڕا ناوزەدی كردوون- قەدەغە دەكات، ئەمە لەبەرخاتری هۆی مەزهەبی نییە، بەڵكو راستەوخۆ لەبەرئەوەیه كه ئەو كارانە لەگەڵ ئەو سوودە مەدەنیانەدا كه داكۆكی لێكردن و پاراستنیان لەسەرشانی حكومەتە ناكۆكی هەیە. لەڕاستیا ئەگەر ئەو جڵەوی ئەم كارانە نەگرێت دەغەڵی لە ئەركی خۆیدا دەكات، چونكه مرۆڤەكان تەنیا لەبەرئەوە كۆمەڵگایان هەڵبژاردوە كه بتوانن لە بەرانبەر دەستدرێژی هاوڕەگەزەكانیان بەرگری له ئازادی و ماڵی خۆیان بكەن. ئیتر هۆی ئەو دەستدرێژی كردنانە هەرچییەك بن.

بەمشێوەیە، ئەو یاسایەی كه مافی میرو مسكێن نیسبەت به یەكتری دیاری دەكات روون و ئاشكرایە: هەموو مرۆڤێك دەتوانێت له هەموو ئەو كارانەیدا كه لەگەڵ سازشی مەدەنیدا دەگونجێن و، هەر بەم ناوەوە، لەلایەن حكومەتەوە رێی پێدرابێت، هۆكارە مەزهەبیەكانیش لەگەڵدا بگونجێنێت، كەواتە ئەو كەسەی دەیەوێت سەری دابپۆشێت، یان نیشانەیەك هەڵبگرێت كه پەیوەندی بە مەزهەبەكەیەوە هەیە، دەبێت وەك ئەنجام ئازاد بێت، چونكه مرۆڤ دەتوانێت، بێ هیچ دوودڵیەك، سەرپۆشێك بدات بەسەریدا، كڵاو لەسەر بكات و دەرزی سنجاقی نقێمدار یان ملوانكه بپۆشێت بێئەوەی ئەم شتانە مانایەكی مەزهەبیان لەدواوە بێت (واتا ئەم كارانە، لەبەرئەوەی لەگەڵ سازشی مەدەنیدا ناكۆك نین، تەنانەت ئەگەر لەگەڵ هۆكارە مەزهەبیەكانیشدا دەربكەون، نابێت بەرەنگاریان بكرێت) لەلایەكی دیەوە، هەر كەسێك بە نیازی بەجێهێنانی

فەرمانەکانی خوای خۆیەوە بە پێچەوانەی یاساکانی حکومەتەوە کارێك بکات -ئەگەر یاساکە لە قازانجی پاراستنی سوودە مەدەنیەکانی هاوولاتیدا بێت و پێی قایل بن- نابێت ئەو کەسە هەرواو بێ سزادان دەربچێت. دەستدرێژی کردنە سەر گیان و ئازادی و سامانی خەڵکی دەبێت بە سەختی لەلایەن حکومەتەوە لێی بپرسرێتەوەو سزا بدرێن. ئیتر ئەوانەی ئەو کارەیان کردوە هەر بیانوویەکی مەزەبییان لەدەست بێت گرنگ نییە. ئەمەیە پێناسەی لۆك بۆ ئەو عیلمانیەتەی کە پێویستە بۆ حکومەتی مەدەنی.

## پەراوێز

1- John Locke فەیلەسوفی ئینگلیزی 1632—1704

2- Jeon Fabien Spitz ئەم بیرمەندە بۆ گەلێك لە کارەکانی جون لۆك یاداشت و پێشەکی نووسیوە. لەوانە لەسەر نامە لەبارەی لێکبوردنەوە.

3-Lettre la tolerance

## سەرچاوە

کتێبی تسامح از دیر باز تا امروز- کۆمەڵێك وتار.
وەرگێڕانی بۆ فارسی: مازیار مهیمنی/ محمد رضا شیخی محمدی ل 47—52



لە ئینتەرنێتەوە

# کانت

## رێنمایی مرۆڤ لە بواری باوەڕدا

● و. لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی

کانت لەم دەقەدا (کە دوای دەیهێنینەوە) ڕێسایەك بۆ بەدوکەوتنی بەکارهێنانی ویژدان لە بواری مەزهەبدا دەستنیشاندەکات. ئەم باسە بەگریمانەی حاڵەتێکی دوولایەنە دەستپێدەکات کە دادوەرێکی تەفتیشی بیروڕاکان، کاتێك دەبێ لەبارەی "کەسێکەوە کە گوایا بێ دینەو تاوانبارە بە بێباوەڕی" حوکمبدات، ڕووبەڕووی دەبێتەوە. مەسەلەکە لێرەدایە ببینین ئایا دادوەر بە حوکمدانی مردن، پەیڕەوی ویژدانی خۆی کردووە یان بە پێچەوانەوە بێویژدانی کردووە؟ ئەو گرفتەی کانت هێناویەتیە پێشەوە پەیوەندی بە ماهیەتی ویژدان و ماهیەتی باوەڕەوە هەیە، ویژدان هێزێکی مرۆیی ڕەسەنە: هەموو کەسێك ویژدانی هەیە، بەڵام ڕەنگە لە بابەتێکی تایبەتدا بێویژدانی بکات. لە بنەڕەتدا مەبەست لە ویژدان لێرەدا هێزی هەڵسەنگاندنی ئەخلاقیە. ئەم قسەیە بە چ مانایەکە؟ کانت بەمشێوەیە ویژدان پێناسدەکات: "زانینێك کە خۆبەخۆ دەبێتیە". مەزهەب لەڕووی زیهنیەوە




ناسینی سەرجەم ئەرکەکانی مرۆڤە وەك فەرمانەکانی خوداوەند. لێرەوە ویژدان نەك هەر ناسینی ئەم ئەرکانەیە، بەڵکو ڕێنمای بڕیارە ئەخلاقیەکانە کە شێوەی ئەنجامدانی کارە تایبەتیەکان دەستنیشاندەکات. ویژدان، دادوەر یان دادگایەکی دەروونیە کە بە یاسای گشتی ئەخلاقەوە داوەری لەبارەی چونیەکی شێوەی ئەنجامدانی کارێکی تایبەت دەکات. وردتر بڵێین ئەگەر ئیدراك (نەك ویژدان) کارێك بە دادپەروەرانە لەقەڵەمبدات،

ویژدانیش دەبێ بەر لە ئەنجامدانی ئەو کارە، لە دادپەروەریبوونی دڵنیا بێت، ئەمەش پێویستی بنەمای بەدیهی ویژدانی ئەخلاقیە. بە دەربڕینێکی تر دەکرێ ویژدانی ئەخلاقی بە هێزێکی دادوەری بناسرێ کە بە تاوتوێکردنی ئەوەی کە ئایا بەڕاستی کارەکانی بەپێی پێویست بە وردی هەڵسەنگاندووە، خۆی داوەری دەکات. لێرەوە بێویژدانی لە کارێکی دیاریکراودا، مانای ئەوە نییە کە کەسەکە ئەو هێزەی نییە، بەڵکو بەو مانایەیە کە لە ئەنجامدانی کارەکەدا گوێی لە حوکمی ویژدان نەگرتووە. بەکورتی ویژدانی ئەخلاقی مرۆڤ ناچار بە ئەرکێکی بێ کۆت و بەند یان بنەمایەکی بێ نیاز بە بەڵگە دەکات کە ئەویش ئەوەیە کە نابێ هیچ کارێك ئەنجامبدرێ کە مەترسی ئەوەی لێبکرێ نادادپەروەرانە بێت. دەبێ هەموو شێوەیەکی گومانکاری بخەینە لاوەو نابێ مەترسی ئەنجامدانی کارێکی نادادپەروەرانە قبوڵبکەین.

مەسەلەی دادوەری تەفتیشی بیروڕا چی لێدێت؟ ئەگەر ئەم دادوەرە بێویژدانی کردووە، واتە گوێی بە حوکمی ویژدانی خۆی نەداوە، کەوابوو چۆن قەزاوەتی کردووە؟ کانت دەڵێ کە پێوەری حوکمدانی دادوەری تەفتیش، باوەڕی بنەڕەتیەتی، ئەم باوەڕە دەرخەری مەزهەبێکی بەڵگەنەویستە وەك کۆمەڵێ رەمزی باوەڕو سروتی تایبەت. مەزهەبی پشتبەستوو بە وەحی، فەرمان بە ئەنجامدانی کۆمەڵێ کار دەکات کە وەك فەرمانی خودایە. بە دەربڕینێکی تر باوەڕی بنەڕەتی ناچارکەرە، بەڵام نەك لەبەرئەوەی کە من ئەو فەرمانانە بێ سێ و دوو بە ئەرکی خۆم دەزانم، بەڵکو لەبەرئەوەی پێشتر تەسلیمی دەسەلاتێکی دەرەکی (خودا) بووم کە فەرمانەکانی تەنها لەبەرئەوەی کە لەلایەن ئەوەوەیە ناچاریە. کاتێك ئەرکی ئەخلاقی بەمشێوەیە دەهێنرێتە پێشێ، دوو کێشە دروستدەکات: لەلایەکەوە ویژدان، چیدی مەرجەعی دیاریکردنی چونیەکی یان ناچونیەکی شێوەی کرداری من و یاسای ئەخلاقی نییە، چیدی دەوری دادوەری نییەو خودموختاری خۆی لەدەستدەدات. کەوابوو کردار لە روانگەی مادیەتی ئەزمونیەوە، تەنها لەبەر نیەتی کەس، واتە بەپێی لایەنە مولزەمەکانی یاسای ئەخلاق کە بە بڕاوە زانراوە، لە ڕووی ئەخلاقیەوە دادپەروەرانەیە، نەك لە ڕووی کردارەوە. کەوابوو مەزهەبی وەحی کە نەك لەبەر ناچارکردنی دەروونی ویژدان بەهۆی یاسای ئەخلاقەوە، بەڵکو بەهۆی فەرمانی بوونەوەرێکی دەرەکیەوە خوازیاری فەرمانبەرداریە، رەچاوکردنی ئەخلاق ناکات بە شتێکی پێویست و یاسای ئەخلاقیش لەبەرئەوە دانانێ کە خۆبەخۆ پیرۆزە. باوەڕی پەتی، کە عەقڵ قبوڵکەرێتی و ویژدانی ئەخلاقی دەستنیشانکەرێتی، دەتوانێ بکەوێتە ناکۆکی لەگەڵ باوەڕی بنەڕەتیدا.

لەلایەکی دیەوە دوو لایەنی دادوەری تەفتیشی بیروڕا، گفتوگۆ لەبارەی پلەی وەحیەوە دەهێنێتە پێشێ، ئەزموون یان مێژوو ناتوانێ بەشێوەیەکی بڕاوە خودایبوونی ئیلهامێك بسەلمێنێ. ناتوانین بە بێگومان لەڕێی وەحیەوە لە هەقیقەتی جەزمیات و سروتە سەقامگیرەکان، دڵنیا بین. لەبەرئەمەشە کە لە دیدی دینی عەقڵانیەوە، حوکمەکانی مەزهەبی وەحی ئیختیاری و گریمانەیین و بە زەرورەت پەیوەندی بەو ئەرکانەوە نییە کە بە حوکمی ویژدانی ئەخلاقی، ناچار بە پەیڕەوکردنین. مرۆڤ ناتوانێ پەی بە خودایی بوونی هیچ تێزێك بەرێت بەهۆی چەمکەکان و توانا عەقڵیەکانیەوە نەبێت، ئەگەرچی ئەو تێزانە بەتەواوی ئەخلاقی بن و جێی گومانیش نەبن. بە دەربڕینێکی دی، دینی وەحی دەبێ بەجۆرێك تەفسیرو لێکبدرێتەوە کە لەگەڵ رێسا عەمەلیەکانی دینی عەقڵی پەتیدا بگونجێ، بۆئەوەی تێبگەین ئەو کارەی دەمانەوێت ئەنجامیبدەین بە

دڵنیاییەوە دادپەروەرانەیە، دەبێ تەنها بگەڕێینەوە بۆ ویژدانی ئەخلاقی خۆمان. ئەو دادوەرەی تەفتیشی بیروڕا کە گیانی مرۆڤێك دەگرێت، تەنها فەرمان لە باوەڕی بنەڕەتیەوە وەردەگرێ (کانت دەڵێ "تەنانەت لەکاتی پێویستدا بە شەهیدبوون): لەبەرئەوە جورئەتی ئەوە دەکات کارێك بە ئەگەری کردنی گەورەترین نادادپەروەریەکان ئەنجامبدات. بەم مانایە دادوەری تەفتیشی بیروڕا بێویژدانی دەکات و ئەو مەترسیە قبوڵدەکات کە بە پێچەوانەی ئەرکی مرۆڤانەی خۆیەوە کە خۆی باوەڕی پێیەتی، کارێك ئەنجامبدات. ئەگەر ئەو بە فەرمانی "پلەکانی بەرزتر لەخۆی" دەست بۆ ئەو کارە بەرێت، ئەوا مەسەلەکە هەر هەمان حوکمی دەبێت. لەم حاڵەتەشدا ویژدانی ئەو، دوا مەرجەعە بۆ داوەری دادپەروەرانە بوون یان نەبوونی کارێك بەشێوەیەکی یەقینی.

کانت بە لێکۆڵینەوەی پەیوەندی نێوان مەزهەبو ئازادی، بەشێوەیەك لە شێوەکان بناغە دانەری رەخنەی مەزهەبیە. تا جەوهەری مەزهەب لەناو باوەڕی بنەڕەتیدا بێت، مەزهەب بەرەو خورافات دەچێت و وەك سوالکردن لە لوتفی خودای لێدێت، کە لەم حاڵەتەدا هیچ بەهایەکی ئەخلاقی نابێت. مەزهەب لەم حاڵەتەدا خەڵکی دەخاتە ژێر کۆنترۆڵی پێشەوایانی کەنیسەوە کە تەنها خاوەندارێکی دەسەلاتن لە بواری باوەڕداو بەسەر دەوڵەتیشدا دەسەلاتیان هەیەو، ئەوان (خەڵکی) لە ئازادی ئەخلاقی بێبەش دەکەن. مەزهەبی وەحی تەنانەت هاوڵاتیان لە ئەرکە مەدەنیەکانی خۆشیاندا بەهەڵەدا دەبات. بە پێچەوانەوە "رۆشنگەران" دەیانەوێت مرۆڤ لەو حاڵەتی منالیە دەربهێنن کە بەبوونی ئەم حاڵەتە ناتوانن بەبێ رێنمایی ئەوانی دی، توانا عەقلیەکانی خۆیان بەکاربهێنن. ئازادی بەکارهێنانی گشتی و ئاشکرای عەقڵ، بۆ گەیشتن بەم مەبەستە، بەسە: بڵاوکردنەوەو پروپاگەندە، رۆشنگەری خەلکیەو ئەو توانایەیان دەداتێ کە فێری ماف و ئەرکەکانی خۆیان ببن لە بەرامبەر ئەو دەوڵەتەی سەریەون، لە هەمانکاتدا فێربن عەقڵی خۆیان بەسەربەخۆ بەکاربهێنن. لێرەوە تاوتوێکردنی گریمانەی ویژدان لە بواری باوەڕی مەزهەبیدا، رەخنەی بەکارهێنانی گشتی و ئاشکرای عەقڵ و هەروەها پێناسی ئازادی هاوڵاتیانیش دەگرێتەوە: روناککردنەوەی هاوڵاتیان نەك هەر بەستراوە بە ئازادی مەدەنیەوە، بەڵکو بەستراوە بە پەروەردەکردنیشیانەوە. (کانت وەڵامی ئەم رەخنەیە کە "ئەوان ئامادەیی پێویستیان بۆ ئازادی نییە" بە نەفی دەداتەوە و دەڵێ ئەم ئامادەبوونە خۆی لە پێشەوە پێویستی بە بەرقەراربوونی ئازادیە).

### دەق

گریمان بۆ نمونە دەبێ دادوەرێکی تەفتیشی بیروڕا کە سەخت پابەندی باوەڕی بنەڕەتی خۆیەتی، تا ئاستی شەهیدبوون لەکاتی پێویستدا، لەبارەی کەسێکەوە داوەری دەکات کە دەگوترێت بێ دین (بەڵام هاوڵاتیەکی باش) و بێ باوەڕە. دەپرسین ئایا ئەم دادوەرە بە حوکمدانی ئەو هاوڵاتیە بە مردن، بە حوکمی ویژدانی خۆی (کە بەڕاستی لە هەڵەدایە) حوکمیداوە یان دەتوانین بە بێویژدانی تاوانباری بکەین، جا چ هەڵەی کردبێ، یان هوشیارانە نادادپەروەری کردبێ؟ چونکە دەکرێ پێی بگوترێ کە لەم حاڵەتانەدا هەرگیز ناتوانیت دڵنیابیت لەوەی کە بە تەواوی دادپەروەرانە کاری کردووە. بەڕاستی رەنگە ئەو لەو باوەڕەدا بێت کە ئیرادەی خواوەند بەشێوەیەکی سروشتی ئیلهامی پێکردوە (رەنگە بەپێی پەندی: ناچاریانکە کە بێنە ژورەوە) ئەوی نەك موکەلەف، لایەنیکەم، رێگەی پێداوە تا بێباوەڕی و بێ باوەڕ، یەکسەر لەناوبەرێت. بەڵام ئایا

بەراستی ئەوەندە باوەڕی بە هەقیقەتی ئەم حوکمە خوداییە کردووە کە جورئەتی ئەوەی کردووە گیانی مرۆڤێك بەمشێوەیە، بسێنێ؟ بێگومان سەندنی گیانی کەسێك لەبەر بیروڕاکانی، کارێکی نادادپەروەرانەیە، مەگەر ئەوەی (ئەگەر بمانەوێت بەرزترین چاوپۆشینی لە بەرامبەردا بکەین) ئیرادەی خوداوەند کە ئەو توانیوێتی بەشێوەیەکی نائاسایی بەتەواوی بناسێت، فەرمانێکی جیاواز لەوەی پێدابێت.

بەڵام ئەوەی کە خوداوەند هەرگیز وا ئیرادەی کردبێ، تەنها پشتبەستووە بە بەڵگە مێژووییەکان و بەهیچ شێوەیەك بەڵگەنەویست نییە. حوکمەکانی وەحی لەڕێی مرۆڤگەلێکەوە بەو گەیشتووەو ئەوانیش تەفسیریان کردووەو لێکیان داوەتەوە. بەڵام ئەو وای دادەنێ کە گوایا ڕاستەوخۆ لەلایەن خوداوە بۆ ئەو هاتۆتە خوارێ (وەك ئەو فەرمانەی کە بە ئیبراهیم گەیشت بۆئەوەی کوڕەکەی وەك مەڕێك سەربڕێ). لایەنیکەم ئەگەری ئەوە هەیە کە هەڵەیەك ڕوویدابێ، بەڵام لەم حاڵەتەدا ئەو (واتە دادوەر) مەترسی ئەوە قبوڵدەکات کە باڵاترین پلەی نادادپەروەری ئەنجامبدات و دروست لەبەر ئەمەشە کە بێویژدانی دەکات. حوکمی مەسەلە لەبارەی هەر باوەڕێکی پشتبەستوو بە مێژوو یان نائاساییەکی دیش هەر ئەمەیەو، لەڕاستیدا هەمیشە ئەگەری هەڵە لەناویاندا هەیە، بەسەرنجدان لەوەی کە ڕەنگە ئەوەی ئەم باوەڕە دروستیدەکات یان ڕێگەی پێدەدات نادادپەروەرانەیە، واتە بە پێچەوانەی ئەرکی مرۆڤانەوەیە کە دڵنیایە، ئەم هەڵانە دەرئەنجامی سەرپێچیکردنە لە حوکمی ویژدان، نەك فەرمانبەرداری لە ویژدان.

لە سەرو ئەمەشەوە ئەگەر ئەو کارەی کە پاسای بەڵگەنەویستی وەحی فەرمانی پێداوە، خۆبەخۆ موجاز بێت، ئەو پرسیارە دێتە پێشێ کە ئایا بەرپرسیارە گەورەکان یان پێشەوایانی ڕۆحانی دەتوانن بە پشتبەستن بە باوەڕەکانی خۆیان، وەك مەرجی بوونی باوەڕ (کە ئەگەر ڕەچاو نەکرێت، باوەڕ چۆنایەتی خۆی لەدەستدەدات)، بەسەر خەڵکیدا بیسەپێنن؟ چونکە باوەڕێکی لەمچەشنە تەنها پشتی بە هۆ مێژووییەکان بەستووەو لەکاتێکدا کە بەپێی داوەری خەڵکی (لایەنیکەم ئەگەر خۆیان تاوتوێی بکەن) هەمیشە ئەگەری ئەوە هەیە کە هەڵەی تیا ڕوودابێ، وەك چۆن لە بەیانی کلاسیکی باوادا ڕوویداوە، ئەشە خەڵك ناچار دەکات لایەنیکەم لە دەروونی خۆیاندا دان بە شتێکدا بنێن کە بڕوایان وایە بە ئەندازەی باوەڕبوون بە خودا، هەقیقەتی هەیە. واتە بە دەربڕینێکی تر لە بەرامبەر خوادادا دان بە شتێکدا بنێن کە بێگومان بەو شێوەیە نایناسن: وەك قبوڵکردنی ڕۆژێکی دیاریکراو بۆ عیبادەت وەك کارێکی مەزهەبی کە خودا خۆی ئەمری کردووە، یان بڕوابوون بە سمبولگەلێك کە سەری لێدەرناکەن. لەم حاڵەتانەدا، پلەی ڕۆحانی باڵاتر لەوان، بە سەپاندنی بڕوایەك بەسەر ئەوانی دیدا کە خۆی هەرگیز بڕوای بەو باوەڕە نیە، بە پێچەوانەی ویژدانی خۆیەوە کاری کردووە. لەبەرئەوە دادپەروەریی ناچارمان دەکات لەبارەی ئەو شتەوە بیربکەینەوە کە ئەنجامی دەدات، چونکە دەبێ وەڵامدەرەوەی کۆی توندڕەوییەکانی باوەڕێکی وا کوێلانە بێت، ڕەنگە هەقیقەتێکیش لەو شتەدا هەبێت کە باوەڕیان پێیەتی، بەڵام لە باوەڕیاندا (یان لەو دانپیانانەی لە دەروونی خۆیاندا دانی پیادەنێن) ئەگەری هەڵە هەیە، هەڵەیەك کە شایستەی مەحکومکردنە.

## سەرچاوە

ژۆلی سادا– ژاندرون: تساهل در تاریخ اندیشه غرب.
ت: عباس باقری– تهران: نشر نی 1378

# وێستگەکانی سەردەم












- جیهان ئێستا چی ئەخوێنێتەوە
- میتۆدەکانی توێژینەوەی زانستی
- لۆ ئەندریێ سالۆمێ یان عیشقی ئەستەم
- ئەلبێر کامو

# جیهان ئێستا چی ئەخوێنێتەوە؟

## دە کتێب بە ملیۆنەها دانەی لێفرۆشراوە

● و.ئا: هەڵگورد عارف مەحمود

ئێستا ئەم جیهانە چی ئەخوێنێتەوە؟ بەناوبانگترینی ئەو کتێبانە کامانەن؟.. کامەیان لە هەموویان زیاتری لێفرۆشراوە؟

(لەدوای جیهانەوە) (باوکی هەژار و باوکی دەوڵەمەند.. هەریەکەیان چی فێری رۆڵەکانیان ئەکەن؟) (بەڵگەی کچان بۆ راوی پیاوان) و (کێ پارچە پەنیرەکەمی جولاند؟)..

ئەمانە هەمووی ناونیشانی چەند کتێبێکن لە ناونیشانە گەرموگورەکانی سەد کتێب کە دەزگای (ئامەزون- Amazon) لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت پۆلێنی کردوەو بە ملیۆنەها دانە هەریەکەیان لە ساڵانی 2000 و 2001دا لێفرۆشراوە.. لێرەدا دە کتێب لەو سەد کتێبە هەڵدەبژێرین کە بەرای زوربەی ناوەندو دەزگاکانی بڵاوکردنەوە لە هەموو ناونیشانەکان سەرنجراکێشترە.. من لێرەدا بە کورتی باسی یەکەیەکەیان ئەکەم بۆ ئاشکراکردنی ئەو نهێنیانەی بونەتە سەرنجراکێشانی خوێنەواران:

***یەکەم:*** لەدوای جیهانەوە- The Other Side And Back

ئەم کتێبە گەرەکێتی وەلامی چەند پرسیارێك بداتەوە:

فریشتە چیە؟ دوای مردن چیمان بەسەردێ؟ ئایا خێوو جنۆکە هەن؟.. ئەگەر هەن چین؟.. بێگومان مرۆ ئەزانێت چۆن گوێی لە دەنگی ناخی خۆیو هەستەکانی دڵی ئەگرێت نەك تەنها بۆ ئەقڵی زانیاری و لۆژیك بۆ ئەوەی هەست بە بوونی فریشتە بکات.

ژنە نووسەر (سیلفیا براون- Sylvia Brown) لە جیهانی گیانەوە دەڕوانێتو دەڵێت: ئەم جیهانە بەو شێوەیە لێمان دوور نیە کە ئێمە وای باوەڕ پێئەکەین.. چارەسەرێك بۆ گاڵتەپێکردن بە جیهانی رۆحی دائەنێین کە رۆژانە توشی هاتوینو بەدوای راستیەکاندا لە رەهەندی چوارەمدا ئەگەڕێین.. ئەمەش ئەگەری ئەوە ئەخاتە بەردەم

زۆرینە کە ژیانێکی تر لەدوای مردنەوە هەیە.. بەتایبەت بۆ ئەوانەی بڕوایان بە زیندوبوونەوەی دوای مردن نیەو.. دەڵێت: ئەمانە تەنها چیرۆکی منالان نین.. ئەم بابەتە ڕێزی تایبەتی لە بواری زانیاریشدا هەیەو شایانی ئەوەیە بە هۆشمەندی گفتوگۆو لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت بەبێ گاڵتەپێکردن و سوکایەتی بەم هزرانە.

یەکێك لە ژنە خوێندەوارەکان دەڵێت: ئەم کتێبە لەکاتێکی ناسکی ژیانمدا یارمەتی تەواوی داوم.. هەرچەندە دانەرو نووسەری ئەم کتێبە ئاگاداری ئەوەی نەکردوم کە چی بکەم.. بەلام ئازایەتی پێبەخشیم بۆئەوەی چی باش و گونجاوە ئەنجامی بدەم و باوەڕی تەواو بە (حدس)ی تایبەتی بهێنم.

نووسەر وای لە ملیۆنەها خوێنەر کردوە باوەڕی تەواو بە وزەی گیانی (الطاقة الروحية) بکەن و بەشێوەیەك کاربکاتە سەر ژیانی ڕۆژانەیان کە باوەڕیان بەهێز بکات، ئەقل و لەشیان چاکبکاتەوەو فێرببن چۆن بە دڵخۆشیەکی گەورەتر بژین بۆ گۆڕینی شێوازی ژیانیان بەرەو باشتر لە هەموو بوارێکدا.. چ لە بواری کارەکانیاو چ لە پەیوەندیە تایبەتیەکانیداو چ لە پەیوەندی بە ڕۆژی دوایی، واتە دوای مردن کاتێك کە زیندو ئەبێتەوە، لە کۆتاییدا (براون)ی دانەری کتێب هاوار ئەکات نەکەن بترسن لە تەمەنی درێژو لە پیری..

*دووەم:* باوکی دەوڵەمەندو باوکی هەژار– Rich Dad.. Poor Dad..

باوکی دەوڵەمەندو باوکی هەژار هەریەکەیان چی فێری منالەکانیان ئەکەن؟ بێگومان جیاوازی هەیە.. هەردوو دانەری ئەم کتێبە:

(روبرت کیوساکی– Robert T. kiyosaki) و (شارون لیتشر– Sharon L. Lechter) جەخت لەسەر ئەم بابەتە ئەکەن.. روبرت تێڕوانینی دانسقەی خۆی بەرەو پێش ئەبات لەمیانەی دەرخستنی دوو نمونە کە کاریگەرێتی جیاوازو جیاجیای هەیە.. لەسەر باوکی کە دەرچووی خوێندنی بالایە بەلام باری ئابووری چەسپاو نیەو باوکی یەکێك لە هاوڕێ نزیکەکانی کە خاوەنی ملیۆنەها دۆلارەو بەلام تەنها تا پۆلی شەشەمی سەرەتایی خوێندوە.

کێشەو ڕەخنە هەمیشەییەکانی کە باوکە هەژارەکە بەسەری هاتوە کە بودجەو توانا مادیەکانی هەرگیز بەشی پێداویستیەکانی خێزانەکەی نەکردوە ئەوەش بوەتە هۆی ئەوەی کوڕەکەی وا هەست بکات کە چینی هەژارو ناوەڕاست هەموو هەوڵەکانیان تەنها لەپێناو پەیداکردنی پارەیە.. لەکاتێکدا پارەو سامان لە خزمەتی چینی دەوڵەمەندایە..

ئەم نامەیەی خستە قوڵایی دڵییەوەو دروشمی کتێبەکەی کرد بە:

ڕێگا بدە پارە لەپێناوتا کاربکات لەجیاتی ئەوەی تۆ للەپێناو پارەدا کاربکەیت و گەرەکێتی ئەم دروشمە بگەیەنێتە نەوەکانی ئایندە لەگەڵ ئەوەی لە ئەنجامی خوێندن لە قوتابخانە فێری ئەبن تا بگەنە بارێکی مادی باش و لەبارو چەسپاو.

روبرت دەڵێ: من پەژارەی ئەوەم ئەو بۆشاییەی نێوان ئەوەی لەگەڵمدایەو بۆ من لەبارەو ئەوەی لەگەڵمدا نیەو بۆ من لەبار نییە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لە فراوانبوندایە.. روبرت وای ئەبینێ درێژەدان بە فەرمانپێکردنی منالان کە بخوێنن و کۆشش بکەن و پلەی بەرز لە خوێندندا بەدەست بهێنن و بەسەرکەوتویی تەواوی بکەن و پاشان لەسەر کارێك دامەزرێن.. ئەمە ترسناکترین فەرمان و ڕێنماییە کە باوك بە منالەکەی خۆی بڵێت.. ئەگەر منال گوێ ڕایەڵی ئەم فەرمان و ڕێنماییانە بێت لەوانەیە

کارێکی ناپەسەند و پڕ ماندوویی و پسپڕ گرفتـی دەستکەوێت و مووچەیەکی کەمی بەدواوە بێت..

روبرت دریژە بە رێنماییەکانی دەدات و دەڵێ: باشتر وایە منداڵەکەت فێری ئەو بنەمایە بکەیت کە دەوڵەمەندەکان گەمەی پێدەکەن و کە جیاوازی هەیە لەگەڵ بیروبۆچوونە ساکارەکانمان.. دانەر چەند هۆزێك پێشکەش دەکات کە دڵنیاییەکی ئابوری باش و گەورەی تێدایە بۆ نەوەکانی ئایندە..

نووسەری پارمەتیدەر (شارون لیشـر) دەڵێ: من گەرەکمە منداڵەکان باشترین خوێندن بخوێنن و چاکترین زانیاری وەربگرن.. بەلام قوتابخانە کلاسیکی و ترادیسونیەکان ئەم خەون و ئاواتەی من ناهێننە دی.. لای من زۆر گرنگە منداڵەکانم ئەوە بزانن پارە چۆن کاردەکات و چۆن دروستی دەکەین و تەنانەت چۆن پەیدای دەکەین و دەیخەینە پرۆژەکانەوەو.. چۆن لەپێناویاندا کاردەکەین لەجیاتی ئەوەی لە دژمان کاربکات و.. چۆن منداڵەکان رابهێنین یەکەم هەنگاو بنێن بەرەو سەربەستی ئابوری.. هەروەها چۆن لە پێشبڕکێی گورگەکان هەڵبێن و خۆیان رزگار بکەن بەرەو رزگاری مادی.

سێیەم: بەڵگەی کچان بۆ راوکردنی پیاوان- The Girl's Guide to Hunting and Fishing

لەم کتێبەدا بەشێوەیەکی گاڵتەجاڕی چیرۆکی ژنێکی مۆدێرن ئەخوێنینەوە کە لە هەوایەکی درامیدا بەدوای دڵداریدا وێڵە.. نوسەرەکەی ژنە نووسەر (میلیسیا بانك- Melissa Bank) وای لە پاڵەوانی چیرۆکەکەی (جان روزینال) کردوە کە تەمەنی تەنها 14 ساڵە بەلام تەمەنی تێگەیشتن و ئەقل و زانیاری و ئاگادارییەکانی و نهێنییەکانی ژیان لەو تەمەنە زۆر زیاتر بێت. لە هەمان کاتدا روانگە لەسەر براکەی و خۆشەویستی براکەی دائەنێت کە وێڵی گەڕان بوون بەداوی کلیلی کردنەوەی تەلیسمی توش هاتنیان بەدوای ئەو دڵداریە قوڵ و پتەوە.. هەوڵی بێوچانی دا تا بگاتە نهێنی ئەوەی بزانێت چۆن لە دڵداریدا ژیرکەوتو و دۆڕاو نەبێت وەك لە براکەی روویدا..

لە بەشەکانی تری ئەم کتێبەدا دانەر بەشێوەیەکی ژیرانە رێگای بەم کچە تازە پێگەیشتوو منداڵە دا کە پێشبکەوێت و پێبگات و هەوڵ بدات پەیوەندی گیانی لەگەڵ کەسێکی شیاو پەیدا بکات و لەدواییدا ببێتە هاوسەری. دوای ئەوەی کاری لە بواری چاپ و پەخشی رۆژنامەدا دەستکەوت.. پەیوەندی بەست لەگەڵ نووسەرێك کە بەتەمەن لەخۆی گەورەتر بوو..

دانەری کتێب ئەم کەسایەتیەی ئەم نووسەرەی وا پیشان دا کە یارمەتیدەرو هاوکاری جان روزینالە بۆئەوەی لە کارەکەیدا قاڵ بێت و پێشبکەوێت.. لە هەمان کاتدا وردە وردە پەیوەندی خۆشەویستی لە کارکردندا بوو.. بەلام کاتێك جان بەوەی زانی باوکی توشی نەخۆشی (لوکیمیا) بوە، لەو نووسەرە دورکەوتەوەو پەیوەندی لەگەڵیدا بچڕاندو کەوتە خزمەتکردنی باوکی.

لە بەشی کۆتایی ئەم کتێبەدا دانەر باس لە بنەما سەرەکیەکانی مانۆڕو پێچ و پەناکانی راوکردنی پیاوان ئەکات لەلایەن کچان و ژنانەوە بەشێوەیەکی گاڵتەجاڕی.. چۆن ژنان هەندێك جار ناچار ئەبن هەندێ رەفتاری سەیری وا بگرنە بەر لە سروشتی رەوان و کراوەی خۆیان دووربکەونەوە بۆئەوەی بگەنە کۆتاییە گەرمو نەرمەکان..

دانەر پاڵەوانێکی ژنی روخۆش و کراوەی خولقاندوە کە شایەنی ئەوەیە بەختیاری و خۆشی دەستکەوتی بێت..

لەمیانەی چیرۆکەکەیدا چەند وانەیەک پێشکەش ئەکات بە ژنان و کچان کە چۆن ئەفسون و لاوازیی و ژیریی لەکاتی پێویستدا تێکەڵ بە یەک بکەن.

چیرۆکەکە پلە پلە پاڵەوانەکەی لە قۆناغی هەرزەکاری بۆ قۆناغی کچێکی کارمەند کە خۆی ئادات بەدەستەوەو بۆ تافی لاوی و قۆناغی پێگەیشتن.. کاتێک ئەتوانێت مانۆڕ لە ململانێکاندا بکات و پێچوپەنا بەکاربهێنێت لە بواری خۆشەویستی و پەیوەندییە گشتیەکانداو بە ئاسانی خۆ قوتارکردن لەو مەترسیانەی لەکاری ڕۆژانەدا لە شوێنی کارەکەی بەرەنگاری دەبێتەوە.

***چوارەم:*** کێ پارچە پەنیرەکەمی جوڵاند؟ Who Moved My Cheese?...

ڕێگایەکی سەیرو جوان بۆ هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەو گۆڕانکاریانەی لە کارو ژیانماندا دێتە گۆڕێ.. هەردوو دانەری ئەم کتێبە:

(سبنسر جونسون– Spencer Johnson)و (**کینیپ بلانشارد**– Kenneth Blanchard) کە هەر زوو دەرکیان بەو پێویستیانە کرد بۆ دۆزینەوەی زوبان و ئامێرەکانی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ گۆڕانەکاندا.. ئەمەش کێشەیەکە هەموومانی بێ ئارام و بێ وزە کردوە.. زۆربەی خەڵکی لە گۆڕان سڵ ئەکەنەوە.. لەبەرئەوەی باوەڕیان وایە کە ئەوەیان نییە چۆن و؟ کەی؟ گۆڕانکاریەکان بەرەو ڕوویان دەبێتەوە..چ بە ئیرادەی تاکە کەس و چ بە بێ خواستی و بەدەر لە دەسەڵاتی.. دانەر لەم بارەیەوە دەڵێ: دەبێ هەڵوێستی ئێمە چی بێت دوای ئەوەی کەوتینە ساڵی 2000 وەو هەموو ناوەندەکانی کار لە کۆتاییدا دان بەوەدا دەنێن کە ئامێرەکانی ژماردن و ژمێریاری و ڕژێمی کارەکانی تریان هاوتای خێرایی و سەردەمی خێرا بێت و هاوتەریبی گۆڕانکاری پێشوەخت بێت.. لەبەرئەوە ئێمە پێویستیمان بە هاوکاری و یارمەتی خەڵکی هەیە بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ جیهانێکی هەمیشە گۆڕاو کە بەتایبەتی خەڵکی بەرەنگاری گۆڕان ئەکەن و هەندێ جاریش گیانی خۆیان لەو بەرەنگاریەدا بەخت ئەکەن بۆ ڕونەدانی.. بۆیە ئەم کتێبە نوسراو و دانرا.

ئەم کتێبە چیرۆکێکی ساکارمان پێشکەش ئەکات کە نامەیەکی گرنگی تیادایەو بەشێوەیەکی بنەڕەتی ڕێگاکانی هەڵسوکەوت و ڕەفتارمان لەگەڵ گۆڕانکاریەکاندا بۆ ڕێکدەخات و ترس و هەڵچون لە ناخماندا ئەڕەوێنێتەوە بۆئەوەی بتوانین سەرکەوین بەسەر ترس لە نادیارو بە پشت ئەستوری پێشوازی لە گۆڕان بکەین و بیکەینە زانیاریەکو ئەزمونێکی پۆزەتیف.. چونکە پێویستیمان بە هەندێک پاڵنەر هەیە بەرەو دۆزینەوەی پارچەیەک پەنیری نوێ (کاری نوێ) بۆ ڕەوینەوەی دڵەڕاوکێ و دوودڵی لەوەی کام ڕێگا باشترە بیگرێتە بەر لە کارەکانیدا.. دانەر باس لەوە ئەکات چۆن بەهێمنی و لەسەرخۆیی و ڕاستگۆیانە هەڵسوکەوت لەگەڵ گۆڕانکاریەکانی ژیاندا بکەین وەک مردن و لەدەستدانی یەکێکی خۆشەویست و جیابونەوەی ژن و مێردو پەرێشانی بەدەست بەدمەستی یان جگەرەکێشان و ئەخۆشی درێژخایەن و زۆر شتی تر.

***پێنجەم:*** خۆشەویستی خودا (یەزدان)– For the Love of God

ئەم کتێبە باس لە (25) کەس لە بەناوبانگترین بیرمەندە ڕۆحیەکان (مفكر روحي) لە جیهاندا دەکات کە خوداوەندیان خۆشویستوەو.. تێڕوانین و بیری تایبەتیان ڕون ئەکاتەوە

دەربارەی ژیرێتی و نهێنییەکانی ئەم گەردونە.. ئەمانە دەنگی هەست ناسکی و سۆزو ئیلهامی جۆراوجۆرن، لەوانە:

دایکە تریزا، رابی هارلود کوشنەر، هیوبرازر، بروک ئیجل و دالای لاما.. هەموویان یەك نامەی تەباو سازو گونجاو دروست دەکەن بۆ دۆزینەوەی خودا لە ناخ و دەرونی مرۆڤدا و چۆن لە ژیاندا بگەڕێتەوە بۆ بەها بەرزەکان و بە بیرو هۆشیدا بێتەوە کە ئەو کێیە؟ هەست بە ئاشتی و ئارامی بکات و بەرچاوی رون بێتەوە.. ئەم کتێبە ئاراستەی مرۆڤ کراوەتەوە، هەموو مرۆڤێك لەسەر چ ئاین و بروایەك بێت بۆئەوەی بزانێت کە کرۆکی خۆشەویستی خۆشەویستی یەزدانەو.. هەست بەوە بکەین کە پێویستی زۆرمان لەم چاخەماندا بە باوەڕی گیانی هەیە.. جەخت لەسەر زەمینەیەکی پتەوی هاوبەش بکەین لەنێوان ئاینی رێکخراو و گیانی کەسایەتیدا..

یەکێك لە دانەرەکانی ئەم کتێبە کە (ریشارد کاریسون- Richard Carison)ە دەڵێ: لای من کلیلی پەرەسەندنی گیان و هوشیاری لەبەردەم یەزداندا تێگەیشتنی ئەوەیە کە ئێمە لەم جیهانەدا بۆ ئەوە پەیدابوین کە بەدوای رژێمێکی نوێدا بگەڕێین.. لەجیاتی ئەوە پێویستە بگەڕێین بۆ دۆزینەوەی ئەو رێگایانەی ئەبنە هۆی راچڵەکین و بە ئاگاداربونەوەی ناخە راستیەکانمان.

*شەشەم:* کچانی جیشا- Tiemoris of a Jeisha

ئەم کتێبە باسی کورتەی بیست ساڵ لە ماوەی بەشێك لە مێژووی یابان ئەکات کە بە سەیرترین و هەڵچوترین ماوە دائەنرێت لەپێش دەستپێکردنی جەنگی جیهانی دووەم.. کە جیهانی شاراوەی سێکس و جوانیو ئەفسونو گەندەڵی بە تێکەڵاوی ئەخاتەڕوو..

زانیاریەکان دەربارەی رۆشنبیرییەکی جیاواز ئاشکرا دەکات..

دانەری کتێب (ئارسەر جولدین- Arther Golden) دەڵێ: وشەی (جیشا) واتای (سۆزانی و بەدڕەوشت) ناگرێتەوە وەك رۆژئاواییەکان لە ئەزانینەوە گریمانی ئەوەیان هەیە.. بەڵکو واتای (هونەرمەند) و (دروستکەر) ئەگرێتەوە.. کچی جیشا پێویستە ژیرو زیتەڵە بێت.. هونەرەکانی مۆسیقاو سەماو گۆرانی بزانێت و سەری لێدەرکاو سەرو زوبانی خۆش و شیرین بێت و هەمیشە ئامادەی چونە ناو کۆڕی جەنگی فێڵاوی و ئەفسوناوی بێت بەرامبەر ململانێکەرەکانی لە ژنە شۆخ و جوانەکانی بەرامبەری.. لە ماوەیەکی دوور و گراندا قاڵی کارەکەی و هەموو زانیاریەکانی بنەمای کەشە گرێدراوەکانی ئەم کارو هونەرە ئەبێت.. دانەر زانیاری تەواوی لەسەر هونەرو مێژووی یابان هەیە.. لەدواییدا بوە هاوڕێ لەگەڵ پیاوێکی یابانی کە کوڕی کابرایەکی دەوڵەمەندو بەناوبانگەو کاتی خۆی دایکی یەکێك بوە لە کچانی جیشا.. ئەم پەیوەندی و هاورێیەتیە کە زیاتر لە دە ساڵی خایاند وردو درشتی هەموو نهێنیەکانی کەلەپووری جیشای بۆ ئاشکرا کرد لەمیانەی چیرۆکی کچە سەماکەرێکی یابانی کە لە بەناوبانگترین کچانی جیشا بوو لە سەدەی بیستەمداو ساڵانێکی دوورو درێژ زۆربەی دەوڵەمەندو ناودارەکان و ئەستێرەکانی کۆمەڵی یابانی عەودال و ئەفسوناوی کردبو.. چیرۆك و بەسەرهاتی تەواوی خۆی گێڕاوەتەوە لە رۆژی لەدایك بونیەوە لە لادێیەك کە خەریکی راوە ماسی بوون لە کەناری دەریا لە ساڵی 1929داو هەتیوبوونی و دەستپێکردنی کاری کچی جیشا لە تەمەنی هەرزەکاریەوە تا بووە

دڵدارو خۆشەویستی یەکێك لە هەرە ناودارو دەسەڵاتدارەکان و تا هێنانەدی هەموو خەونەکانی.

دانەر بە شێوازێکی ناسك و جوان ئەمانخاتە ژوورو هۆڵە ناودارەکەی چیا خواردنەوەی کچانی جیشا تا بزانین چۆن رۆژانە رەفتار ئەکەن و چۆن ئەژین.. وامان لێدەکات بچینە ئەو جیهانە داخراوەو بێگانەیە بە روحمان بۆ زانین و گوێ لێگرتنی باس و خواسێکی بە ئێمە نامۆ.. رۆشنبیریەکی لە ئێمە دورو جیاواز..

**حەوتەم:** هونەری بەختیاری– The Art of Happiness

کتێبەکە دەربارەی ژیانە.. نوسەرەکەی (دەلای لاما)یە کە سەرۆکی رۆحیو جیهانی گەل و وڵاتی (تیبت)ە.. فەیلەسوفێکی بوزیەو خاوەنی خەڵاتی (نوبل) ە لە بواری ئاشتیدا و هەڵگری برێکی گەورەیە لە ناخی پڕ لە ئاسودەیی و ئاشتی ناوخۆی و دەرونی.. ئایا بەیادتا هاتوە رۆژێك لەگەڵ دەلای لامادا دانیشیت و چەند پرسیارێکی دەربارەی ژیان ئاراستە بکەیت؟.. بۆچی ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی بەختەوەر نین؟.. چۆن بەرامبەر تاکایەتی و جودایی و گۆشەگیری ئەجەنگین؟.. چۆن کێشەکان سووك ئەکەین؟.. ئایا خۆشەویستی رۆمانسی خۆشەویستیەکی راستەقینەیە؟ چی ئەچێژین و چۆن رەفتار لەگەڵ جەورو قین و تورەیی و نارەزایی ئەکەین؟ چۆن چارەسەری کارەساتی مردن و لەدەستدانی ئازیزان ئەکەین؟..

ئەم پرسیارانە هەمووی چەند تەلیسمێك پێك ئەهێنێت و وەك دۆکیومێنتێك ئەخرێنە بەردەم دکتۆری دەرونناسی (هاوارد کتلر) کە چەند دانیشتنێك و چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ دالای‌لاما ئەنجامداوە بۆ ناسین و شارەزا بوون لە هونەری بەختیاری.

لە سەرەتادا وەڵامەکانی دالای لاما ساکارو بێگرێیە.. بەڵام لەڕاستیدا زۆر قوڵ و پڕ مانایە.. وەك: لەوانەیە هەندێ جار دوژمنەکانمان ببنە چاکترین مامۆستا و رێنیشاندەرمان.. دڵفراوانی و بەزەیی و ئاشتی و ئەقڵیان پێیە.. کتلر دەڵێ: هەندێك کەس لە رواڵەتدا وا دیار ئەکەون کە بەختەوەر بن لەبەرئەوەی ملك و ماڵ و پارەی زۆریان هەیە.. بەڵام لەڕاستیدا ژیانیان پڕە لە ئەندێشەو کێشەو ناخۆشی و رەشبینی.. کەواتە هونەری بەختیاری پێویستی بە لێکۆڵینەوەو ئەزمون و کرداری هونەریی و بەهرە هەیە..

دالای‌لاما خاوەنی رویەکی خۆش و دڵێکی ساف و زەردەخەنەیەکی پرشنگداری سەر لێوەو هەندێك جار پێکەنین لە ناخی دڵی دێتە دەرەوەو دڵنیاییو بەختیاری بە دەوروبەری خۆیدا پەخش دەکات بەوپەڕی ساکاریو بێگەردییەوە.. زیاتر گفتوگۆی ئەم کتێبە تەوەرەکەی لەسەر ئەو بابەتە بوو کە ئایا چۆن روکەشەکانی هزری (بوزی) ئەتوانێت یارمەتی ئەوانە بدات کە لەسەر باوەڕو ئاینی بوزی نین بۆ گەیشتن بە هەستیاری و دەستکەوتە روحیەکان.. گفتوگۆکان ماوەی درێژیان ئەهێناو ئەبرد لەنێوان هزری رۆژهەڵاتی و هزری رۆژئاوایی.. کتلر پرسیاری لە دالای لاما کرد.. ئایا تۆ بەختیاری؟ وەڵام: بەڵێ.. پرسیار: ئایا هەرگیز هەستت بە تەنیایی کردوە؟ وەڵام: نەخێر هەرگیز.. بۆ روون کردنەوەی زیاتر لەسەر پرسیارەکە درێژەی بە وەڵامەکەی دا: هەمیشە من بەشێوەیەکی پۆزەتیڤانە ئەڕوانمە خەڵکی، هەستم پاك و جوانە بەرامبەریان و پەیوەندیم بە هەموویانەوە باشە جا ئەو خەڵکە خاوەن بیروباوەڕو ئاین بن یان نا.. ئێمە مەبەستی سەرەکیمان

لە ژیاندا بەختیاریە.. چالاکی هەموو بزوتنەوەییەکمان بۆ بەختیاریە.

ئەم کتێبە نەك ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە کە رێگاکانی بەختیاری بگرینە بەر بەلکو هانمان ئەدات کە فێربین چۆن ناخۆشی.. دوودڵی و دڵەڕاوکێ.. دڵتەنگی رۆژانە.. بێباوەڕیی و بێ متمانەیی.. دڵ پیسی و رق و کینەو رەگەزپەرستی و ناوچەگەری و ئایینگەری لە خۆمان دووربخەینەوەو رەگو ریشەی لە ناخ و دەروونمان دەربهێنین.

*هەشتەم:* نهێنیەکانی ملیۆنەرەکانی ئەمریکا– The Millionaire Next Door

(ملیۆنەرەکان لە تەنیشتمانەوەن) یان (نهێنیە کتوپڕەکانی ملیۆنەرەکانی ئەمریکا) کتێبەکە لەلایەن هەردوو نووسەری ئەمریکی:

(توماس ستانلی– Thomas Sttanley) و (ویلیام دانکو– William D. Danko)وە دانراوە بۆ وەلامدانەوەی ئەم پرسیارانە.. دەولەمەند کێیە؟ چی ئەکات؟ چی دەکرێت؟ چۆن پارەکانی دەخاتە گەڕوکار؟ چۆن وا دەولەمەند بوو؟ ئایا تۆش ئەتوانیت رۆژێك لە رۆژان ببیت بە یەکێك لەمانە؟

هەردوو دانەر کە زیاتر لە بیست ساڵ خەریکی چاوپێکەوتن و پەیوەندی بوون لەگەڵ ئەندامانی یانەی پالاوتەی دەولەمەندەکان دەڵێن: ئەمە کارێکی ئاسانە، تۆ تەنها ئەوەت لەسەرە پەیڕەوی ئەم حەوت بنەمایە بکەیت.. بنەمای یەکەم: پێویستە هەولبدەیت هەمیشە ژیانێکی باش بژیت بەگوێرەی ئەوەی هەتەو لەبەردەستایە و بۆت لواوە..

دوا بنەماش ئەوەیە کە ئیش و کارو کاسبیت بە شێوەیەکی ژیرانە هەلبژێرەو دوو دڵ و پەلەکەر مەبە.. کتێبەکە قورسی ناخاتە سەر گۆرانیبێژو ئەکتەرو وەرزشکارە ناودارە دەولەمەندەکان.. بەلکو باس لە پیشەسازو بازرگانەکان و ئەوانەی خۆیان خۆیان پێگەیانبێت دەکات.. هەردوو دانەر روونی ئەکەنەوە کە سەروەت و سامان پەیداکردن چ کارێك و هەوڵ و تەقەلاو شەونخونی و ماندوو بوون و خۆراگری دەوێت.. کە لە وزەی هەموو کەسێکدا نییە.. ئەمانە جۆرە کارو شێوازێکن لە کار لەگەڵ سروشتی کۆمەلگایەك ناگونجێت کە دەستبلاو بێت و ئەندامەکانی بەبێ هۆی ماقوڵ پارەو سامان بەهەدەر و فیڕۆ بدات.

ئەم دوو دانەرە لەدوای لێکۆڵینەوەی چڕوپڕ گەیشتنە ئەو باوەڕەی کە ئەم ملیۆنێرانەی بە کارو خەبات و ماندو بوونی خۆیان گەیشتونەتە ئەم پلەوپایەیە کە هاوشێوازی ژیانیان بەشێوەیەکە چاوەڕوان کراو نییە.. زۆر ساکارو کەمتەرخەمن بەرامبەر خودی خۆیان نە گرنگی دەدەن بە جل و بەرگیان و نە ئەمستیلەی زێڕو ئەلماس لە پەنجە ئەکەن و لەڕاستیدا هەر خۆیان نرخ و بەهای تەنها یەك دۆلار ئەزانن بە روکەش دەرناکەون و لە تاریکیدا دەژین. هەروەها بۆیان دەرکەوت کە زوربەی ئەم ملیۆنێرانە لە گەڕەکی ناودارو لە کۆشکی زەبەلاح و دیاردا ناژین.. بەلکو ئەوانەی لە گەڕەك و ناوچە مۆدرینەکاندا دەژین ئەو جۆرە خێزانانەن کە لە دەولەمەندیدا لە خوار ئاستی ملیۆنێرەکانەوەن.

*نۆیەم:* خوێندنەوەی خەلکی– Reading People

چۆن لە خەلکی تێدەگەیت و رەفتاریان دەزانیت لە هەر ساتێك و لە هەر شوێنێك بیت؟ ئەم پرسیارە هەردوو نووسەر:

(ئالان دیمتریس– Jo- Ellan Dimitrius) و (مارك مازاریلا– Mark Mazzarella) وەلامی

ئەدەنەوە ئەم دوو دانەرە جەخت لەسەر راستیەك دەكەن كە سیاسەتمەدارەكان لەكاتی لێدوان و قسەكردنیان لەبەردەم جەماوەر یان لە تەلەفزیۆندا كە پرتەپرتیان بە چاویان كرد ئەوە یەكسەر بزانە كە درۆ دەكەن و قسەو بەڵێنەكانیان لە راستیەوە دوورە. بەڵام ئاراستەكانی تری خەڵكی چیە كە لە كاتی بێ ئاگایدا ئەیكەن؛ چ لە جوڵاندنی لێو و پێڵوی چاو و دەستەكان بەتایبەتیش جوڵاندنی پەنجەكان.. ئالان دەڵێ: ئەو هەموو شتانە ئاوێنەی دەركەوتنی هزرو رەفتاری خەڵكیە..

ئەم دانەرە لە زیاتر لە (600) دادگاییدا پرسی لێكراوە بۆ ئاشكراكردنی رەفتارو هزرو جۆری كەسایەتی گومان لێكراوان بەتایبەتی لە كێشەكانی (ئوجی سیمبسون) و (رودی كینج) و (جون دوبنت).

لەم كتێبەیدا بەشێوەیەكی درێژ باس لە لیستێك لە تایبەتمەندیە فیزیاویەكانی زوبانی لەشی مرۆڤ و جۆری بەرزونزمی شێوازی دەنگ و جۆری قسەكردن و بەرگ پۆشین و سەریادان و بەرزو نزمكردنەوەی و سەدان رەفتارو شێوەی ژیانی رۆژانە دەكات و دەڵێ:

بۆ نمونە چۆن لە هەست و ئەستی لێپرسراوەكەت دەگەیت لە میانەی هەڵبژاردنی جۆری چوارچێوەی ئەو وێنەیەی لەسەر مێزەكەی بەردەمی داناوە؟

ئالان لە ماوەی دە ساڵدا لێكۆڵینەوەی لەسەر هەزاران سوێندخۆر و پارێزەرو شایەت و دادوەر كردوە.. لە دەستپێكردا هەموو گریمانەكان و پێشبینیەكانی دەربارەی رەفتارەكانیان راست نەبوو.. بەڵام وردە وردە وای لێهات ئەنجامی لێكۆڵینەوەو گریمانەكانی جێگای متمانەو دەستخۆشی لێكردن بێت.

ئامۆژگاریەكانی ئەم كتێبە پڕ بەهاو سودە بۆ پارێزەران و باوكان و بازرگانەكان و پیاوانی كارو ئەو كەسانەی لە پەیوەندییە گشتیەكاندا كاردەكەن بەتایبەتی بۆ ئەوانەی ئامادەكراون و پاڵێوراون كە لە ئایندەدا ببنە لێپرسراوو كارمەندی پلەو پایەی بەرزو ئەوانەی دەیانەوێت بە وێنەو شێوەیەكی شیاو دەركەون و بناسرێن.

ئەم كتێبە زانیاری ئەوەمان دەداتێ كە چۆن چالاك و زاناتر بین لە تێبینی كردنی ئاراستەكان كە لە خەڵكیدا دەردەكەون بۆ هەڵسەنگاندنیان.. بە رەچاوكردنی شێوەی رۆیشتنیان لەسەر جادەو هۆڵ و ژورەكان.. جلوبەرگ پۆشینیان لە شێوەی درومان و رەنگی قوماشی بەرگەكە.. قسەكردن بە هێمنی یان بە توڕەیی.. بە بەرزی دەنگ یان لەسەرخۆیی.. جوڵاندنی لێو بزۆو كردنەوەی چاو و تێڕوانین.. ئایا چاو دەبڕێتە چاوت یان سەیری زەوی و لای راست و چەپ دەكات.. تاد..

بە زانین و وەرگرتنی ئەم زانیاریانەو بەكارهێنانیان بۆ ناسین و خوێندنەوەی خەڵكی خۆمان لە هەڵەو بڕیاری ناڕاست و چەوت قوتار دەكەین.. بگرە هەرگیز ناكەوینە داوی بڕیارو ئەنجامی هەڵەوە.

*دەیەم:* دوێنێ من گریام– Yesterday, I Cried

كتێبەكە بۆمان روون دەكاتەوە چۆن بە رێگای راست رەفتار لەگەڵ گیروگرفتەكانی ژیاندا بكەین، تا چەند وانەیەكی لێوە فێربین كە چۆن نەشونوما دەكەین و پێدەگەین و مێشكمان پڕ دەبێت لە زانیاری و لەدواییدا بە خۆشەویستی و سۆز ئاشنا دەبین.

ئەم كتێبە لەلایەن (ئینالا ڤانزانت– Iyanala Vanzant)وە دانراوەو تیایدا دەڵێت: پێویستە لە هەموو پاشماوەكانی

خەمەکانتان خۆتـان پاکبکەنـەوەو خۆتان رزگار بکـەن.. کـاتێك ئـەم هەوڵە دەدەیت پێشوەخت دەبێت رەزامـەند بوبیـت و بریـارت دابێـت کە ئـەم کـارە بکـەیت و بگەیتـە ئـەنجام.. گـەر نـا ئـەوا نـە بـیرو باوەڕت و نە هزرەکانت یـەکگرتوو دەبێت، نە لە خۆت رازی دەبیـتو ئەوەندەی تر نقومی قوڕوچڵپـاوی ئـەو پاشماوانـەی خەمـەکانت دەبێـت.. ئەوسـا تێڕوانینـە راسـتیەکانی ژیـانت لەدەسـت دەدەیت، خودی ئـەم ژنـە دانـەرە ژیـانێکی قورسـی پـڕ ئەندێشـەی بەسـەربردووەو چـەند جـارێك سـوکایەتی پێکـراوەو ناویـانگی زڕاوەو بگرە دەستدرێژی کراوەتـە سـەر شـەرەف و ژیـانی.. بـەڵام توانیویـەتی خـۆی رزگـار بکـاتو فێری چەند وانەیەکی گرنگ ببێـت لە ژیاندا لەژێر سـایەی فرمێسك و ئـارەقی پەشـیمانی و هیلاکـی.. هـەموو ناخۆشـیەکانی بـەزاندو پـەڕاندو لـە نوسینەکانیا هـەرگیز خـۆی بـە نێچـیرو قوربـانی ئـەم کارەساتانە دەرنەخستوە.

بەڵام بە راشـکاوی باسـی ئـەو ئـەزمون و زانیاریانـە دەکـات کـە لـەم هـەموو سـەربردەو کارەسـاتانەدا دەسـتی کـەوتوە لەگەڵ خوێنەوارەکانیا بە هاوبەش هەناسەیەکی قوڵ هەڵدەکێشن..

هەمیشە پرسیارێك لـە خـودی خۆی دەکـات: بۆچـی وا پێویسـت بـوو بـەڵکو بـۆ ناچـار بـوو هـەموو فرمێسـکەکانی کۆبکاتـەوەو نـەهێڵێت برژێـت؟ وەڵامـی ئـەم پرسیارەی لـە نـاخی گیـانیداو لـە وانەکانی ناو دڵۆپەکانی فرمێسکی بـەردەوامی دەستکەوتەوە.. هـەر ئەمەش پـاڵی پێوەنـا کـە هـانی خـەڵکی بـدات کـە هـەمان کـردار بکـەن کـاتێك توشـی دەسـتدرێژی کردنـە سـەر هـاتن.. کەمتەرخـەمی.. جێهێشـتن و جودایـی.. لەدەسـتدانی ئـازیز.. ئەمانـە هـەمووی چـەند وانەیـەکن لـەو وانانـەی لێـوەی فـێری ئـەوە دەبین چۆن خۆمان و خەڵکیشمان خـۆش بوێـت.. چـۆن دڵۆپـە فرمێسـکەکانی دوێنـێ بکەینـە تـۆوی هیـواو بەختـەوەری بـۆ ئەمڕۆو سبەینێ.

### سەرچاوەکان:


*1- مجلة صباح الخير القاهرية العدد/2286*

*2- مجلة (المجال) الامريكية والتي تصدر باللغة العربية عددي شهرا شباط و اذار عام 2001*




له نینته‌رنیته‌وه

# میتۆدەکانی توێژینەوەی زانستی لە فەرەنسای هاوچەرخدا

## "زانستە مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتیەکان"

■ هاشم ساڵح

● و. لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

دوای جەنگی دووەمی جیهانیو بەتایبەت لە سەرەتای شەستەکانەوە، فەرەنسا گۆڕانێکی چۆنایەتی لە بواری فیکرو توێژینەوەی زانستیدا بەخۆوە بینی. زانستە مرۆڤایەتیەکان بە شێوەیەك تەشەنەی سەند کە لەوەوبەر فەرەنسا شتی وەهای بەخۆیەوە نەبینیبوو. ئاقارو زاراوەی زانستە مرۆڤایەتیەکان تەنها کۆنترۆڵی سۆربۆن و زانکۆکان و ناوەندەکانی خوێندنی بالایان نەکردبوو، بەڵکو دەستیان بە مەڵبەندەکانی توێژینەوەو دەزگاکانی پەخش و وەرگێڕانیش گەیشتبوو.

پسپۆڕخوازی ورد لە یەکێك لە لقەکانی زانستە مرۆڤایەتیەکاندا، بووە خەسڵەتێکی بەرهەمی مەعریفی لە کایەی رۆشنبیری فەرەنسیدا لە بەرامبەردا کۆتایی بە رۆڵی رۆشنبیری سەراپاگیر هات (کە هەموو شتێك دەربارەی هیچ شتێك، یاخود هیچ شتێك دەربارەی هەموو شتێك دەزانێت)، وەکی سۆسیۆلۆژی فەرەنسی "پیر بۆردیۆ" دەڵێت. بە مانایەکی تر رۆڵی ئەو فەیلەسوفە مەزنە تەواوبوو کە هەموو شتێك دەزانێت "سارتەر". هاوکات رۆڵی ئەو توێژەرە پسپۆڕە دەستی پێکرد کە بە قوڵی لە بابەتێکی بچووك دەکۆڵێتەوە، بۆ ئەوەی بتوانێت پەی بە شتێك بەرێت. بەمجۆرە لقەکانی سۆسیۆلۆژیا (بە هەموو بەشەکانیەوە) بڵاوبووەوە. هەروەها مێژووناسی (بەهەموو بەشەکانیەوە)، ئەنسرۆپۆلۆژیاو، زانستی زمانەوانی و، بیسکۆلۆژیای فەردی و

دەستەجەمعی، زانستی دەروونشیکاری و، زانستی ئاینەکان و، مێژووی ئایینی بەراوردکاری و، میتۆدە تازەکانی رەخنەی ئەدەبی و، ئەبستمۆلۆژیا (یان فەلسەفەی زانست) و... هتد، تەشەنەیان سەند.

توێژەرەکان هاوڕان لەسەر ئەوەی ئەم قۆناغە دابڕانێکی مەعریفی یاخود (ئەبستمۆلۆژی) بەخۆیەوە بینیووە، بە بەراورد بە قۆناغی پێش خۆی، ئەو قۆناغەی تیایدا تازەگەری کلاسیکی خۆرئاوای تێدا دروست بوو (بە واتای ماوەی سەدەی نۆزدە تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم). ئەم تازەگەریەش رووبەڕووی رەخنە بووەوە، بەو پێیەی هاوشانی قۆناغی کۆلۆنیالیەت بووە، هەروەها بۆتە مایەی هەڵایسانی دوو جەنگی جیهانی و، چەندین قەسابخانەی گەورە.

هەرچەندە پێشبینی ئەوە دەکرا ئەو کارە بەربەریانە لە ئەورووپای شارستانیدا روونەدات. بەتایبەت دوای ئەوەی ئەم شارستانیەتە سەردەمی رۆشنگەری و سەرکەوتنی بیرکردنەوەی ئەقڵانی و عەلمانی بەخۆوە بینی. لە پای ئەمانەدا فەیلەسوفەکان دەستیانکرد بە پرسیارکردن لەوەی: ئەمە چۆن چۆنی رووی‌دا؟

فەیلەسوفانی قوتابخانەی فرانکفۆرت یەکەمین تاقمێك بوون راستەوخۆ و دوای جەنگی دووەمی جیهانی ئەم پرسیارەیان ورووژاند، لای خۆیانەوە دەستیانکرد بە رەخنەکردنی سەردەمی رۆشنگەری (یان رونتر بڵێین دەستیانکرد بە رەخنەگرتن لە لادانی سەردەمی رۆشنگەری لە پرانسیپە سەرەتاییەکانی خۆی). ئەقڵی رۆشنگەری ئەو ئەقڵەی بڕوای بە ئازادی و پێشکەوتنی تەواوی گەلانی سەر زەوی هەبوو، وەرگۆڕا بۆ ئەقڵێکی ئامێری و هەلپەرست و پراگماتی ساردو سڕ. ئەورووپاش یاخود (چینە سەرمایەداریە باڵادەستەکانی ناوی) کردیانە ئامرازێك بۆ گەیشتنە ئامانجەکانی خۆیان.. لەژێر ناوی بە شارستانی کردنی گەلانی دیدا ئەورووپا دەستی کرد بە کۆلۆنیالیکردنی میللەتانی دەرەوەی خۆی و چەوساندنەوەیان و، هەوڵدان بۆ سڕینەوەی شوناسی زمان و ئاین و کولتووریان.

لەم سەروبەندەدا خەڵکی متمانەیان بە شارستانێتی کلاسیکی خۆرئاوا نەما، دوای ئەوەی بووە ژیارێکی خۆپەرستی رووت. لێرەوە فەیلەسوفە ئازادیخوازەکان -وەك عادەتی هەمیشەییان- کەوتنە خۆ بۆ ئەوەی رەخنە ئاراستەی ئەم وەرگۆڕان و لادانە بکەن کە دووچاری ئەقڵانیەتی دروستی ئەورووپا هات، هاوکات بۆ ئەوەی ژیاری خۆرئاوا لەو گەردو گواڵانە پاکژ بکەنەوە کە تووشی ئەو شارستانیەتە هاتبوو. ئەم پرۆسەیەش ماوەی چل ساڵی (1945-1985) خایاند. ئەم قۆناغە قۆناغی رەخنەو هەڵکۆڵین و بریندار کردن بوو کە هەندێك جار دەگەیشتە ئاستی زیادەڕۆییکردن.

لە ماوەی ئەم قۆناغەدا خۆرئاوا هەوڵی دا خۆی لەو گوناه و تاوانانە پاکبکاتەوە کە ئەنجامی دابوون، نەك تەنها دەرهەق بە میللەتانی دیکە، بەڵکو لە هەمان کاتدا بەرامبەر بە چینی پرۆلیتاریاو ئەو کەمایەتیانەی لەناو سنوورەکانی خۆیدا، بەهۆی زیاد لە هۆکارێکەوە پەراوێز خرابوون.

وەك باسمانکرد بیریاران چەندین ئامراز -یاخود چەندین ئاقارو میتۆدیان- بۆ رەخنەگرتن لە شارستانیەتی کلاسیکی یان ئەقڵانیەتی کلاسیکی (هەندێکیان ناوی دەنێن ناوەندچێتی ئەورووپی) بەکارهێنا. میتۆدو رێبازی ئەو بیریارانە لە کایەی زانستە مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتیەکانەوە سەرچاوەیان

دەگرت، ئەو ئاقارو میتۆدانەی لە ڕێگای ئەزموونی ئەورووپاو مۆدێلی ئەورووپییەوە لە گەلانی دەرەوەی خۆیان نەدەڕوانی، بەڵکو بەو شێوەی دەبێت لە ڕێگای ئەزموونی تایبەتی خۆیان و سیاقی مێژوویی تایبەتی خۆیانەوە سەیربکرێن.

ڕاستە ئەقلانییەت لە ئەورووپاو (لە خۆرئاوادا بە گشتی) لە سەردەمی تازەدا گەیشتە ترۆپك، بەلام دەبێت بزانین ئەقلانییەتێکی لەمجۆرە ڕەگوڕیشەی لە ژیارەکانی تردا هەیە. گەر ئەورووپا توانیبێتی هەموو ئەم قەڵەمبازانە لە بواری زانست و شارستانیەتدا بدات، ئەوا ئەمە ناگەڕێتەوە بۆ بالادەستی ئەزەلی گەلانی سپی پێست (لە ڕووی خوێن و ڕەگەزەوە) بەسەر تەواوی میللەتانی سەرزەویدا. بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵە هۆکارێکی مێژوویی -ناوخۆی و دەرەکی- کە قسەو باسی زۆر هەڵدەگرێت.

بەمجۆرە ئەو تێزە پۆزەتڤستیە توندڕەوانە یاخود ئەتنیکیانە هەرەسیان هێنا کە بە درێژایی سەدەی نۆزدەهەم تا ناوەڕاستی ئەم سەدەیە، بەسەر ژینگە زانستیەکانەوە بالادەست بوون. ئەوەی جێگای ئەم تێزەشی گرتەوە، تێزەی زانستە مرۆڤایەتیە تازەکان بوو. ئەم تێزە تازەیەش وەها سەیری ئەزموونی ئەورووپی دەکات کەوا ئەزموونێکی ئینسانیە لەناو کۆی ئەزموونەکانی تردا، وەك موعجیزەیەك لێی ناڕوانێت کە لە ئاسمانەوە دابەزیبێت. بەڵکو پرۆسەیەکی مێژوویییەو دەکرێت لە ڕێگای ئاقارە مێژووییەکانەوە، دەست نیشانی دروست بوون و پەرەسەندن و گەشەکردنی بکرێت.

سەرەڕای ئەوەش ئەزموونی ئەورووپا -سەرباری هەیمەنەت و ئەو سەرکەوتنانەی چاوپۆشی لێناکرێت- تەنها پاترۆنێك نییە بۆ بەرەو پێشچوون. چونکە ڕەنگە نمونەی هاوشێوەو جیاواز لەو هەبێت، بەپێی تایبەتمەندی و میراتی کولتووری هەر میللەتێك. بە مانایەکی دی زانستە مرۆڤایەتیەکان بە پەیڕەوکردنی تیۆریایەکی ڕەخنەیی بوونە مایەی ئەوەی ڕێژەیی شارستانیەتی ئەورووپی ئاشکرا بکەن و، پەردە لە ڕووی خراپەکاری و کەموکوڕییەکانی هەڵبماڵن. نەك تەنها تەئکید لەسەر لایەنە ئیجابیەکانی بکەنەوە.

بەلام ماوەیەکە -هەمووی چەند ساڵێکە- پەرچەکردارێك لە بەرامبەر ئەو قۆناغە ڕەخنەیی و ئازادیخوازیە لە مێژووی فیکری ئەورووپیدا بەدی دەکەین. بەوپێیەشی ناوە دیارەکانی سەردەمانی ڕابردوو بە گشتی لەسەر چەپی ئەورووپی ماڵ بوون (چەپی مارکسی، یان فرۆیدی، یان نیچەوی..)، هاوکات لەگەڵ هەرەسی مارکسیزم و کۆمۆنیزم و دیواری بەرلین و سەرکەوتنی لیبراڵیەتی خۆرئاوا، هەندێك لە فەرەنسادا بە دیارکەوتن کە ئیدانەی بیریارانی ئەو قۆناغەو بیرو بۆچوونەکانیان دەکەن.

هەندێك جار بیریارانی ئەو قۆناغە بە ئاقاری تەفکیك خوازیو عەدەمیەت و، دژایەتیکردنی ئەقڵ و ئەقلانیەت تاوانبار دەکرێن. تەنانەت کار دەگاتە ئەوەی ئەوانە بە تێکدەرو ئاژاوەچی تۆمەتبار بکرێن و، بە کەسانێك لە قەڵەم بدرێن کە هەوڵی تێکوپێکدانی بنەماکانی ژیاری خۆرئاواو دەسکەوتەکانی دەدەن.

ئەم پرۆسەیەش هاوشانی سەرکەوتنی ئاقارە ڕاستڕەوە توندڕەوەکان بوو، لە هەریەك لە فەرەنساو ئەورووپادا. ئەمە وەك ئەوە دیاربوو کۆمەڵگەی فەرەنسی بیەوێت هەناسەیەك بدات و، بەها تەقلیدیەکانی وەك (بەهای خێزان، ژیانی هاوسەریو، تەنانەت مەراسیمی ژن و ژنخوازی لەناو کڵێسادا) بگێڕێتەوە. وەك ئەوە بێت فەرەنسیەکان بیانەوێت

شۆڕشـــی قوتابیـــانی 1968 و بزوتنـــــــەوە رادیکاڵیـــــــە جۆراوجۆرەکانی وەك: ئازادکردنی سێکس بە هـەموو شێوەکانیەوە، ئـــازادکردنی ژن، ئـــازادکردنی کرێکار لە کۆت و پێوەندی خاوەن کـار، ئـازادکردنی منـداڵ لـــە دەســـەڵاتی بـاوك؛ ئـازادکردنی خوێندکار لە هەیبەتی مامۆستاو.. هتد، لە بـیر خۆیـان بەرنـەوەو لـە یادی بکەن.

دەبێـت ئێمـەی رۆشـنبیرانی عەرەب چۆن چۆنی بڕوانینە ئەم مەڵکشان و داکشانەی، کۆمەڵگەی فەرەنسی لە چل سـاڵی رابـردوودا بەخۆیەوە بینیووە؟ چۆن چۆنی ئـــەو گفتوگـــۆو مشـــتومڕانە هەڵسەنگێنین کـە لـە بـەرزترین ئاستەکانی کۆمەڵگەی فەرەنسیدا روویاندا: مەبەستمان قسـەکردنە دەربـــــارەی ئەقڵانیـــــەت و ناەقڵانییەت، سەبارەت بە بەهای پێشکەوتن و دیموکراسیەت؟

ئەی ئەمە بۆ خۆی گەورەترین مشـتومڕێك نیـیە کـە چـەندین سـاڵەو تـا ئێسـتاش بـەردەوام فەرەنساو ئـەوروپای بەخۆیـەوە سـەرقاڵکردووە؟ لـــەم رووەوە ناکرێت ئەو مشتومڕەی لە نێوان "میشـێل فۆکـۆ"ی فەرەنسـی و "یۆرگن هابرمـاس"ی ئـەڵمانیدا روویدا، بـە بـەرزترین مشـتومڕ لـە قەڵەم بدەین کە بە درێژایی چـەند ساڵی رابـردوو لـە خۆرئـاوادا رووی دابێت؟ لە پای ئەمانـەدا دەکرێت بڵێین خۆرئـاوا لـــە مـاوەی سـی سـاڵی دوای جـەنگی دووەمـی جیهانیەوە بڕواو متمانەی بـەخۆی نەماوەو، ئەمێستا بە هەموو هـێزو توانـــــای خۆیـــــەوە و دوای هەرەسهێنانی کۆمۆنیزم لە هەوڵی بەدەست هێنانەوەی دایە؟

ناتوانین بە شێوەیەکی راستو دروست وەڵامـی ئـەم پرسـیارانە بدەینـەوە، بـەر لـەوەی گرنگـترین دەســـــکەوتەکانی زانســـــتە مرۆڤایەتیـەکان کـــە بـــە درێژایـی ماوەی رابـردوو بەدەست هـاتوون نەخەینـەڕوو. لەبـەر ئـەوە ئێمـە لێرەدا چـەند وتـارێك دەخەینـە بەردەسـت کـە خەریتـەی ئـەو قەڵـــەمبازە ئەپســـتمۆلۆژیەمان نیشـــاندەدات.. لـــــەم رووەوە دەکرێـــت جـــەخت لەســـــەر ئــــــەم تەوەرانــــــەی لای خوارەوە بکەینەوە:

### 1- مێژووناسی نوێ: قوتابخانەی (بڵاوکراوەی ساڵانە)ی فەرەنسی

فەرەنسـا لـە بـەردەم دنیـادا شـانازی بـەم قوتابخانەیـــەوە دەکـات، تەنانـەت کاریگـەری ئـەم قوتابخانەیە گەیشتووە بە یابـان و ئـەمریکای بـاکوورو روســـیاو، تەواوی ناوچەکانی جیهان. کەواتە بـا بپرسـین ئـــەم قوتابخانەیـــە چیـیەو؟ چـۆن دروســـت بـــووەو، دروست بوونی کاردانەوە بووە لـە بەرامبـەر چیـدا؟ هاوکـات بزانـین مەنهەجیـــەتی چـــی بـــووە لـــە لێکۆڵینـــەوەی مێـــژووداو زاراوە سـەرەکیەکانی کامانـەن و، نـاوە دیارو گەورەکانی کێن؟

### 2-سۆسیۆلۆژیای تازە

لـــە دوای سۆســـــیۆلۆژە کلاسیکیە مەزنەکانـەوە، ئەوانـەی پـاوانی سـەدەی نۆزدەهـــەم و تـا ناوەڕاســـــــتی ســـــــەدەی بیستەمیانکردبوو، وەك (مـارکس، ماکس ڤیبەر، دۆرکهایم)، چـەندین ئاقـاری دیکـە لـە سۆسـیۆلۆژیای هاوچەرخ هاتنـە ئاراوە. دەکرێت بڵێین ژمارەی ئەوانە لە فەرەنسادا چـوار ئاقـــارە. هـــەر ئاقـــارەو پێشەنگی خۆی هەیە:

1-ئاقاری "ئالان تۆرین".
2-ئاقاری "پییر بۆردیۆ".
3-ئاقـاری "میشـێل کرۆزیـە" قوتـابی "ریمۆن ئارۆن".
4-ئاقاری "ریمۆن بۆدۆن".

"تۆریـــــن و بۆردیـــــــۆ" هــــەردووکیان ســـــەر بـــــە سۆسیۆلۆژیای چەپڕەون، گەر ئەم ناو لێنانە لـە جـێی خۆیـدا بێت. هەریـــەك لـــە "کرۆزییـــــەو بـــۆدۆن"یـــش، ســـەر بـــە سۆسیۆلۆژیای راستڕەون.

### *3-زانستی زمانەوانی و سیمۆلۆژیا:*

ئەم زانستە لە سەرەتای شەستەکانەوە پێشکەوتنێکی گەورەی بەخۆیەوە بینی، تەنانەت لە هەوڵی ئەوەدا بوو هەیمەنەیەکی ئیمپراتۆری بەسەر تەواوی زانستە مرۆڤایەتیەکانی تردا بکات. ئەمە هاوشان بوو لەگەڵ دەرکەوتنی تەوژمی بونیادگەریدا. پاشان لە چەند ساڵی دوایداو لەگەڵ داکشانی بونیادگەریدا کاریگەری کەمبووەوە.. هۆکارەکانی ئەم سەرکەوتنە چی بوو؟ دەسکەوتەکانی قۆناغی بونیادگەری چییە؟ لایەنە سلبی و ئیجابیەکانی کامانەن؟ لەسەر ئاستی مەنهەجی چی لێ جێ دەمێنێت؟ چۆن چۆنی کاری کردە سەر ئەنسرۆپۆلۆژیاو، سەر فیکری "کلۆد لیڤی شتراوس"، وەك کاریگەری زانای زمانەوانی بەناوبانگ "رۆمان جاکۆبسن" لەسەر "کلۆدلیڤی شتراوس"؟

### *4-ئەنسرۆپۆلۆژیای نوێ:*

لەم بوارەدا دوو ئاقاری سەرەکی و رکابەری یەکتر هەن: ئاقاری بونیادگەری "کلۆدلیڤی شتراوس" و ، ئاقاری "جۆرج بالاندییە" پسپۆڕ لە لێکۆڵینەوەی هۆزەکانی کیشوەری ئەفریقادا.. "شتراوس" چۆن چۆنی میتۆدی بونیادگەری هێنایە ئاراو، چۆن بووە رابەری بونیادگەری فەرەنسی و، بگرە تەنانەت جیهانیش؟ "بالاندییە" بە چ شێوەیەك لە رێگای بەراوردکردنی کۆمەڵگا ئەورووپیەکان و کۆمەڵگا ئەفریقاییەکانەوە، رەخنەی ئاراستەی مۆدێرنە کرد؟ یان چۆن چۆنی رەخنەی لە "شتراوس" گرت؟

### *5-رەخنەی ئەدەبی نوێ:*

لەسەرەتای شەستەکاندا کێشەیەك لە نێوان "رۆلان بارت"و یەکێك لە مامۆستا دیارەکانی سۆربۆن "ریمۆن بیکار"دا روویدا. وەها باس لەو کێشەیە دەکرێت وەك ئەوەی بەردی بناغەی بزوتنەوەیەکی رەخنەیی تازە بێت لە فەرەنسادا. رەهەند و ئەگەرەکانی ئەم رووبەڕووبوونەوەیەی نێوان "بارت" و "بیکار" چییە؟ چۆن چۆنی رەخنەی نوێ سەرکەوتنی بەسەر ئەو رەخنە تەقلیدیەدا بەدەست هێنا کە لە زانکۆی سۆربۆندا باڵادەست بوو؟ پەیوەندی ئەمە بە جموجوڵی بیروڕاو گۆڕانی حەساسیەتی ناو کۆمەڵگەی فەرەنسیەوە چی بوو؟ ئاقارە مەزنەکانی رەخنەی ئەدەبی فەرەنسی کامانەن: ئاقاری بونیادگەری، ئاقاری دەروونشیکاری، ئاقاری کۆمەڵایەتی، ئاقاری بابەتگەرایی..؟

### *6-ئەبستمۆلۆژیا (زانستی زانستەکان، یان فەلسەفەی زانست):*

ئەبستمۆلۆژیا لە سی ساڵی رابردوودا کۆنترۆڵی تاوەندی لێکۆڵەرەوانی کردووەو، پێویستە هەر لێکۆڵیارێك -پسپۆڕی لە هەر شتێکدا هەبێت- شارەزای ئەبستمۆلۆژیا بێت و ئاگاداری میتۆدەو زاراوەکانی بێت، بەر لەوەی دەست بە توێژینەوەی زانستی بکات. دەبێت ئەوەش بزانین کە بەردەوام جیاوازی لە نێوان ئەبستمۆلۆژیای زانستە مرۆڤایەتیەکان و ئەبستمۆلۆژیای زانستە سروشتیەکاندا دەکرێت. بەلام بێگومان پەیوەندییەك لە نێوان ئەم دووانەدا هەیە. گەر ئەو پێشکەوتنە زۆرو زەوەندەی زانستە سروشتیەکانی وەك (فیزیاو، کیمیاو، ماتماتیك..) نەبوایە، زانستە مرۆڤایەتیەکان نەیدەتوانی هەموو ئەو پێشکەوتنە بەدەست بێنێت کە لە بواری تایبەتی خۆیدا بەدەستی هێناوە..

ئەبستمۆلۆژیا چی‌یە؟ کایەو بابەتی ئەبستمۆلۆژیا چی‌یە؟ دەسکەوتەکانی "گاستۆن باشلار"ی باوکی ئەبستمۆلۆژیای فەرەنسی کامانەن؟ دەسکەوتەکانی "جۆرج کانجلیم" کامانەن؟ دەسکەوتەکانی "میشێل فۆکۆ" کامەیە؟ ئەو گفتوگۆو مشتومڕە گەورانە کامانەن کە لە کایەی ئەبستمۆلۆژیای فەرەنسیدا روویان داوە؟ زاراوەی دابڕانی ئەبستمۆلۆژی چی‌یە: کە هەندێك جار بەبێ تێگەیشتنێکی روون و ئاشکرا گوازراوەتەوە ناو کایەی رۆشنبیری عەرەبی؟

### 7- فەلسەفەو فەیلەسوفەکان

پاش بالادەستی "ژان پۆل سارتەر" بەسەر گۆرەپانی فەلسەفەی فەرەنسیدا، بە درێژایی سالانی چلو پەنجاکان و تەنانەت تا ناوەڕاستی شەستەکانیش، کەسێکی تازە بەدەرکەوت بۆ ئەوەی جێگای بگرێتەوە، ئەو کەسەش "میشێل فۆکۆ" بوو.. هاوشانی "فۆکۆ" فەیلەسوفانی دیکەی وەك "جیل دولۆز" و "ژاك دێریدا"ش هاتنە ئارا.

دەسکەوتنی ئەم فەیلەسوفانە چی‌یە؟ ئایا راستە "فۆکۆ" هەولی وێرانکردنی ئەقل و ئەقلانیەتی داوە، لە رێگای هەلکۆلینی ئارکیۆلۆژیانەی بنەماکانی شارستانیەتی ئەوروپی‌یەوە؟ ئارکیۆلۆژیای زانین چ مانایەکی هەیە؟ پەیوەندی "فۆکۆ" بە قوتابخانەی (بلاوکراوەی سالانەی) فەرەنسیەوە چی‌یە؟ پەیوەندی بە زانستی ئەبستمۆلۆژیاوە چی‌یە؟ پەیوەندی بە مێژووی فەلسەفەی ئەلمانییەوە چی‌یە؟ هەلوێستی لە سەردەمی رۆشنگەری چی‌یە کە بنەمای شارستانیەتی تازەی ئەوروپی پێکدێنێت؟ پەیوەندی بە ئەوژمی بونیادگەری و.. هتد، چی‌یە؟ دەسکەوتەکانی "ژاك دێریدا" کامانەن؟ مەبەستی "دێریدا" لە مەنهەجی ئەفکیك چی‌یە؟ چۆن چۆنی ئەقلانیەتی ناوەندچێتی ئەوروپی لەبەریەك هەلوەشاند؟ دەسکەوتەکانی "جێل دولوز" کامانەن؟ چۆن چۆنی رەخنەی ئاراستەی شیکردنەوەی دەروونی و شارستانیەتی سەرمایەداری کردووە؟..

### سەرچاوە

هاشم صالح: قراءة في الفكر الاوروبي الحديث- الطبعة الاولى، 1994.



لە ئینتەرنێتەوە

# لۆ ئەندریێ سالومێ

## یان عیشقی ئەستەم

■هاشم سالّح

● و. لە عەرەبییەوە: ئازاد بەرزنجی

لەو ئافرەتانەی لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا بۆ ماوەیەك نێوەندە ئەدەبی و فیکرییەکانی بەخۆیەوە سەرقاڵ کرد، کەسێتیەك بوو کە پایەیەکی تایبەتیی هەبوو: لۆ ئەندریێ سالومێ، کە لەو ساڵانەی دواییدا هەندێ کتێب دەربارەی دەرچوون، کە شایانی خوێندنەوەو لێوردبوونەوەن: ئەم کتێبانە نهێنیەکانی "سالومێ"مان بۆ دەخەنەروو، لە پەیوەندییەکانیدا لەگەڵ پیاوانێکی دیارو بەناوبانگ، کە تیایاندا:




نیچەو ریلکەو فرۆیدە، هەرچۆن ئەم کتێبانە چۆنێتی پەیوەندیی نێوان داهێنەرە گەورەکان و (ئەوانەی پێیان دەوترێ) رەگەزی ناسك (الجنس اللطیف)مان بۆ روووندەکەنەوە. ئەو پرسیارەی کە لێرەدا خۆی قوت دەکاتەوە ئەوەیە کە" ئایا ئافرەتی بەهرەمەند یاریدەی پیاوی بلیمەت دەدات تا زیاتر تواناکانی بتەقێنێتەوە؟ چۆن؟ ئەی ئەو نرخەی بلیمەتەکە بەرامبەر ئەمە دەیدات چەندە؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە با هەڵوەستەیەك لەئاست پەیوەندیی سالومێ لەگەڵ یەکەم پیاودا بکەین.

### *1- پەیوەندیی لەگەڵ نیچەدا:*

یەکەم دیدار لەرێی هاورێکەی نیچە "پۆڵ رەی"ی فەیلەسووفو خانمێکی ئەڵمانیەوە سازکرا کە



بە ڕواڵەت بایەخی بە ڕۆشنبیری و ڕۆشنبیران دەدا، ئەم خانمە ناوی (مالڤیلدا فون میزنبوغ) بوو. "ڕەی"ی هاوڕێی لە نامەکانیدا هێندە وەسفی ئەم کیژۆڵە ئەفسووناویەی سەر بە وڵاتی سلاڤی کردبوو، کە نیچە بەم شێوەیە وەڵامی دابۆوە:

سڵاوم بەو کیژۆڵە ڕووسیە بگەیەنە، ئەگەر سڵاو مانایەکی هەیە! گومان لەوەدا نیە کە من ئەمجۆرە ئافرەتانەم لا مەبەستە، بەڵێ؛ بەم زووانە خۆم بۆ گەڕان بەدوای ئافرەتی وەهادا تەرخان دەکەم! من زۆر پێویستم پێیەتی؛ تا بتوانم ئەو کارانەم ئەنجامبدەم کە بەتەمام لە دە ساڵی ئایندەدا بیاننووسمەوە، بەڵام هاوسەرێتی شتێکی ترە.. لەم ڕووەوە هەموو ئەوەی دەتوانم بیڵێم ئەوەیە کە بەتەنها بۆ ماوەی دوو ساڵ ئامادەی ژیانی هاوسەرێتیم.. (واتە هاوسەرێتیەکی کاتی، یان وێستگەیەکی حەوانەوە). وەک ئەوەی ئەو کیژۆڵە ڕووسیە خاوەن نیگا سیحراوی و زەردەخەنە کوشندەیە چاوەڕێی بڕیاری نیچە بووبێت تا شووی پێ بکات!!

دواتر دەبینین نیچە چۆن دوای ئەوەی سالومێ خۆشەویستیەکەی ڕەتدەکاتەوە؛ پەنجەی پەشیمانی دەگەزێ، عیشقی ئەم کیژە وا ڕۆچووبووە نێو دڵیەوە؛ خەریکبوو دەیکوشت، بێگومان ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە سالومێ سەرسام نەبووە بە نیچەو هەستی بە بەهاو پایەی ئەو نەکردووە، نەخێر.. بەڵکو ئەو هەر لە یەکەم دیدارەوە هەستی بە سەیرو سەمەرەیی ئەم پیاوە کردو زانیی کە کەسێکی ناناساییە. هەر لەو دیدارەدا نیچە شڵەژابوو و لە گیرفانەکانیدا بەدوای شتێکدا دەگەڕاو بەشێوەیەکی سەیر دەجووڵایەوەو نەیدەزانی چی بڵێت.. ئەم ڕستە هیچ و پێکەنینهێنەرەی لە دەم هاتە دەرەوە: (ئێمە لە چ هەسارەیەکەوە کەوتووینەتە خوارەوە تا یەکتری ببینین؟) ئەمە شێوازی دڵداریکردنی نیچە بوە!.. پاشتر گوێی بۆ نیچە شلدەکردو وەکو قوتابیەک فەلسەفەی لێوە فێردەبوو و لە شاخ و دۆڵەکاندا لەگەڵیدا ڕێی تەی دەکرد –چونکە نیچە بە پێ زۆر دەگەڕا–، زانیی کە نیچە لە ڕەی جیاوازە، کەچی وێڕای

ئەوەش حەزی لە رەی کرد "بەلای ئافرەتەوە، پیاوانی ئاسایی لە بلیمەتەکان باشترن"، ئینجا پەیوەندییان پچڕاو واتەوات و ئیرەیی و قسەی خەڵك و هەموو ئەو شتانەی تری بەدوادا هات کە لە کۆتایی خۆشەویستییە گەورەکاندا دێن.

بەلام ئاخۆ هیچ هۆیەکی تر ئەبوو بۆ دوورکەوتنەوەی لە نیچە؟ ئایا ناتوانین بڵێین پاش ئەوەی قووڵاییە عەدەمییەکان و داڵانە پێچاوپێچەکانی رۆحی نیچەی بۆ ئاشکرابوو، لێی ترسا؟ چونکە هەستیکردووە جیهانێکی ترسناکی وەهای دۆزیوەتەوە کە ئادەمیزاد ناتوانێ بەرگەی بگرێت، هەربۆیە بە مەبەستی رزگاربوون لەو جیهانە کشایەوەو نیچەی بەتەنیا لە قووڵایی هەزرو تاریکیدا جێهێشت.

### 2- دیداری لەگەڵ ریلکەدا:

هەمیشە دیداری یەکەم سەرباری ناڕێکیشی، یان بە هەڵەو بەرێکەوت روودانی؛ مانایەکی خۆی هەیە.. بەزۆریش پاشتر لەنێو جەنجاڵیی ژیان و پەیوەندییەکاندا لەبیرمان دەچێتەوە. نایەتەوە یادمان تا دابڕانی تەواوەتیش روودەدات و ئەوسا دەپرسین: چۆن روویدا و، هەڵدەدەین ئەو ساتانە بگەڕێنینەوەو، هەستدەکەین تامێکی تایبەتیان هەبووە، تامێکی ترش و -شیرین یان تەنانەت تاڵ و شیرین.. تامی پەشیمانی و بێبەشبوون.




یەکەم دیداری نێوان لۆ سالومێ و ریلکە لەرێی رۆمانتووس "جاکوب واسەرمان"ەوە بوو لە میونیخ، لە رۆژی 12ی ئایاری 1897دا. بەتەنها ئەو دیدارەش بەس بوو بۆئەوەی گڕی عیشق تین بسەنێت: ئەو گڕە نەمرەی بەبێ ئەوەی بگۆڕێت چاخ و رۆژگارەکان دەبڕێت، بەبێ ئەوەی زەمەن کۆنی بکات. زەمەن هەموو شتەکان کۆن دەکات بەتەنها خۆشەویستی نەبێت. خۆشەویستی تاقە شتێکە لەتوانایدایە زەمەن بوەستێنێت، خۆشەویستی گەورەترین رەقیبی مەرگە.

لۆ سالومێ وتی: وەکو "زەرورەت" هاتە ژیانمەوەو بەوپەڕی هێمنی و دڵنیاییەوە عیشق هاتە سەردانم.. هات و بەبێ ئەوەی هەست بە رووبەڕووبوونەوە، یا هەست بە گوناه بکەم (چونکە لۆ سالومێ مێرددار بوو) وا هاتە سەردانم وەکو ئەوەی شتێکی پیرۆزم دۆزیبێتەوە کە جیهان لەسایەیدا کامڵ دەبێت.

ئەمە سەبارەت بە خۆشەویستی لای سالومێ، بەلام لای ریلکە زۆر قووڵ و بەلووزەو گرسەندوو بوو.. نابێ لێرەدا جیاوازیی نێوان پەیوەندیی سالومێ بە نیچەو بە ریلکەوەمان لەبیر بچێت. کاتێ سالومێ نیچەی ناسی؛ تەمەنی لە بیستویەك ساڵ تێنەدەپەڕی، نیچەش ئەودەمە تەمەنی 38 ساڵ بوو و بەشێکی زۆری کارەکانی ئەنجامدابوو و، خۆی بۆ وێستگەیەکی گەورەی ژیانی ئامادەکردبوو کە بەرەو "زەردەشت وای وت"ی دەبرد. واتە ئەوکات سالومێ قوتابییەك بوو لە میحرابی فەیلەسووفێکی گەورەدا کە دەیزانی چیی دەوێت و چیی ناوێت، فەیلەسووفێك کە بەرجەستە بیوو. گەرچی سالومێ وەکو ئافرەتێك و وەکو ئینسانێك کاریگەریی لەسەر ئەو زیاتر بوو.

بەلام پەیوەندیی لەگەڵ ریلکەدا تەواو بەپێچەوانەوە بوو،

ئەوکاتــە ســالومێ نزیکــەی چــل ساڵان بــوو، بــەڵام ڕیلکــە هێشــتا بیستویەك ساڵی تەواو نەکردبوو، هەروەها هێشــتا شتێکی ئــەوتۆی بڵاونەکردبۆوە کە ناسرابێت، بگرە کــەس چاوەڕێی ئــەوەی نــەدەکرد ببێــت بــە یــەکێك لــە شــاعیرە گــەورەکانی ئــەو ســەدەیە. کاتــێ ڕیلکــە ســالومێی بینــی؛ تەمــەنی هێشــتا لــە ســەرەتادا بــوو و بلیمەتیش خۆی مات دابوو و تاقــە ژوانیکــی لەگــەڵ دڵبــەرێك و ئیلهامبەخشــێکدا بــەس بــوو تــا بتەقێنــەوەو سێڵاوی گڕ پــەخش بکات.. بۆ ڕۆژی دوای ئەو دیدارە وەکــو شــێت لــە شــەقامەکانی میونیــخ دا مــاڵ بــەماڵ گــەڕا تەنــها مــاڵی ئــەوان نــەبێت؛ بــە ئومێــدی ئــەوەی بەڕێکــەوت لەســەری شــەقامێکدا یــان لــە سووچێکدا ببینێت.

ئەوکاتانــە هــەندێ نامــەی بــۆ دەنووســی کــە لــە شــیعر بەرزتر بوون:

**ڕۆژێ دێ، پاش ساڵانێ تر**

**ئەزانیت تۆ بۆ من چی بووی**

**تۆ کانیاو بووی بۆ تینوو**

**ئەی کانیلە سازگارەکەم!**

**نازانم چۆن وەسفت بکەم**

**من ئێستاکە.. حەزناکەم نە گوڵ و، نە ئاسمان و، نە خۆریش ببینم**

***تەنها لە تۆداو لە میانی تۆوە نەبێ***

ســێ ســاڵی یەکــەمی پــەیوەندییان بــەردەوام لەگــەڵ یــەکدا بــوون و بــە دەگمــەن یــەکتریان جێدەهێشــت، ئەمــە ســەرباری ئــەوەی لــۆ ســالومێ هاوســەری پیــاوێك بــوو نــاوی پرۆفیسۆر ئەندرێی بوو، جارێکیان سالومێ لێی پرسی: ئایا نەبووەتە مایــەی بــێزاربوونی و بــە دەرچوونەکانی لە ماڵەوە بێتاقەت نابێت؟ ئەویش لە وەڵامدا وتبووی "نــەخێر". خــەڵکانێك هــەن زۆر ژیرن، بــۆ ژیــانی هاوســەرێتی و خۆشەویستیی هێمن و بایــەخدان بە مــاڵ و منداڵ و پاککردنــەوەی قــاپ و قاچــاخ درووســتبوون. بەکورتی بــۆ ئــەوە دروســتبوون ڕۆڵــی مێرد ببینــن یــان تەنانــەت ببنە "مــێردی هەمیشــەیی" وەکو شــێتێکی تــر وای ناونــاوە (کــە ئەویش دۆستۆیڤسکی)یە.

ئــەمجۆرە کەسانە خۆیان بــە بەختــەوەر دەزانــن لەبەرئــەوەی مــێردی ئافرەتــانێکن کــە نــاودارو هەڵکەوتوون و لانــی کــەم نیــوەی ژیانیــان لــە دەرەوەی ماڵــەوەو لەپێناوی ئــەوین و خۆشەویستیدا بەســەردەبەن، "لــۆ ســالومێ"ش لــەو ئافرەتــە مێژووییانــە بــوو کــە پێویستییان بە مێردێك هــەبوو لــە ماڵــەوە پشــتی پــێ ببەســتێ و، هــەروەها بــە عاشــقێکی شــێتیش.

بەمجۆرە پــەیوەندیی "هاوتــا لــە گەرمەی ژیاندا" دێتە دی.

بەڵام شێتیەکەی ڕیلکە هەندێ جار تەحــەممول نــەدەکرا، جــاری وابــوو گرژییەکــەی نــاو نــاخی کێشەی ڕاستەقینەی بۆ سالومێ دەخولقــاند. ســالومێ هــەوڵی دا یارمەتیی بداو بۆ ئەو مەبەستەش ڕیلکــەی بــرد بــۆ لای دکتــۆرو دەروونشیکاران تا هۆی نەخۆشیو نیگەرانیە ترسـاکەکەی بدۆزنــەوە، بــەڵام بێســوود بــوو.. چونکــە دەردەکە لــەنێو قووڵایی ڕۆحیــدا نیشتبوو، بگــرە چووبــووە بنــی قووڵاییــەکانی ڕۆحیشــیەوە. پێدەچــێ "ســالومێ"ش دواجــار وای بەباش زانیبێت واز لــە گــەڕان بــەدوای هــۆی ئــەو شــێتیەیدا بهێنێت، چونکــە بــە کەشــفکردنی ئــەوە نــهێنی بلیمەتیەکەشــی کەشف دەبوو!

ڕیلکە لە ڕیــزی ئــەو داهێنــەرە گەورانــــەدا بـــوو کــــە قســـە بەناوبانگەکـــەی خـــۆی بەسەریاندا دەسەپێ:

"پێم سەیرە کەسێك شــتەکان ئاوەها بە ڕوونــی ببینێت، کــەچی ڕێگایــەك بــۆ ڕزگــاربوون شك نەبات!!"

### *3-دیدار لەگەڵ فرۆیددا:*

دیــــداری ســـێیەم و دواهەمینیشیان کە سالومێ لــە

ژیانە پڕ دیدارەکانیدا لەگەڵ بلیمەتاندا بۆی ڕەخسا؛ لەگەڵ دامەزرێنەری ڕێبازی دەروونشیکاری "سیگمۆند فرۆید"دا بوو. بەڵام ئەمەیان دیدارێکی تایبەتی و تەواو جیاوازبوو لەگەڵ دیدارەکانی پێشوویدا کە کاریگەرییان لەسەر ژیانی جێهێشت، کاتێ فرۆیدی ناسی تەمەنی لە پەنجا ساڵ تێپەڕیبوو، تەمەنی فرۆیدیش لە سەروو شەستەوە بوو و کارە سەرەکییەکانی خۆی لە بواری دەروونشیکاریدا بەئەنجام گەیاندبوو، بە کورتی پەیوەندییەکی کاڵ نەبوو، بەڵکو لەسەر بناغەی لێکگەیشتن و یەکدی ناسین دامەزرابوو، هیچ "پەرژەوەندییەکی سێکسی"یش بەسەریدا زاڵ نەبوو کە زۆرجار دەبێتە مایەی تێکدانی پەیوەندیی نێوان ژن و پیاو. ڕاستە فرۆیدیش وەکو نیچەو ڕیلکەو داهێنەرە گەورەکانی دونیا کەسێکی "نەخۆش" بوو، بەڵام دوای سەرسەختییەکی زۆر توانیبووی بەسەر ئەو نەخۆشییەیدا زاڵبێت، ئەمەش دوای ئەوەی تەمەنی بوو بە 42 ساڵان و لەناکاوێکدا مناڵیو دالانەکانی ناوەوەی خۆی بۆ ڕۆشن بۆوەو، ئەو گرێیەی کرایەوە کە بە درێژایی ژیانی ڕاوەدووی دەنا. بەڕێیە دەروونشیکاری وەکو زانستێکی ئەقڵانیی لێهات بۆ توژینەوە لە هەموو شتە نائەقڵانی و تاریکەکانی ژیانمان "واتە نەست". فرۆید توانیی خودی خۆی تێپەڕێنێت و بەسەر خۆیدا زاڵبێت: واتە خودی خۆی و ئەزموونی ژیانی خۆی و گرێ دەروونییەکانی خۆی کردە بابەتێك بۆ لێکۆڵینەوە، کە دواجار سوودی بۆ خەڵکانی دی و نەوەکانی ئایندە هەبوو. "سالومێ"ش بەم سیفەتەی سەرسام بوو، بۆیە بەردەوام وەسفی ئەو میتۆدەی فرۆیدی دەکرد کە ئەقڵانیەتی تەوزیف دەکرد بۆ دۆزینەوەی هەرچی سەرەڕۆیی و مەیلە نائەقڵانیەکانمانە. سالومێ ئەو میتۆدەی ئەو و ناسینی تایبەتیی خۆیشی بۆ نیچە خستە پراکتیکەوە بۆ شیکردنەوەی کەسێتیی نیچە؛ تا پەردە لەسەر لایەنە نائەقڵانیەکانی لابدات. ئەمەش بووە مایەی نووسینی کتێبێك لەسەر نیچە.




بەمجۆرە، لەکاتێکدا نیچە تەواوی سنوورەکانی ئەقڵانیەتی لە هزری خۆیدا بەزاندو گەیشتە سنوورەکانی دی و تا دواجار شێت بوو، هەروەها ڕیلکەش بایەخی بە سنووری جیاکەرەوەی نێوان ئەقڵ و شێتی نەدەدا؛ تەنها لەپێناوی نکوڵیلێکردنیدا نەبێت، ئەوا فرۆید لە دیدی "سالومێ"وە؛ پیاوێکی ئەقڵانیی سەنگین بوو، ئەویش سەوداسەری پیاوێکی بلیمەتی وەها بوو کە دوای تەقەللایەکی زۆر توانیبووی دڕ بە زریان و تۆفانەکان بدات و بگاتە کەنارەکەی دی*.

## سەرچاوە

*ئەم بابەتە لە ژمارە -21-ی گۆڤاری (ننزوی)وە کراوە بە کوردی.*

# ئەلبێر کامۆ

## ڕۆمانی "پیاوی یەکەم"

و. لە عەرەبییەوە: سەردەم

کەمن ئەو ئەدیبانەی کە دامێنانیان لە یەکەم کاری ئەدەبیاندا بەدەست هێنابێت وەك چۆن ئالبێر کامۆ لە ڕۆمانی "نامۆکە"دا بەدیهێناوە.

ڕەنگە چ ئەدیب و ڕۆمان نووسێکی پێش ئەویش نەیتوانیبێت سەرەتایەکی هێند ناوازەو سەرنجڕاکێش کە لە ئاستی ئەم بڕگە بەرایییەدا بێت نووسیبێتی: "ئەمڕۆ دایکم مرد، ڕەنگە دوێنێ مردبێت، بەتەواوی نایزانم" ئەمەیش بە تێکەڵکردنی وجودیەت بە شێواز چڕکردنەوە وەك چۆن نووسەر جیمس کاین لە ڕۆمانی "پۆستەچی هەمیشە دووجار لێدەدات" دامێنانی تیاکردووە.




بەشێك لە ڕەشنووسی ڕۆمانی "پیاوی یەکەم" لەنێو ئۆتومبیلە تێکشکاوەکەیدا دۆزرایەوە دوای ڕوودانی ئەو کارەساتەی کە ساڵی 1960 ڕوویداو ئالبێر کاموی تەمەن 46 ساڵی تیابوو بە قوربانی. ڕۆمانەکە باس لە ژیاننامەی خودی کامۆیە کاتێك کە بە منداڵی لە جەزائیری ژێردەستەی فەرەنسادا بووە. ڕۆمانەکە کارێکی ڕەسەتاییە لەئاست کامۆی جیهانیدا، ژنەکەی کامۆ نەیهێشت ڕاستەوخۆو دوای مردنی کامۆ کتێبەکە بڵاوبکرێتەوە، چونکە کامۆ دژی ستالینیەت بوو، بۆیە ڕوناکبیرە چەپڕەوەکانی فەرەنسا خۆشییان لێی نەدەهات، ژنەکەی لەوە ترسا کە ڕەشنووسەکە بەو شێوە سەرەتاییەوە زیاتر زیان بە ناو و ناوبانگی کامۆ بگەیەنێت، بەڵام وردە وردە ئەو ترسە ڕەوییەوە،

# ئاگادارییەك بۆ نووسەرانی گۆڤاری سەردەم

- لەگەڵ دەقە وەرگێڕراوەکەدا دەقە ئەسڵییەکەش بنێرن.
- هەموو نووسینێك سەرچاوە ئەسڵییەکەی لەگەڵدا بێت لە هەر زمانێکەوە کرابێت.
- رەچاوی رێزمان و خاڵبەندی بکەن.
- دەبێ بابەتەکە بەخەتێکی جوان و لەسەر دیوێکی کاغەزەکە بنووسرێ، دەنا فەرامۆش دەکرێ.
- بەپێی پێویست وێنە لەگەڵ بابەتەکەدا هەبێ.
- هەر بابەتێك بڵاوبکرێتەوەو نەکرێتەوە نادرێتەوە بە خاوەنەکەی.
- ئەو بابەتانەی بڵاودەکرێنەوە مەرج نییە دەربڕی راوبۆچوونی گۆڤارەکە بن.
- (سەردەم) پاش بەراوردو پیاچوونەوە بە بابەتەکاندا، لە دەسکاریی و داڕشتنەوەیاندا ئازادە.

# ئاگادارییەك بۆ وەرگێڕەکان

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم بەنیازە لە زنجیرە کتێبە چاپکراوەکانیدا گرنگییەکی تایبەت بە وەرگێڕانی کتێبی هەڵبژاردە بدات لە زمانە زیندووەکانی جیهانەوە، هەر بۆ ئەم مەبەستە:

**یەکەم:** بایەخی تایبەت بە لێکۆڵینەوە دەدرێ لە بوارەکانی: فیکر، فەلسەفە، تۆژینەوەی ئەدەبی، ئەدەبی جیهانی وەرگێڕراو، رەخنە، زانستە مرۆییەکان، مێژوو، لێکۆڵینەوە خۆرهەڵاتناسیەکان، تۆژینەوەی هونەریی، ئەدەبی منداڵان، فەرهەنگسازی...دا.

**دووەم:** دەبێ دانەیەك لە کتێبە ئەسڵیەکە لەگەڵ وەرگێڕانەکەدا هەبێ.

**سێیەم:** دوای ئەوەی بڕیاری چاپکردنی دەدرێ؛ نۆرەی خۆی بۆ چاپ وەردەگرێت و پاش چاپکردن، بەپێی قەوارەو لاپەڕەکانی کتێبەکە (جگە لە رێژەیەك لە کتێبەکە) خەڵات بۆ وەرگێڕەکەی تەرخان دەکرێ.

**چوارەم:** هەر دەستنووسێکی هاتوو بە خەتێکی جوان نەنووسرابێتەوەو ئەو مەرجانەی سەرەوەی تێدا نەبێت، فەرامۆشدەکرێ.

**پێنجەم:** مافی لەچاپدانەوەی چاپکراوەکانمان بۆ دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم پارێزراوە.

